# شرحی
# مفتاح الآداب

## له زانستی نه‌حودا

دانانی:

مامۆستا مه‌لا عه‌بدولکه‌ریمی موده‌ڕیس

(گیانی بۆ نوور بێت)

شه‌رح و لیکدانه‌وه‌ی:

عه‌بدوللا مه‌لا ئه‌حمه‌د، ئه‌حمه‌دناوایی

# شەرحی

# مفتاح الآداب

## لە زانستی نەحودا


دانانی

مامۆستا مەلا عەبدولكەریمی مودەڕیس

(گۆڕی پڕ نوور بێت)

شەرح ولێكدانەوەی

عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی



یەكەم چاپ

١٤٣٤ - ٢٠١٣

سرشناسه :احمد آوایی،عبدالله،۱۳۵۵.
عنوان قراردادی : مفتاح الآداب. کردی. شرح
عنوان و نام پدیدآور: شه ر حی[مفتاح الآداب] له زانستی نه حودا دانانی عه‌بدولکه ریمی موده‌ریس /شه‌رح و لیکدانه‌وه‌ی عه‌بدوللا مه لا ئه‌حمه‌د، ئاوایی
مشخصات نشر :سنندج: انتشارات شیخی،۱۳۹۱
مشخصات ظاهری : ۳۵۲ ص.
شابک :۲-۱۹-۶۳۵۸-۶۰۰-۹۷۸
وضعیت فهرست نویسی: فیپا
یادداشت :کردی
موضوع :مدرس عبدالکریم،-۱۳۸٤-۱۳۸۳مفتاح الآداب-نقد و تفسیر
موضوع : زبان عربی -- نحو
شناسه افزوده : مدرس ، عبدالکریم.۱۳۸۲-۱۳۸۳— مفتاح الآداب .کردی. شرح
رده بندی کنگره :۱۳۹۱ ۷۰٤۷۲۲۲ م ۳۷ م/۶۱۵۱ PJ
رده بندی دیویی : ٤۹۲/۷۵
شماره کتابشناسی ملی : ۲۹۷۳۱۲۸

## پێناسی کتێب

**ناوی کتێب :شه‌رحی(مفتاح الآداب)**
**بابه‌ت :ئایینی - زانستی نه‌حو**
**نووسینی : مامۆستا مه‌لا عه‌بدولکه ریمی موده ڕیس،(گۆڕی پڕ نوور بێت)**
**ڕاڤیار : عه‌بدوڵڵا مه‌لا ئه حمه‌د ، ئه‌حمه‌دئاوایی**
**بیت چنین : ئه‌حمه‌د نه‌جمه‌دین هه‌ورامانی**
**دیزاینی به‌رگ ، و ناوه‌وه :**
**هه‌ڵه‌چن : عه‌لی حاجی زه‌ڵمی**
**چاپخانه :**
**ساڵی چاپ :۱٤۳۳-۲۰۱۲**
**تیراژ : ۱۰۰۰ دانه**
**نرخ : ۱۳۰۰۰ تمه‌ن**

# ﴿پێڕستەکان﴾

# پێشەکی ڕاڤیار "الشارح"ـی، کوردی:

بسم الله الرحمن الرحيم

إنَ الحَمدَ لِلّهِ نَحْمَدُهُ وَ نَستَعينُهُ وَنَستَغفِرُهُ، وَ نَعُوذُ باللهِ مِنْ شُرُورِ أنْفُسِنا وَ مِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضَلِلْ فَلا هادِيَ لَهُ، وَ أَشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلا اللهُ وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ، وَ أشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ) (آل عمران:١٠٢)

(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً) (النساء:١)

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً) (الأحزاب:٧٠ – ٧١).

أمَّا بعد: فإن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد ﷺ وشر ألأمور محدثاتها، وكل *محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار.*

پاشان: هێشتا تەمەنی شەش ساڵیم پڕ نەکردبوویەوە، و لە قوتابخانە وەرنەگیرابووم، بە کەمتر لە مانگێك لە کارەساتی کیمیابارانی شاری هەڵەبجە (١٩٨٨)، جەنابی باوکم"مامۆستا مەلا ئەحمەدی، ئەحمەدئاوا" (گۆڕی پڕ نوور

بێت)، لە سەفەرێکی شاری بەغدادی پایتەختی عێراقدا، دەستی گرتم، و لە گەڵ خۆیدا بردمیە ئەو داروسسەلامەی هارونە ڕەشید، و ئەبوجەعفەری مەنصورا!

نازانم! چ هۆکارێ پاڵنەری سەرەکی بوو، بەم زاتەوە، بۆ ئەوەی بمکاتە هاوسەفەری خۆی، بەڵام ئەوەندە گومان دەبەم، کە بە تایبەتی بۆ خزمەتی عەللامە، وشافیعیی زەمانی خۆی، جەنابی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، و پیری پێشەوای تەریقەت، و خواناسی ڕەبانی ، شێخ موحەممەد عوسمان سیراجەددینی نەقشبەندیی دووەمی بردم، "گۆڕیان پڕ نوور، وکاروانیان پڕ ڕێبوار بێت"، ئێستا وەك دەزوویەکی زۆر باریکی خەیاڵاوی لە بیرم ماوە، کە چووینە بارەگای (قطب العارفین:شێخ عەبدولقادری گەیلانی)، جەنابی باوکم پێش ئەوەی خۆی بگاتە پێشەوە، منی بەرەو ژوور، وحوجرە تایبەتەکەی جەنابی عەللامەی مودەڕیس نارد! و هێشتا لە بەر چاومە مەلایەکی ڕۆح سوك، لە سەر مێز، وقەنەفەیەکی سادەی ئەو کاتە لە ژورێ تەشریفی دانیشتبوو، و دوای کەمێك باوکم بە شوێنمدا هات!و هەردووکمان زیارەتی مامۆستامان کرد،و ئیتر لێرەدا خەیاڵەکەم شۆراوەتەوە، و نایەتەوە بیرم، بزانم چی گوترا؟ و چی گوزەرا؟!

بە هەر حاڵ ئەم هەوێنی لە خزمەتتدا بوونەی مامۆستای مودەڕیس، خوای گەورە کردییە ئامرازی خۆشویستنی زانستی شەرعی، و دواتر لە دڵدا شیرین بوونی زانایەکی مەزنی، وەك عەللامەی مودەڕیس"رحمه الله"!

دوای ئەوەی کە باوکم بە ڕەحمەتی خوا چوو، لە کۆتایی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا، لە نشینگەی خۆمان لە هەورامانی دیوی کوردستانی عێراق، چاوودڵم بە زانستەکانی شەریعەت ڕووناك بوونەوە، و لەو نێوەندەدا تا ڕادەیەك کتێبەکانی جەنابی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جێگای سوودم بوون،

و تا دواتر و لـه سالّی(١٩٩٩)، ڕۆشتمە دیوی کوردستانی ئێران، بە مەبەستی فەقێیەتی، و تەنانەت تا ئەو کاتەش لێم ڕوون نەبوبویەوە، کە جەنابی شێخی مودەڕیس، خاوەنی ئەو هەمووە کتێب، و بەرهەمە دانسقە جۆراوجۆرانەیە.

لـەو کاتی خوێندنەمدا زۆر جار سەردانی مامۆستا شێخ زاهیدی فارۆقی(مامەم)، لـه شاری مەریوان دەکرد، و لـه کتێبخانەکەی سوودمەند دەبووم، و لـەوێدا، و لـەو کاتەدا بە خزمەت کتێبی(رسائل العرفان، في الصرف والنحو، والوضع، والبیان)ی، مامۆستای مودەڕیس گەیشتم، کە لـه چوار پەڕاو پێکهاتووە، لـه چوار زانستی جیاوازدا، لـەوێ کتێبەکەم لـه مامم وەرگرت، و هێنامەوە دیوی کوردستانی عێراق، و دوای موتالآ، و گوتنەوەی بە دەرس، و دیراسەکردنی زانیم کە بەشە نەحوییەکەی کە ناوی ناوەتە (مفتاح الآداب)، زۆر پڕ بایەخە، و بۆیە هات بە خەیاڵمدا شەرحێکی کوردی لـه سەر بنووسم، ودوای ئەوەی کە سوپاس بۆ زاتی ئەقدەسی حەق تەعالا، بەهرەمەند بووم، بە زانستی شەرعی، پڕۆژەکەم دەستپێکرد، و بەم شێوازەم گەیاند، کە ئێستا لـه بەردەستاندایە!

سوپاس وستایش بۆ خودای پەروەردگار، کە کردمییە خزمەتکاری زانستەکانی شەریعەت، و هەروەها گێڕامی بە خزمەتکارێکی گچکەی بەرهەمەکانی عەلـلامەیەکی وەك، جەنابی مامۆستا مەلا عەبدولـکەریمی مودەڕیس.

سەبارەت بە شەرحەکە تا ڕاددەیەك توانیومە، مەبەستەکان بە درێژی ڕوون بکەمەوە، و لـەمەشدا سوودم لـه سەرچاوە مەزنەکانی نەحو، هەر لـه عەوامیلی جورجانی، تا ئەلـفیە، وشەرحە جۆربەجۆرەکانی وەرگرتووە، و هێندە هەیە، کە جەنابی مامۆستا لـه (مفتاح الآداب)دا، پرسیارو وەڵامی داناوە،

سەبارەت بە کاکڵەی باسەکان، من ئەو پرسیار، و وەڵامانەم نەکردۆتە کوردی، چونکە مانایان لە تێکڕای شەرحەکەدا هەیە، و پێویستی بە دووبارە کردنەوە نەدەکرد، و سەرجەمیانم کۆکردۆتەوە، و لە کۆتایی کتێبەکەدا دامناون، کە جێگای سوودی خۆیانن.

لە کۆتاییدا دیسان سوپاسی پەروەردگاری مەزن دەکەم، کە یارمەتیدام بۆ شەرحکردنی مەتنێکی مەزنی لەم جۆرە، کە هەم خزمەتە بە یەکێك لە زانستەکانی شەریعەت، و هەم خزمەتە بە یەکێك لە گەورە زانایانی مەزنی ئیسلام، و گەلەکەمان، و بەندەی ناتەوانیش هەرگیز بانگەشەی شارەزاییم لەم بوارەدا نەکردووە، و تەنها خۆم بە خزمەتکاری زانست وزانایان زانیوە، و هیوادارم قوتابی، وخوێنەری بەڕێز، هەر هەڵەیەکی بەرچاو کەوت، خۆی چاکی بکات، یان بیباتە خزمەت زانا، وماMۆستایەکی بەڕێز و دروستەکەی لە جێگادا دابنێت، و من لە سەر یاسای (ما لایترك کلّه، لا یترك جلّه) ڕۆیشتوم، و دەنا هەرگیز خۆم بە مەردی ئەم مەیدانە نازانم، و دیسان لە خوای پەروەردگار دەپاڕێمەوە، بەم خزمەتە بچوکە فەقێ و قوتابیانی کورد سوودمەند بکات، و ئێمەش لە بەرەکەتی زانست بەهرەمەند، و بەهرەمەندتر بین.....آمین

<u>خزمەتگوزاری زانستەکانی شەریعەت</u>

**عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی**

٥- ڕەبیعولثانی - ١٤٣٣ هـ        ٢٧ - ٢ - ٢٠١٢

<u>سنە - ڕۆژهەڵاتی کوردستان</u>

# ﴿مێژووی سەرهەڵدان، و نەشونماکردنی زانستی نەحو[1]﴾

رێخۆشکردن :

بە ڕاستیی عیلمی (نەحو) گەلێك گرنگە، ئەوەی تا لەم مەیدانەدا نەبێت، نازانێت چەندە بە بایەخە، و چەند پاڵپشتێکی بەهێزە بۆ تێگەیشتن لە مانای قورئان، هەروەك مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس دەفەرموێت:

بەبێ صەرف، و نەحو، دەس نادا بۆ کەس
فـــامی ئەساسیی دینی موقەددەس[2]

وە ئەم زانستە بنەمایە، بۆ تامەزرۆیانی زانستە ئیسلامییەکان، هەر بۆیەش زانایەکی وەك شێخ (عبدالقادر عبدالعزیز) لە کتێبی (الجامع في طلب العلم الشريف)دا دەفەرموێ: ئەوەی "نەحو" و "صەرف" نەزانێت، فەتوای لێ وەرناگیرێ!

جا لە مێژووی بەرەو پێشچوونی زانستی نەحودا، کتێبێك کە سەرمەشقە، و دەبێ لە سەرەتای نووسینەوەی ئەم مێژووەدا باسی بکەین، بریتیيە لە (الکتاب)ی، زانای مەزنی نەحو، (سیبەوەیهی)، کە لە ڕووی سەرەتایی بوون، و ساکاری خۆیەوە پێگەیەکی گرنگی لەو مێژووەدا داگیرکردووە، کە سەرجەم ئەو یاسا، و ڕێسا، و بنەمایانەی کە لەم کتێبەدا دەبینرێن، ڕەوگەی گشتیی ڕێزمانی عەرەبین، و ئەمەش ناکرێت، سەرجەمی

---

[1] لە گۆڤاری (ڕێگای شەرع)، ژمارە (٥)، بەهاری (٢٠١٢)، ل١٣٠ – ١٣٦ بلاوکراوەتەوە.

[2] پێشەکی (شەرحی تەصریفی زەنجانی)، نووسراوی: مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، "گۆڕی پڕ نوور بێت"، ل٦، چاپی ٢٠٠٨، سنە.

وەك موڵكی سیبەوەیهی بهێنرێتە ئەژمار، بەڵكو جەنابیان كۆكەرەوە، و ئامادەكەری كۆششێكی بەرخۆران، و لە مێژینەیە لەم بوارەدا، و یەكخەری زۆرینەی ئەو هەوڵانەیە، و لە دوا قۆناغی ئەم پوختە باسەدا، بە درێژی دەچینە سەرباسی خۆی و كتێبەكەی، و دەكرێت لەم بەركولە مێژووییەدا، ئەم بابەتە، لە چەند باسێكدا بنووسینەوە:

- باسی یەكەم: ووشەی نەحو.
- باسی دووەم: پێناسە، و سوود، و باسەكانی نەحو
- باسی سێیەم: كەلیمە، و كەلام، وبەشەكانیان.
- باسی چوارەم: بەشەكانی كەلیمە.
- باسی پێنجەم: هۆی حەصركردنی كەلیمە، لە سێ بەشدا.
- باسی شەشەم: یەكەم داهێنەری زانستی نەحو.
- باسی حەوتەم: فاكتەرەكانی پەیدابوونی زانستی نەحو.
- باسی هەشتەم: زانستی نەحو، لەدوای (أبي الأسود الدولي).
- باسی نۆیەم: بایەخ و تایبەتمەندییەكانی بەرهەمەكانی سیبەوەیهی .
- باسی دەیەم: قسەیەك بۆ ئەوانەی بێ بایەخ دەڕواننە زانستی نەحو.

## ﴿باسی یەكەم: ووشەی نەحو﴾

لەزمانەوانیدا نەحو بۆشەش مانا بەكار دەهێنرێت.

أ. بەمانای(مثل:وەك)، نموونە:"جائني صبي نحوك"واتە:مثلك.

ب. بەمانای ئاڕاستە،وەك"ذهبت نحو البيت"واتە:جهة البيت.

ج. بەمانای مەبەست(قصد)، وەك: "نحوت نحو زيد"، واتە:قصد زيد.

د. بەمانای جۆر(نوع)،وەك"هذا الشيء على أربعة أنحاء"واتە:أربعة أنواع.

ه. بەمانای ئەندازە گیری(مقدار)،وەك:"أخذت نحو ألف"واتە:مقدار ألف.

و. بەمانای جێگا(موضع)، وەك""قصدت نحو زيد"واتە:موضع زيد.

## ﴿باسي دووەم: پێناسە، و سوود، و باسەكاني نەحو﴾

نەحو: چەند بنەماو یاسایەکە، کە بە هۆیانەوە، چۆنیەتی کۆتـایی کەلیمـەیان پیّ دەناسریّت، لەڕووی (ئیعراب، و بیناء)ـەوە.

بـاس، و بابەتـەکانی، واتـە: ئـەو بابەتـەی کـە نـەحو باسـی لیّـوە دەکـات، (کەلیمە، وکەلام)ـە.

سوودەکەی: پاراستنی زمانە، لە هەڵە، بە گوێرەی ئەو یاسایانە.

وە (اللفظ): بریتییـە لـەو دەنگـەی کـە لـە یـەکێك، لـە بەشـەکانی دەمـەوە دەردەچیّت، و دەم تیایـدا کاریگـەرە، ئەگـەر ئـەو لـەفظـە بـیّ مانـا بـوو، ئـەوا موهمەلە، وەك (دیز)، کە موهمەل و بیّ مانایە، و ئەگەر خاوەن مانـابوو، ئـەوە، مەوضوعە، وەك (زید)، کە خاوەن مانایە، و بۆ واتایەك دانراوە.

## ﴿باسي سێیەم: کەلیمە، و کەلام، و بەشەکانیان﴾:

پێناسەی کەلیمە: بریتی یە لەو لەفزەی کە لەدەمەوە دیّتە دەریّ، وە دانـراوە، بۆ مانایەکی موفرەدی غەیرە مورەککەب، وە کەلیمە سیّ بەشە:

**(الأسم)**: ئەوەیە کە لەخودی خۆیدا واتایەك دەگەیەنێت، واتە، پێویستی بە کە لیمە یەکی تر نی یە، کە ندگەلێدا باس بکرێت، وە ماناکەی پەیوەست نی یە، بەیەکێك لەکاتەکانەوە، وەك (زید ، علم، عالم) کە (زیـد) لەفزێکە لـەدەم دێتە دەرێ وە دانـراوە بـۆ مانایـەك، و مورەککەب نـی یـە، وەك (**خمسة عشر**)، و پەیوەست نییە، بە کاتەوە.

وە نیشانەکانی ئیسم ئەوەیـە، کـە (جرّ ، تنـوین) ئـەلف و لامـی تـەعریف، وەردەگرێت، وەك (**الكتاب في يد أمين**) کە (کتاب) ئەلف و لامی لەسـەرە،و(یـد) جەڕی چووەتە سەر، (أمـین) تـەنوینی کەسـرەی وەرگرتـووە، وە ناوەکـە ئیـسنادی دەدرێتە پالّ وەك (**زيد فاضلٌ**) کە (زەید) موبتەدایـە، و (**فاضـلٌ**)، خەبـەرە، کـە فەزلّ وڕێزداری ئیسناد دراوەتەوە لای (زید)ودراوەتە پالّی.

**فیعـل**: ئەوەیـە، کـە دەلالـەت بکاتـە سـەر مانایـەك و پەیوەسـت بێـت، بەکاتێکەوە، کە یان (**ماضی**)یە، وەك (**ضرَب**) یـان موضـاریعە وەك (**یـضرب**) یان ئەمرە، وەك (**أضرِب**) وە نیشانەی فیعلی ماضی، ئەوەیە کـە (**تـاء التأنیـث الساكنة**)ی دەچێتە سەر، وەك (کتبت) وە نیشانەی موضاریع ئەوەیە کە (سین) ی دەچێتە سـەر وەك (سأجتهد)، و( سـوف) ی دەچـێتە سـەر وەك (**سـوف أنجـح**) و (لم)ی، دەچێتە سەر وەك (**لم أكسل من أداء واجبـي**) و( لمّا)ی دەچێتە سـەر وەك: (**لما أدرك مطلوبی**).

وە نیشانەی فیعلی (ئەمر) ئەوەیە کە داخوازی و داواکاری لێوە تێدەگەین، وە (یاء مخاطب)ی دەچێتە سەر، وەك (**أكرمی أمّك واحفظی دینك**).

**حەرف**: ئەوەیە کە بە پالّپشتی غەیری خـۆی واتـادار دەبێـت، وە ك(قـد حـان وقت العلم) کە (قـد) حەرفـە وە نیـشانەی حـەرف ئەوەیـە، کـە تایبەتمەندیـەکانی ئیسم و فیعل وەرناگرێ.

(الكلام): ئەولەفزەیە كە (مركب)ە و موفرەد نی یە، وە بەسوودە، و بێدەنگی دەبەخشێت، وە (المقصود لذاته) بێت، واتە: موتەكەللیم بە مەبەستی خۆی دەری بڕێ، و قسەی (نائم: خەوتوو)، و (ساهی: هەڵەكەر) نەبێت، وەك: (الله خالق كلّ شئ) كە خوا فەرموویەتی: و لەفزە و موڕەككەبەو بەسودە، و كەس قسە ناكات، بەبیستنی ئەو كەلامە، و بێدەنگی دەبەخشێ و قسەی (العیاذ بالله) (نائم: خەوتو)، یان(ساهی: هەڵەكەر) نی یە، وە (كلم) ئەوەیە، كە لەدوو كەلیمەی موڕەككەبی بەسود پێكهاتبێ، وەك:( قد قام)، یان بێ سودبێت، وەك: (أن قام).

## ﴿باسی چوارەم: بەشەكانی كەلیمە﴾

*** كەلیمە سێ بەشە: ئیسم، فیعل، حەرف:**

**أما "تَعْمَلْ" و"تُعْمَلْ" أو "تَعْمَلْ" و"لا تُعْمَلْ" أو "تُعْمَلْ" و"لا تَعْمَلْ" أو "لا تَعْمَلْ" و"لا تُعْمَلْ".**

**١-"تَعْمَلْ وتُعْمَلْ": كەلیمە عامیلیش دەبێت و دەبێتە "مەعمول"یش،وەك فیعلی موضاریعی "یضرب" كە عاملیش دەبێت، وە دەشبێتە "مەعمول" بە هۆی حوروفی جازیە وناصیبەوە، وە یان،وەك "اسم فاعل واسم مفعول" كە دەبنە "فاعل و نائب فاعل" وە هەروەها بەهۆی حەرفی جەڕو عەوامیلی ناصیبەوە دەبنە "مەعمول".**

**٢- "تَعْمَلْ ولا تُعْمَلْ": هەندێ جار كەلیمە عەمەل دەكات، كەچی نابێتە "مەعمول"، وەك حورووفی ناصیبەی "أن، لن ، كي، إذن" وە حەرفەكانی**

جازیەی وەك: "لم ،لما، لام الامر، لاالنهي، أن شرطية" کە ئەمانە عەمەل دەکەن و نابنە مەعمول، وەك:

"أن يضرب". کە "أن" ،"يضرب"ی مەنصوب کردووە، کەچی خۆی ناکرێتە مەعمولی شتی تر.

٣- "تُعْمَلْ ولا تَعْمَلْ": هەندێ کەلیمە دەبنە مەعمول، کەچی نابنە عامیل، ئەمانەش وەك ئەسمائی موتەمەککینەی جامیدە، وەك "زيد، عمرو، تفي، حسن" ئەمانە کە دەبنە مەعمول کەچی عەمەل ناکەن.

٤-"لا تَعْمَلْ ولا تُعْمَلْ": هەندێك کەلیمە نە دەبنە عامیل، نە دەبنە مەعمول، وەك: حوروفی عەطف، وەك: "واو، ثم، لكن،(الـ)ی، تعريف "وەك (الرجل)و حوروفی ئیستیفهامی وەك: (أ، هل) کە نە دەبنە مەعمول ونە دەبنە عامیل.

## ﴿باسی پێنجەم: هۆی حەصر کردنی کەلیمە لەسێ بەشدا﴾

هۆی حەصر کردنی کەلیمە لەسێ بەشدا،لە ڕووی هێنانی "بەڵگە:دلیل"ەوەیە، کەئەوانیش"الدليل النقلي"،" الدليل ألاستقرائي"،" الدليل العقلي"ین.

١-"الدليل النقلي":پێشەوا عەلی کوڕی ئەبوتالیب کەخۆی دانەری سەرەتای زانستی نەحوە، دەگێڕنەوە کە بە"ئەبولئەسوەدی دوئلی" گوتوە:کەلیمە سێ بەشە:"ئیسم،فیعل،حەرف".

٢-" الدليل ألاستقرائي":زانایان وزمانزانانی تایبەت بەم زانستە هەرچی لەهجەکان وجێگا جۆراوجۆرەکانیان پشکاندوە، لەم سێ جۆرە زیاتریان نەدیوەونەدۆزیوەتەوە.

٣-" الدليل العقلي":بەهۆی ئەوەوە کە کەلیمە یان دەلالەت ناکاتە سەر مانایەکی سەربەخۆ،کە ئەویش حەرفە،یان دەلالەت دەکاتە سەر مانایەکی سەربەخۆ، بەڵام پەیوەست نی یە،بەیەکێك لە سێ کاتەکەوە "ماضي،مضارع،مستقبل"،کە ئەمەشیان ئیسمە.

## ﴿باسی شەشەم: یەکەم داهێنەری زانستی نەحو﴾:

زۆرینەی مێژوونوسان و بایەخ دەران بەم بوارە، پێیان وایە، کە داهێنەری نەحو، بریتی‌یە لە (أبوالأسود الـوؤلي)، بەڵام بە فەرمانی پێشەوای ئیمانداران (عەلی کوڕی ئەبوتالیب)، بەم کارە هەستاوە، و ئەو پێشنیاری پرۆژەکەی بۆ کردووە، و (أبوالأسود) لە سەر ڕای زۆر لە زانایان هەستاوە، بە ئیعرابی قورئانی پیرۆزیش، ئەگەر چی داهێنانی نەحو، لە لایەن ئەم زانا بەرزەوە، لە سەرەتادا ساکار بوو، بەڵام هەر جۆر بێت، لە کاتی خۆیدا ئەفراندن بووە، کە کراوە، و ڕچە شکێن بووە، بۆ دوای خۆی، تا ئەم زانستە بەمرۆ بگات، بەم فراوانییەی کە دەیبینین.

## ﴿باسی حەوتەم: فاکتەرەکانی پەیدا بوونی زانستی نەحو﴾:

زانایـان دەگێڕنـەوە، کـە ئافرەتێـك هاتۆتـە خزمـەت یـەکێك لـە والیەکان، لـە سەردەمی ئیمامی عەلیدا، و گوتویەتی: «أبوي مات، و تـرك عليٌّ مالا»، کە ئەم ڕستەیەش پێـچەوانەی ڕێزمـانی عـەرەبی یـە، و دەبێـت بلێت: «أبي مات وترك لي مالاً»، ئەمەش گەیشتەوە، بـە ئیمـامی عـەلی، و لێرەوە بڕیـاری دەرکـرد، بـۆ (أبوالأسـود)، کـە ڕێـساکانی زانـستی نـەحو دابنێت، ویان هەندێك دەگێڕنەوە، کـە کەسـێك ئایـەتی:﴿أَنَّ اللَّـهَ بَـرِيءٌ مِـنْ الْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُ﴾ـی، خوێندۆتەوە، بە کەسرەی لامی (رسولِه)، کـە ئەمـەش هەڵەیە، و مانای نادروست دەدات بە دەسـتەوە، جـا کـە ئـەم هەواڵـەیش گەیشت، بە ئیمامی عەلی، بڕیاریدا کە (أبوالأسود)، ڕێساکانی زانستی نەحو دابنێت، تا خەڵك لـە هەڵەی ڕێزمانی بە دوور بـن، جـا لێرەوەیـە هەنـدێك دەڵێن: کە (أبوالأسود الدؤلي)، ڕەشنوسێکی یاساکانی ڕێزمـانی عـەرەبی ئامادە کرد، وهاتەوە، پێشانی پێـشەوا عـەلیدا، و جەنابیـشیان فـەرموویان: (نِعْمَ ما نَحَوْتَ)، یان (ماأحسن هذا النحو الذي نحوتَ)، لێرەوە بوو، کە ئەم زانستی ڕێزمانی عەرەبییە، ناونرایە ﴿نەحو﴾!

## ﴿باسی هەشتەم: زانستی نەحو: لەدوای (أبي الاسود الدؤلي) (١)﴾

یەکـەم کەسـێك کـە زانـستی نـەحوی لـە ئـەبو ئەسـوەد وەرگرتـووە، (عطاء)ـی، کوڕیی، و (یەحیا) و (نەصر)ـی قوتابیی بوون، و لـە دوای (أبـي

(١) پێشەکی (شەرحی فارسی، لە سەر "مغنی اللبيب")، نووسراوی: سەیید عەلی حوسەینی هەمەدانی، ل٧ - ٢٢، چاپی ٢٠٠٩، ئێران.

الأسود)، تا (سیبەوەیهی)، چەند چینێك لە زانایان هەبوون، و توێژینەوەیان لە سەر ئەم زانستە کردووە، بەم ڕیزبەندییەی خوارەوە:

- چینی یەکەم: - (عبدالرحمن)ی کوڕی هورمز:

ئەم زانایە نەحوی لە ئەبو ئەسوەد وەرگرتووە، هەر چەندە بە ڕای هەندێ لە زانایان هاوشانی ئەبو ئەسوەدە، بەڵام ڕای ڕاست، لە سەر ئەوەیە کە سودی لەو وەرگرتووە، و لە ڕووی بنەچەناسی (الأسناب)یشەوە، زۆر شارەزا بووە، و لە چینی یەکەمی سوودمەندەکان لە (ئەبو ئەسوەدی دۆئلی)، دێتە ئەژمار.

- چینی دووەم:

- ١. (عنبسة بن معدان)، کە بە (فیل) ناسراوە، و نەحوی لە ئەبو ئەسوەدەوە گرتووە.
- ٢. (یحیی بن یعمر).
- ٣. شقی عدوانی.
- ٤. (نصر بن عاصم لَیْثي)، کە نەحوی لە (یحیی بن یعمر) وەرگرتووە، و لە شارەزایانی ئیعرابی قورئان بووە.
- ٥. (میمون أقرن)، کە نەحوی لە (عنبسة) وەرگرتووە.

چینی سێیەم:

١. (أبن أبی عقرب).

٢. (عبدالله بن أبی أسحق حضرمي). ئەم زانایە، نەحوی لە (یحیی بن یعمر) و (نصر بن عاصم) و (میمون أقرن) وەرگرتووە، و هەر وەها خاوەنی

خوێندنەوەی تایبەتی خۆی بووە، بۆ قورئـانی پـیرۆز، بـۆ نموونـە، ئایـەتی (... إن البقر تشابه علينا...)ـی، بە (إن البقرة تشّابهت علينـا) خوێندۆتـەوە، واتـە، لـە جێگای (البقر)، ووتویەتی: (البقرة)، و شەددەی لە سەر شینی (تشّابه) دانـاوە، و (تاء)ـی، تەئنیسی پێوە لکاندووە، هەرچەندە زانایانی بواری زانـستەکانی قورئـان لـەم بارەیەوە ڕەخنەیان گرتووە، و بە خوێندنەوە هەڵـە، و لاوازەکـان ناوزەدیـان کردووە، بەڵام ئەم خوێندنەوەیە، لە لایەن(أبوحيان)ـەوە، بە دروست لـە ڕووی نەحوییەوە هاتۆتە ئەژمار، وە هـەروەها ئایـەکانی (الزانيـةَ والزانـي)، و (الـسارق والسارقة)ـی، بە مەنصوبی خوێندوەتەوە.

## - چینی چوارەم :

١. (أبو عمرو، بن علا البصري)، کە یەکێکـە لـە حـەوت قورئانخوێنـە باشەکان، و زانایەکی بەرجەستە، و مەزن بووە، بۆ نموونە، لـە ئایـەتی (وما ليَ لا أعبدالذي)دا، بە فەتحـە خوێندوویەتییـەوە، و گوتوویـەتی بـە سـکون خوێندنەوەی، وەقفی لێ دروست دەبێت، و دوای وەقفیش گوتنی (لا أعبد)، لە پلەی دەستپێکردن (إبتداء) دایە، و لـە دەرەنجامدا نەفی کردنـی عیبـادەت دێتە دی!

٢. (عيسي بن عمر الثقفي)، زانایەکی مەزنە، و نەحوی لە (أبـو عمـرو البـصري)، و (أبوالأسـود الـدؤلي) وەرگرتـووە، و دانـەری کتێبـەکانی (الأكمال) و (الجامع)ـە، لە وەصفی ئەم زانایە و کتێبەکانیدا، گوتراوە:

بطل النحو جميعاً كـــلـه غير ما أحدث عيسي بن عمر
ذاك إكمال، و هذا جامع فهما للنَّاس، شمس و قـــمـر

ئەم زانایە، ڕستەی زۆر سەیری گوتـووە، و تەنانـەت عەرەبـەکانیش لێـی تێنەگەیـشتوون، لـە کاتێکـدا ڕسـتەکانیش لـە ڕووی ڕێزمـان، و زمانەوانییەوە دروست بوون، بۆ وێنە، جارێکیان کە لە ماڵ هاتۆتـە دەرەوە، سەیر دەکات، خـەڵکێکی زۆر چـاوەڕوانی دەکـەن، و لێـی کۆبوونەتـەوە، ئەویش پێی گوتوون: (ما لَكُـمْ تَكَأْكَـأْتُمْ عَلَـيَّ، كَتَكَـأْكُؤِكُمْ عَلـي ذي جِنَّـةٍ، إفْرَنْقِعُوا عَنيَّ)، واتە: چی بووە، کـە لـێم کـۆ بوونەتـەوە، و دەڵێـی دەوری کەسێکی شێتتان داوە، دەی دوور بکەونەوە، لێم!

٣. (بكر بن حبيب سهمى)، کە نەحوی لە (إبن إبى أسحاق) وەرگرتووە.

- <u>چینی پێنجەم:</u>

١. (يونس بن حبيب)، نەحوی لـە (أبوعمرو، بن عـلاء) وەرگرتـووە، و مامۆستای (سیبەوەیهی) بووە.

٢. (خليل بن أحمد الفَراهـدي)، لـە زانا مەزنەکانی نەحوە، و مامۆسـتای (سيبَوَيْهِ) بووە، و زۆربەی ڕاکانی، لە کتێبـی (الکتـاب)ـی، سـیبەوەیهیدا ئاماژەیان پێکراوە، و لـە (٣٧٦) باسدا، سوودی لـە فەراهیدی وەرگرتـووە، و لـەو کتێبەدا چی دەستەواژەی (سألتُه قـال..) ی تیادایـە، مەبەسـت پێـی فەراهیدی یە، و لـە یەکەمی ئەو زانایانەیە، کە سەرجەمی پیتەکانی لە دێڕێك شیعردا کۆکردۆتەوە، کە دەڵێت:

صف خلق جود، كمثل الشمس، إذا بزغت
يحظي الضجيع، بها نـخـلاً قنطار

واتە: خەسڵەتی بەخشندەیی، وەك هەتاوی پڕتەو وایە، کە لە بەرامبەر دارخورمایەکدا تیشکێك دەبەخشێت، واتە بەخشندەییەکەی هەموو کەس دەگرێتەوە، و هەر کەسە، و بە گوێرەی خۆی!

– چینی شەشەم:

١. (نَضْر بن شُمَيْل)، لە هۆزی (بەنی مازن)ـە، و قوتابی فەراهیدی بووە، زۆر هەژارو کەمدەست بووە، هەروەك چۆن فەراهیدیش کەمدەست بووە، لە کتێبی (طبقات النحويين)دا ئاماژە بەوە دراوە، کە کاتێك هەژاری زۆری بۆ هێناوە، ڕووە، و خوراسان کۆچی کردووە، جا لە بەصرە خەڵکێکی زۆر بەڕێیان کردووە، کە زۆریان زانا، و بە دەسەڵات بوون، کاتێك گەیشتوونەتە (مَرْبِدْ)، نەضر دانیشتووە، و گوتوویەتی: (يا أهل البصرة، تعزّ عليّ مفارقتكم، و الله لَوْ وجدتُ كُلّ يَومٍ كَيْلَجَةً مِنْ باقلاّ، ما فارقتُكم!)، واتە: ئەی خەڵکی بەسرە، دووری لە ئێوە، لە سەرم زۆر گرانە، سوێند بە خوا، ئەگەر هەر ڕۆژێك پڕ تیانەیەکی بچوك، پاقلەم هەبوایە، بە جێم نەدەهێشتن، و لێتان دوور نەدەکەوتمەوە!! بەڵام لە ناو ئەم هەمووە جەماوەرەدا کەسێك نەبووە، ئەو بەشە پاقلە، کەم و هیچەی بۆ دابین بکات، و ناچار ملی ڕێگای گرتووە، و ڕۆشتووە، بۆ خوراسان!

٢. (سیبویە، عمرو، بن عثمان بن قنبر)، لە گوندی (بیضاء)ـی، نزیك شاری (شیراز) هاتۆتە دنیاوە، و ڕۆشتووە بۆ خوێندن بۆ بەصرە، و لە باشترین قوتابییەکانی خەلیلی فەراهیدی بووە، و مامۆستاکانی بریتین لە (یونس بن حبیب)، و (خەلیل)، کە زیاتر سوودی لە ( خەلیل) وەرگرتووە،

و هەروەها لای (ئەخفەش)یش، خوێندوویەتی، وکتێبی (الکتاب)ـی داناوە، کە دەیان جار چاپکراوەتەوە، و جێگای سودێکی زۆرە، و (موبەڕید)، کە زانایەکی مەزنی نەحوە، ئەو کتێبەی سیبەوەیهی بە (دەریا) ناوبردووە.

* تێبینی: لەفزی (سِیبَوَیْهِ)، لە زمانی فارسیدا، لە دوو ووشە پێکهاتووە، (سیب) لە گەڵ (وَیْهِ)، کە (سیب، واتە: سێو)، و ئەوی تریش، واتە: (بۆن)، و دواجار (بۆنی سێو) دەردەچێت، کە لە بەر چەند هۆیەك ئەم ناوەی لێ نراوە:

- هەر بە زگماکی بۆنی سێوی لێهاتووە.
- یان بە منداڵی دایکی بە سێو زیاتر سەرقاڵی دەکرد، و دەیخلافاند!
- یان لە بەر ئەوەی زۆر جوان بووە، و گۆناکانی وەك، سێوە سوورە وا بوون، بۆیە وا ناونراوە!

بە هەرحاڵ سیبەوەیهی، لە ساڵی (١٦١ هـ) کۆچی دوایی کردووە، و لە (بەسرە)، یان (ساوە)، یان گوندی (بَیْضاءْ) بە خاك سپێردراوە.

## ﴿باسی نۆیەم: بایەخ وتایبەتمەندی بەرهەمەکانی سیبەوەیهی﴾

سیبەوەیهی، لە هزری تیژی خۆی، و تێڕوانینە قووڵەکانی مامۆستاکانییەوە کتێبێکی نووسی، کە لە ڕووی زمان و ئەدەب و ڕەوانبێژی و ئەوانەوە بێ وێنەیە، و خاوەنی بایەخێکی زانستیی، و هەروەها مێژووییە، و یەکەم کتێبە لە بواری خۆیدا، و تیایدا بناغە، و ڕێساگەلێك خراونەتە ڕوو، کە بنچینەی تێگەیشتنی زمانەوانین، و لەو کاتەوە تا ئێستا، و تا هەتاهەتایە.

و لێرەوە دەزانرێت کە سیبەوەیهی کاتێکی زۆر، و ئەزمونێکی قوڵی تەرخان کردووە، تا کتێبەکەی بەم ئاستە گەیاندووە، و بۆیە ساکاریی نەحو، لای ئەبو ئەسوەدی دوئلی دەستی پێکرد، و قوڵیی و فراوانییەکەی لەکتێبی ﴿سیبەوەییهی﴾ دا، بە دەرەنجام گەیشت.

کتێبی (الکتاب)ی ، سیبەوەیهی، یەکێکە لە سەرچاوە گرنگەکانی زانستی نەحو، و بە درێژایی مێژوو مەرجەعی زانایان، و زمانەوانان بووە، و تا درەنگێکیش وەك کتێبی مەنهەجیی خوێندراوە، و لە بەر سەختی و قوڵیی، ئێستا تەنها پسپۆڕانی ئەو بوارە دەتوانن بە کاری بهێنن، و سودی لێ وەربگرن، و ئەو کتێبە ئاسانانەیش کە ئەمڕۆ مەنهەجن، دەرهاویشتەی ئەو کتێبەن، و تەواوی زانایان، و تەنانەت کتێبەکانی ئەم بواری زانستی نەحوە، منەتباری کتێبی (الکتاب)ی، سیبەوەیهین.

## ﴿باسی دەیەم:قسەیەك بۆ ئەوانەی کە بێ بایەخ، دەڕواننە زانستی نەحو﴾

ئەوانەی بێ بایەخ دەڕواننە زانستی نەحو، و سوودەکەی نازانن، بە ڕاستی ئەوانە خۆیان لە تێگەیشتنی ڕاستەقینەی ماناکانی قورئان مەحروم کردووە، کە ئیعراب سەرچاوەی دۆزینەوەی مانا، و ووردەکارییەکانی قورئانە، و ئەویش لە ڕێگەی زانستی نەحو، دەست دەخرێت، بۆیە بە ڕاستی ئەوە حەقیقەتە، کە بە بێ نەحو، و صەرف، دەست نادا بۆ کەس، فامی ئەساسیی دینی موقەدەس، کەواتە باشترین ڕێگا بۆ قورئان ناسی، و حاڵی بوون لێی، کە ئامانجی سەرەکی مسوڵمان، و زانستخوازانە، ئەوەیە کە نەحو زانی باش بێت، و لەوانەیە لێرەوە ڕەخنەگران لەم زانستە، ئەو

ڕەخنەیەی خۆیان بخەنە ڕوو، کە گوایا زانستی نەحویان پێ باشە، بەڵام ڕۆچونیان لە خوێندنی نەحودا لا پێویست نی‌یە، ئەم ڕەخنەیە جێگای خۆیەتی، بەڵام با ئەوەش بزانن، کە ئەو خوێندنە چڕوپڕەی نەحو جێگای خۆیەتی، مەگەر کاتێك ببێتە هۆی ئەوەی کە لە بەر نەحو، سەرجەم زانستەکانی ترت بیر بچنەوە، بۆیە ووردەکاری کردن، و قوولْ خوێندنی نەحو جێگای خۆیەتی، بۆ نموونە، کاتێك کە قوتابی زانی موبتەدا، و خەبەرکامەیە، و زانی کە ئیعرابیان بە ڕەفعەیە، ئیتر لێرەدا کۆتایی نایەت، چونکە لە (خەبەر)دا، یاساکان قوڵتر دەبنەوە، چونکە دەگونجێت، خەبەر، موفرەد بێت، یا خود (ڕستە:جوملە)بێت، و خەبەری موفرەدیش، دووبەشە، یان خاوەنی ئامڕاز (ضمیر)ێکی، گشتگیرە، کە بۆ موبتەداکە دەگەڕێتەوە، و یا خود خاوەنی ئەو ئامڕازەیش نی‌یە، و ئامڕازەکانیش بە گشتی چوار جۆرن، و هەر یەکەیان حوکمی تایبەتی خۆیانیان هەیە! یا خود هەرکات خەبەری موبتەدا، لە ڕستە پێکهاتبوو، دەبێت پەیوەستکارێکی هەبێت، کە بە موبتەداکەی ببەستێتەوە، وە ئەم پەیوەستکارە (ربط)ـە، هەندێ جار حەزف دەکرێت، و ئەمەش لە کاتێکدایە، کە نیشانە (قَرینة) هەبێت، لە سەر ئەوە حەزفکردنە، ئەمە، و چەندەها یاسای پەیوەندیداری تر، بە سادەترین بابەتی نەحو، کە موبتەدا، و خەبەرە!

کەواتە کورتبڕی لەم زانستەدا زیان دەگەیەنێت، و دەبێت خوێندکار، و فەقێ، ئەوەندە قوولْ ببێتەوە، لە زانستی نەحودا، تا سودی ئەوتۆی لێ وەربگرێت، بۆ چاك حاڵی بوون، لە قورئان و سوننەت.

یا خود، بۆ نموونە، لە چەندەها جێگای قورئانی پیرۆزەوە، بابەتی زۆر گرینگ هەن، کە بە زمان زانی، و نەحوزانی، ئاشکرا دەکرێن، و ماناکانیان

دەفامرێتەوە، بۆ نموونە ئایەتی: ﴿وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالاً وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ... الحج ٢٧﴾، کە لێرەدا (رجالا)، کۆی (رَجُل: پیاو) نی یە، بەڵکو (رجالا)، کۆی (رِجْل)ـە، واتە، کە سێك بە پێ بڕوات، و پیادە بێت، و نێر، و مێ دەگرێتەوە، نەك بەس پیاو بگرێتەوە! و بەرامبەرەکەیشی سوارەکانن، کە بە (وعلى كل ضامرٍ) تەعبیری لێدراوە.

یا خود، لە باسی (صیفە)دا، کە ئەگەر سەرنج بدەین، (صیفە: ئاوەڵناو)، شوێنی مەوصوف دەکەوێت، وەك ڕستەکانی (جائني رجلٌ ظريفٌ)، و (مررت برجلٍ ظريفٍ)، بەڵام لە گەڵ ئەم ڕێسایەشدا، چەندەها وردەکاری تر لەم بوارەدا هەن! ئەمەو جگە لەو ڕاجیاییە زۆرانەی نێوان مەدرەسە نەحوییەکانی، وەك: (مەدرەسەی بەسرە)، و (مەدرەسەی کوفە)، و هتد... کە ناسینی سەرجەمیان پێویستە، و جێگای سوودە.

کەواتە: ئەو قسەیەی کە هەندێك کەس دەیکەن، بەوەی کە: (مادام ئیسلام لە قورئان و سوننەتدایە، کەواتە بە خوێندن، و لە بەرکردنی قورئان و سوننەت کارەکە دروست دەبێت، و پێویستمان بە زانستەکانی (نەحو) و صەرف و زمان و هتد... نابێت!)، قسەیەکی بێ مانایە، چونکە هیچ ئامانجێك، بە بێ ئامڕاز نایەتە دی، و ئامڕازی تێگەیشتن لە قورئان و سوننەتیش شارەزایی هەبوونە، بە زانستەکانی (نەحو) و صەرف، و ئەوانی تر، کە سەرچاوەی مەزنی تێگەیشتنی ڕاستەقینەن، لە قورئان و سوننەت، و ئەوانەی بێ بایەخ دەڕواننە زانستی نەحو، یاسای (فاقد الشيء عدوٌّ له)، و (الأنسان عدوُّ ما يجهل)، بە سەریاندا جێبەجێ دەبێت.

## ﴿دواباس: باشترین کتێبە بەکەڵکەکانی زانستی نەحو﴾

ئەوەی لەم دوا باسەدا دەینووسم، پەیڕەوێکی گشتگیرە، بۆ قوتابیانی زانستە شەرعییەکان، تا بزانن لە کوێوە دەست بەم زانستە بکەن، و لە سەر چ کتێبێك بیخوێنن، زانایانی پێشوومان "بەڕەحمەت" بن، لە نەحو زانیندا بێ وێنە بوون، ئەوەندەی بەندە لە ئەزموونی خۆم، و دواتر لێکۆڵینەوە لەم بوارەوە لێم ڕوون بۆتەوە، ئەوەیە کە ئەوان بەردەوام خۆیان بە کتێبە سەختەکانی ئەو بوارەوە سەرقاڵ کردووە، بۆیە هێندە بە توانا و لێزان دەرچوون، ونزیکی کتێب گەلێکی سادە، وئاسانی ئەمڕۆیی نەکەوتوون! ئەو مەنهەجە دێرینە ئەوانی لێوان لێو لە زانست بە گشتی، و نەحو بە تایبەتی دروستکرد، و ئەم کتێبە سادانەی ئەمڕۆیش کە ئێمە پێیانەوە خەریکین، بە ناو خوێندەوارگەلێکی نەزان وفەزیحی لەم بوارەدای، وەك ئێمەی دروست کرد، بەندە ئەو کتێبانەی لێرەدا دەیاننوسمەوە، مەبەستم ئەوە نییە، کە قوتابی دەبێت سەرجەمیان بخوێنێت، نەخێر! بەڵکو مەبەستم ئەوەیە لەم کتێبە سەخت و قوتابی فێرکەرانەوە دەست پێ بکات، و لە ناو ئەمانەدا کتێب هەڵبژێرێ بۆ خوێندنی لە لای مامۆستا، چونکە بێگومان ئەوەی (شەرحی ئیمام سیوطی، لە سەر ئەلفیەی ئیبن مالیك) بزانێت، بێ هیچ گومانێك (شەرحی ئیبن عەقیل) دەزانێت، نەك هەر زانین، بەڵکو گوتنەوەیشی! بەڵام بە پێچەوانەوە مەحاڵە، و ئەوەی (ئیبن عەقیل) بزانێت، هەرگیز وەك خۆی لە (شەرح سیوطی) تێناگات، یاخود ئەوەی کە (عەوامیلی جورجانی) و (بورکەوی) خوێندووە، زۆر زاڵە، بە سەر (التحفة السنية)دا، بەڵام ئەوەی (توحفە)ـــی، خوێندووە، سەر لە (جورجانی) دەرناکات، ئیتر (النحو

الـوافی)، و(النحـو الواضـح)، و ئـەم هـەزاران مەلزەمەیـەی ئـەمڕۆ کـام خوێندەوار دروست دەکەن؟ و چی زیادەیەك دەخەنە سەر هەگبەی زانستی قوتابیانی شەریعەت؟! ئەوکتێبانەی لێرەدا ناویـان دەینووسـم، ئەمانـە کتێبـە دێرینەکانی حوجرەکانی کوردستانن، ئومێدەوارم قوتابیانی ئازیزمان لەمانەوە دەست پێ بکەنـەوە، و لێـرەوە جیلێکـی تـری خوێنـدەوار، وحـاڵیبوو لـە کرۆکی قورئان وسوننەت دروست بکەینەوە.

– کتێبە باشەکانی زانستی نەحو:

١. عەواملی جورجانی[1].

٢. عەواملی بورکەوی[2].

٣. عەواملی مەلا موحسین[3].

٤. المقدمة الاجرومية[4].

٥. مفتاح الاداب، للشيخ عبدالكريم المدرس[5].

٦. الهداية في النحو[6].

٧. اظهار، للامام البركوى.

٨. كافية، ابن الحاجب.

---

([1]) سوپاس بۆ پەروەردگار، دوو شەرحم، لە سەر (عەواملی جورجانی)، بە کوردی نووسیوە، یەکێکیان کورت، و ئەوی تریان درێژە شەرح، کورتە شەرحەکە چەندەها جار چاپکراوەتەوە، و درێژە شەرحەکەیش کە چوارسەد لاپەڕەیە، کتێبخانەی (نارین) بە چاپی گەیاندووە.

([2]) سوپاس بۆ پەروەردگار، (شەرحی عەواملی بورکەوی)م، بە کوردی نووسیوە، و بۆ چەند جارێکیش چاپکراوەتەوە.

([3]) سوپاس بۆ پەروەردگار، (شەرحی عەواملی مەلا موحسین)م، بە کوردی نووسیوە، و چاپکراوە.

([4]) سوپاس بۆ پەروەردگار، (شەرحی ئوجرومیە)م، بە کوردی نووسیوە، و چاپکراوە.

([5]) سوپاس بۆ پەروەردگار، ئەمەیش(شەرحی مفتاح الاداب)ە، کە دەیبینن.

([6]) سوپاس بۆ پەروەردگار، (شەرحی الهداية في النحو)م، بە کوردی نووسیوە، و چاپکراوە.

٩. الفوائد الصمدية[١].

١٠. شرح انموذج.

١١. قطرالندى.

١٢. شرح ملا جامى.

١٣. شذور الذهب.

١٤. البهجة المرضية، (شرح السيوطى، على الفية ابن مالك).

١٥. المنظومة الفريدة، (الفية الامام السيوطى، فى النحو).

١٦. مغنى اللبيب، لابن هشام.

١٧. شرح ابن عقيل[٢].

ئەوەی نووسرا، پوختەیەك بوو، لە مێژووی سەر هەڵدان، و نەشوونما کردن، و دواتر ناسینی زانستی (نەحو)، و پاشان گرنگترین کتێبە مەنهەجییەکانی ئەم بوارە، بە ئومێدی ئەوەی جێگای سوود بن، بۆ سەرجەم، فەقێ، و تامەزرۆیانی زانستە ئیسلامییەکان لە وولاتەکەماندا.

(١) سوپاس بۆ پەروەردگار، شەرحی( الفوائد الصمدية)یەم، نووسیوە، و ئامادەیە بۆ چاپ.

(٢) سوپاس بۆ پەروەردگار، دەستم کردووە، بە ڕاڤەی کوردی، (شەرحی ئیبن عەقیل)، و ئێستا تەنها بەرگی یەکەمیم نووسیوە، و لە چوار بەرگدا دەبێت، کە ئێستا ئەو بەرگی یەکەمەی زیاتر لە هەزار لاپەڕەیە، و لە ژێر چاپدایە.

# پوختەیەك لە بیۆگرافیا، و کەسایەتیی
# ﴿مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس[١]﴾

*** ناوو، لەدایکبوون، و مێژووی بە دنیاهاتنی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس :**

زانای پایە بەرز، و مەزن، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ناوی تەواوی (عەبدولکەریم)ـی، کوڕی (موحەممەد)ـی، کوڕی (فەتاح)ـی)، کوڕی (سلێمان)ـی، کوڕی (مستەفا)ـی، کوڕی (موحەممەد – حەمە خەجێ)، یە، و لە ساڵی (١٨٩٩)ـی، زایینی، لە یەکێك لە گوندەکانی سەر بە شارۆچکەی (خورماڵ)ـی، ناوچەی هەورامانی کوردستانی عێراق، چاوی بە دنیا هەڵهێناوە.

*** کەسایەتیی، و سیفاتەکانی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس:**

مامۆستای مودەڕڕیس باڵای ناوەندی و بەرەو کورتی دەنواند و لەم دواییانەداو لەکاتی نەخۆشی و پیریدا زۆر بچوکی دەنواند، وەك مامۆستا هێمنی شاعیر لەوەسفیدا دەڵێ : جارێك لەگەڵ چەند مامۆستای گەورەو ماقوڵ لەبارەگای حەزرەتی غەوس لەحوجرە تەنگ و چکۆلەکەیدا دانیشتبووین ، من ئەم بیرەم بەمێشکدا دەهات ئەگەر هەموو نوسینە بەنرخەکانی ئەم مامۆستا کورتە باڵا ، ڕەزا سوکە ، خوێن شیرین و قسە خۆشە بێنی، و لەتایەکی تەرازووی باوی و جەستەی لاوازی خۆشی لەتایەکەی دیکە بخەی ، ئایا سەری وە میچی حوجرەکەی ناکەوێ ؟

---

(١) ئەم بیۆگرافیایە، زیاتری لەم دوو ژێدەرە وەرگیراوە:

یەکەم: هەندێ لە یادگارییەکانی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، کۆکردنەوە، و ئامادەکردنی: مامۆستا عبدالدائم هەورامانی، چاپی سلێمانی، ٢٠١١.

دووەم: مودەڕیس نامە، ئامادەکردنی: ئارات ئەبوبەکر ئەحمەد ، چاپی سلێمانی، ٢٠٠٩.

بەردەوام جبەی لەبەرکردووە، و زۆر حەزی بە ڕەنگی قاوەیی دەکرد، مێزەرێکی سپی جوان ڕەنگی لەسەر دەنا و بەبینینی دڵی سپی و خاوێن دەکردەوە و پاکی و نەزاهەتی مامۆستاشی دەگەیاند .

زانایەکی لەخوا ترس و زیرەك و وەڵام بەدەست بوو ، زمان پاراوێکی خۆش قسەو گفت بوو ، مامۆستا تاهیری بەحرکەیی لەوەسفیدا دەڵێ : بەڕاستی مەجلیسی پڕ خێر و بەرەکەت بوون باسی دنیات بەخۆشی دەبیست ، ئەو ماوەی لەخزمەتی دەمایتەوە، هەستت بەخۆشی دەکرد، دەتوت با هەڵنەستی!

قوتابیانی خۆی زۆر خۆشدەویست و هەمیشە لێبوردەیی بەرامبەر بەکار دەهێنان و بگرە تەنها ژیانی ناو فەقێیان و مزگەوتی بەژیان دەزانی .

مامۆستا زۆر بەوەفا بوو ، بەڵکو لەهەموو سیفەتەکانی تری ، ئەم سیفەتەی دیارتر بوو، ئەمەش بەڕوونی لەکتێبەکانیدا بەرچاو دەکەوێ ..... کەهەرکەس چاکەیەکی لەگەڵ کردبێت لەبیری ناکات و باسی دەکات و بەنزای خێر بەسەری دەکاتەوە بۆ نموونە بنواڕە (علماؤنا في خدمة العلم و الدين)، چۆن وەسفی شێخ جەمیلی تاڵەبانی، و هەردوو کوڕەکەی شێخ عەلی و شێخ عەبدولڕەحمان دەکات، یان چۆن وەسفی شێخ عومەری قەرەداغی لەڕۆژگاری ژیانمدا دەکات، و هەر لەو سەرچاوەدا باسی دوو گەنجی سلێمانی موحەممەد ساڵح و موحەممەد سەعید دەکا، و پیاوەتییان لەیاد ناکات، کە وەختێ فەقێ بووە، یارمەتییان داوە، هەروەها بنواڕە ئەو وەفایەی کە بەرامبەر بە شێخی بیارە هەیەتی، و چۆنی دەلاوێنێتەوە لە بنەماڵەی زانیاراندا .

یەکێکی تر لەسیفەتە بەرزەکانی مامۆستا ، موتاڵەعەی چڕو پڕو بەردەوامە، و هیچ کاتێك دەرسێکی بە موتالاو خۆحازرکردن نەوتووەتەوە ، ئەمەش یەکێکە لە ئامۆژگارییەکانی ئیبن قەرەداغی کە پیادەی کردووە .

مامۆستای مودەڕڕیس زۆر غەمخۆری گەلەکەی بوو، کە دەیبینی ڕۆژ بە ڕۆژ نەزانی ئاوقەیان دەبێت، و دەکەونە گێژاوییەوە، هەر بۆیە دەبینی بوێرانە دەستیدایە

نوسین بە کوردی و زۆر لایەن و سوچی خاڵی کتێبخانەی کوردی ڕۆشن و ڕوناك کردەوە، و کوردیش بەزمانی خۆی توانی تەقە لەدەرگای زۆرێك لەزانستەکانی علومی قورئان و حەدیس و بەدیع و عەروز .... بدات، و ئەو دەرگایە بە دەستی مودەڕڕیس ، خرایە سەر پشت بۆ نەوەی ڕابوونی ئیسلامی.

## سیفاتەکانی مامۆستای مودەڕڕیس:

**یەکەم: دنیا نەویستی و بەشوێن دیمەن و کەشخەو ناو و شۆرەتدا نەگەڕان:**

لە سەر ئەم خاڵە دەکرێ دەیان نموونەی زیندوو ڕیز بکرێت(١)، من یەکێك لەو خاڵانەی کەدەیان جار بەچاوی خۆم دیومە و لەسەریشی بەدەنگ هاتووم ، باس دەکەم :

زۆر لەو بەڕێزانەی لێرەدا دانیشتوون، پێش نوێکردنەوەی (باب الشیخ) و لە ساڵەکانی ٧٠ و ٨٠ ئەو ژورەتان دیوە، کە ناوی ژووری مامۆستا بوو، هەم مەدرەسەی بوو ، هەم جێگەی خەو و خواردن و حەوانەوەی بوو .

مامۆستایش کەپێش نوێژ، و مامۆستای ئەو بارەگا گەورە پیرۆزە بوو ، جگە لەوەی هەر کوردێك ڕووی بکردایەتە بەغدا، و زیارەتی بارەگای (گەیلانی) بکردایە، ئەگەر سەردانی مامۆستای مودەڕڕیسیشی نەکردایە، ئەوا سەردانەکەی بەلاوە قەبووڵ نەبوو .. هەر میوانێکی دەرەوەی وولاتیش لە زاناو سەفیرو پیاوی ئاینی و ناودار سەردانی (باب الشیخ)یان بکردایە دوای زیارەتی (گەیلانی) دیارترین کەس مامۆستا بوو، کە جێگەی شانازی بێت و ، شیاوی ئەوە بێت بە ڕوو سورییەوە ئەو میوانانە ڕایی بکات و

---

(١) واتە، مامۆستا محەممەد عەلی قەرەداغی.

دیمەنی گەشی زانستیان لە شێوەیەکی وادا بۆ بنوێنێ بە یادگار لە مێشکیاندا ساڵەها بمێنێتەوە.

مامۆستا لەو ژورەدا بوو، ئەو هەمو میوانە ڕویان دەکردە ئەو ژوورە کە چەند تەختە قەنەفەی کۆنی تێدا بوو ، چەرچەفی کۆن و ڕزیوو پواویان پێوە بوو ، ڕۆژێك یەکێك لەو میوانە بیانییانە هاتە خزمەتی ، دوای دیدەنی و قسە و باس کاتێك هەڵسا دەستی چووبە درز و شەقی چەرچەفی قەنەفەکەدا ، دوای ڕۆیشتنی میوانەکە عەرزی مامۆستام کرد، ئەمە جوان نییە، و ئەگەر بە (سەید یوسف) -کەئەو کاتە موتەوەلی گەیلانی بوو- بڵێیت بە مەمنوونی قەنەفەکانیشت بۆ تازە دەکاتەوە، نەك چەرچەفەکانیان، جا مامۆستا فەرمووی: ڕۆڵە ئەوان خۆیان نابینن؟! من پێیان ناڵێم!

ئەمە لەکاتێکدا بوو، ژووری تەنیشتی ژووری مامۆستا (کمال الدین طائی) بوو، ڕازاوەترین ژوور بوو ، جوانترین تاقم و فەرشی تێدا بوو، (کمال الدین)یش، ئەگەر هەفتەی دوو سێ ڕۆژ بهاتایە، یەك سەعات بەناو دەرسی دەگووتەوە .

هەر لە ژوورەکەی مامۆستایش چەند هەنگاوێك بەولاوە ، ژووری (عبدالوهاب طعمة) بوو، کە ئەگەر بە فەقێی دابنرایەیت، لەوانە بوو ئەو فەقێیە سەری خۆی هەڵبگرێت!! و وولات بەجێبهێڵێت، کەچی ژووری (عبد الوهاب) جگە لەوەی نایابترین فەرش و تاقمی تێدا بوو ، هەموو دیوارەکەی لەباتی بۆیە بە تەختەی ساج ڕووپۆشی کردبوو، کورسی و مێزی میوانی هەبوو ، سورەیای نایاب بەسەر سەریدا شۆڕ بوبووەوە، و تەلەفۆن -کە ئەو کات دەگمەن بوو-، لەم دیوو ئەو دیوییەوە دانرابوو، ئەگەر مامۆستای مودەڕڕیسیش زۆر پەلە و پێویستی بوایە بە یەکێکمانی ئەفەرموو، بڕۆن لای (عبد الوهاب)ـەوە، تەلەفۆنێکم بۆ بکەن .

**دووەم: دڵ نەشکاندن، و ڕوو نەشکاندنی کەس:**

ڕاڤەی فەرمایشتێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وعلی آله وسلم) هەیە، هەرچەندە هەندێ کەس بەلاوازی دادەنێن ، دەفەرموێ: ئێمە بەڕووی کەسانێکەوە پێدەکەنین، و دڵیشمان لە ئاستیاندا خوێن دەدەڵێنێ.

مامۆستا لە ژیانیدا ئەم فەرمایشتەی بەڕێکی پەیڕەوی دەکرد ، گەلێ جار دیومە کەسانی وا هاتونەتە خزمەتی لەڕێگەی ژیانیانەوە لەگەڵ مامۆستادا و ڕابوردویان لە ئاستیدا، زانیومە مامۆستا حەزی لە چارەیان نییە و خۆشی ناوێن ، کەچی کە هاتونەتە خزمەتی، مامۆستا بە جۆرێك ڕەفتاری لەگەڵدا کردوون، ئەگەر کەسێکی ناشارەزا ئەو دیمەنەی بدیبایە وایدەزانی هیچ ناکۆکییەك لە نێوانیاندا نییە، و موو بە نێوانیاندا ناچێت، هەر لە مانای ئەمەیشدایە ئەو پەندە کوردییەی کە دەڵێ: (دەسێ نەتوانم ببیڕم، ماچی دەکەم).

بۆیە وا دەزانم، چەند لە خزمەتی مامۆستادا بووم، لە بیرم نایەت غەیبەتی کەسی کردبێت، یان دڵی کەسی شکاندبێت، ئەوە ناڵێم ئەگەر جارجار فەقێی وا هەبوایە دەرسەکەی باش حازر نەکردایە، یان کەمتەرخەمی لە پێدا چوونەوەو ڕەوانکردنی دەرسەکانیدا بکردایە، مامۆستا لە ڕووی دڵسۆزییەوە لێی تووڕە بووایە.

**سێیەم: بەرنامەی خواردنی:**

فەرمایشتێکی پێغەمبەر(ﷺ) هەیە، واتاکەی ئەمەیە: هیچ کەسێك نییە ئەو ڕۆزییەی خودا بۆی بڕیار داوە نەیخواو بمرێ، کوردیش دەڵێ (هەرکەس زۆر بخوا، زۆر ناژی)، وابزانم مامۆستا ئەم فەرمایشتەی بەجۆرێکی دی مانا کردووە، هەرچەند درێژی و کورتی تەمەن بەدەست خوایە، مامۆستا وەهای لە یەکداوەتەوە، ئەو ئەندازە خۆراکەی خودا بڕیاری داوە کەی تەواو بوو، ئادەمیزادەکەش تەمەنی کۆتایی دێت، وەك بڵێین خودا بۆ زەلامێکی داناوە، لە درێژایی تەمەنیدا (١٠)دە تەن خواردن بخوات، ئەگەر بە

پەنجا ساڵ بیخوات، ئەوا تەمەنی پەنجا ساڵ ئەبێت، و ئەگەر بە حەفتا ساڵیش بیخوات، ئەوا تەمەنی (٧٠) ساڵ ئەبێت، مامۆستا ئەو برە خواردنەی خۆی وا بەشکردبوو، بەشی (١٠٠) ساڵ زیاتری بکات، چونکە بەڕاستی ئەو کەسەی بەوردی سەرنجی بەرنامەی خواردنی مامۆستای بدایە، سەرسام دەبوو، کە مامۆستا چۆن قنیات بەو ئەندازە خواردنە دەکات و چۆن پێی دەژی .

بەیانیان هێلکەیەك یان تۆزێ هەنگوین، یان پارچە پەنیرێ یان شتێکی وەهای دەخوارد و هێشتا هەتاو گزنگی نەدابوو دەستی دەکرد بە دەرس ووتنەوە تا نیوەڕۆ یان تا دەرسەکان تەواو ببوایە ئەوا دەستی دەدایە کتێبێك یان بە خوێندنەوە یان بە نووسینەوە خەریك دەبوو ، ئەگەر میوانی نەهاتایە .

کاتی نیوەڕۆیش خواردنەکەی ئەوە بوو بریق بوو، بە زۆری لە برنج و شلەیەك کە لە سەفەرسازێکدا لەماڵەوە بۆی دەهات .

کاتی نیوەڕۆ گەرم دەکرایەوە، بڕوا ناکام نیوەڕۆیەك بووبێت، یەکێك و دووان هاوبەش نەبووبن لە تەکیدا بۆ ئەو خواردنە کەمە، هەرچەندە زۆر جار وائەبوو کەسانێك هەبوون خۆیان پەنا دەدا تا کاتی نانخواردنەکەی مامۆستا لەو کاتەدا لە پڕو بێ خوڵك و مەوعید و سەلام و عەلەیك، و بەرانبەری مامۆستایان لەسەر سفرەکەی دەگرت ، ئیتر مامۆستا شتێکی لەو خواردنە کەمە بەرکەوتایە هەر ئەوە بوو دەیخوارد و هەڵدەستا، دوای ئەوەیش ئیتر تا بەیانی ڕۆژی داهاتوو ، تۆزێك میوەی لێدەرچێت، کە شەو بەر لە خەو دەیخوارد، هیچ خواردنێکی نەدەخوارد .

**چوارەم: خەوتنی مامۆستا:**

دەبێ ئەوەیش لە بیر نەکەین، کە مامۆستا تەشریفی هەڵدەستا بۆ نوێژی بەیانی ئیتر نەدەخەوتەوە، و پیشەی ڕۆژانەی وەهابوو، دوای نوێژ ڕیزێك وویردی ڕۆژانەی هەبوو ووردە ووردە بەدەم پیاسەو گەڕانەوە دەیخوێند تا کاتی چایی خواردنی بەیانیانی دەهات،

دوای ئەوە وەك وتمان تا نیوەڕۆ سەرقاڵی دەرس ووتنەوە دەبوو، کەم دەپەرژایە سەر شتی تر، دوای نانخواردنی نیوەڕۆیش کاتێ ڕۆژگار درێژ دەبوو ، وەك بەهار و هاوین، دەرگای ژوورەکەی دادەخست و ماوەیەك ڕادەکشا، لەو ماوەیەشدا، ئەگەر بیانهێشتایە بنوێ، پاش کەمێك هەڵدەستا، دەستنوێژی دەگرت، و خەریکی نووسین دەبوو!

کە دەڵێم ئەگەر بیانهێشتایە، مەبەستم ئاماژەیە بۆ حاڵەتێك کە مامۆستا هەمیشە هاواری بوو لە دەستی ، ئەویش ئەوەبوو، ئەو ماوە کەمەی دوای نانخواردنی نیوەڕۆ کە دەیویست ڕابکشێت ، چەند جار لەسەر یەك دەیاندا لە دەرگای ژورەکەی ، ئیتر زەلامێ، ئەو کاتە زیارەتی شێخ عەبدولقادری بۆ گونجا بوو، دەیویست بگەڕێتەوە بۆ هەولێر، یان سلێمانی، ئەگەر زیارەتی مامۆستاشی نەکردایە، زیارەتەکەی بە تەواو نەدەزانی، یان ئەو کاتە گەیشتبووە بەغدا، و نەخۆشی بۆ لای دکتۆر هێنا بوو ، ئەیویست پێش ئەوەی بچێت بۆ عیادە، بچێتە خزمەتی مامۆستاو مامۆستا دوعای خێری بۆ بکات و ناونیشانی دکتۆرێکی باشیشی بداتێ .

دەبێ لەبارەی خەوی مامۆستاوە ئەوەیش لەبیر نەکرێت، مامۆستا کە دوای نوێژی عیشا دەرگای لەسەر خۆی دادەخست، ئیتر نەدەچووە ژێر لێفەو ناو جێگەی گەرم و نەرم و بخەوێت تا بەیانی، بەڵکو وەك دەڵێن شەو قەڵای مێردانە، مامۆستا بەوردی حسابی بۆ ناو ئەو قەڵایە دەکرد، تەنانەت دەیفەرموو: کاتی وا هەیە، شەو تا دوای سەعات دووی نیوەشەو خەریکی نووسین دەبووم .

هەر لەم ڕووەیشەوە فەرمووی، لەنووسینی یەکێك لە کتێبەکانیدا دوای ساڵی ١٩٩٠ چاوی لەدەستدا و بینایی زەرەری هێنا ، چونکە پێش ئەو مێژووە گەلێ جار چومەتە خزمەتی شیعرێك یان بابەتێکی ووردی دەستخەتم بۆ نەخوێندراوەتەوە .. مامۆستا کەیارمەتی داوم بۆ خوێندنەوەی بێ عەینەك خوێندویەتییەوە!!

**لێرەدا بەکورتی ئاماژە بۆ شتێك دەکەم:**

کەڵە زانایان و هەڵکەوتوانی جیهان دەکرێن بە دوو بەشەوە:

بەشێکیان بەش و بەهرەیەکی خوایی هەبووە لەزیرەکیی و بلیمەتیدا و دەستی بۆ هەرچی بردبێت زوو توانای بەسەریدا شکاوەو زانیویەتی و ڕەنجی زۆری بۆ تێگەشتنی نەکێشاوە .

بەشێکیشیان ئەو بەهرەو توانایانە نەبووە، بەڵام قەرەبووی ئەوەیان بە هەوڵ و کۆششی بێوچان و نەبڕاوەیان کردووەتەوە، و گەلێجار لە بەهرەوەرەکان پێشکەوتوو تر بوون.

دەتوانین مامۆستای مودەڕڕیس لەم بەشەیان دابنێین و ئەوەندەی من ئاگاداری ژیانی مامۆستا بووم و ، لەنزیکەوە لەهەڵسوکەوتی ڕۆژانەی شارەزا بووم کەم کەسم دیوە بەئەندازەی مامۆستا حسابی بۆ کات کردبێت، وکاتی بە فیڕۆ نەدابێت، بە جۆرێك سودی تەواوی لەو تەمەنە پیرۆزەو درێژەی بینیوە و هەمووی لە خزمەتی زانستدا بەسەر بردووە، و بە خوێندنەوە، و دەرس گوتنەوە، و نووسین خۆی پێگەیاندووە .

ئەو کتێبانەی لەسەردەمی ئەودا باوبوون و فەقێ بەدەرز دەیانخوێندن، مامۆستا ئەوەندەی گوتبونەوە، هەمویانی لەبەر کردبوون، کتێبی وا هەبووە، لە کتێبە گەورەکانی وەك (مطول) و ، تهذیب و شرح مواقف و ........ دەیان جار تەنانەت کتێبی وایان هەبووە، هەشتا - نەوەد جار سەر لە بەری بە دەرز وتوەتەوە، ئەمانیش جگە لەوەی کە مامۆستا لە سەردەمی فەقێتی خۆیدا زۆر کۆششی کردووە، یەکێك بووە لە فەقێ هەرە ساعییەکانی سەردەمی خۆی، و هەر کتێبێکی خوێندبێت، مەعناکەی بە تەواوی لەبەر کردووە، دواییش نەیهێشتووە، لە بیری بچێتەوە، گەلێ جار کە لە خزمەتیا دەبووین، و دەرسی گوتوەتەوە، مەتنەکانی فریدة، و فرائضی شێخ مەعروفی نۆدێی، و تەلخیص و مەتنی تهذیب و چەندین مەتنی دیکەی لەبەر دەور کردۆتەوە.

**پێنجەم: لەخۆبایبوون:**

گەلێ لەمامۆستایانمان کەلە خوێندندا پێشکەوتوو بوون، و ماوەیەکی زۆر دەرزیان گوتوەتەوە ، ئیتر پێیان وابووە ئەوان لەوە دەرچوون دەرسی هەموو کتێبێك بلێنەوە، و دەبێ ئاخر مادەکان زیاتر بلێنەوە، ئەم مامۆستایانە لە حوجرەکانی کوردستاندا نمونەیان کەم نەبووە، بەلام مامۆستای مودەڕڕیس بەرامبەر بەم خووەیش لە خەلکی دیکە جیاواز بوو ، هەر کەس بچوایەتە خزمەتی بۆ هەر دەرسێك دەستی بە ڕویەوە نەدەنا، و بەگوێرەی بۆچون و تێگەشتنی خۆی لەدەریای زانستی مامۆستا سودمەند دەبوو .

ڕۆژێ چوومە خزمەتی منداڵێك لەخزمەتیا بوو، دەرسی سورەتی (القارعة)ی پێدەگووت، عەرزم کرد:

قوربان کەسێك نییە، ئەم دەرزەی پێبلێت و جەنابت خۆتی پێوە ماندوو نەکەیت؟!

فەرمووی بۆ من چیمە؟! و کێ لە من باشتر پێی دەلێت؟!

**شەشەم: دامەزراوی لە سەر بیروڕای و موساوەمە نەکردنی لە سەر حەق:**

مامۆستا دەربارەی ئەو شتانەی باوەڕی پێیان هەبوو، و بەشێك بوون لە بیروباوەڕی شەرعی و عەقیدەیی ، ئامادە نەبوو، بە هیچ جۆرێك و بۆ هیچ کەسێك لە هەر پلەیەکدا بوایە مویەك لەوەی خۆی باوەڕی پێیەتی و دیارە باوەڕەکەیشی باوەڕی پیاوێکی مسولمانی بڕوا پتەو بوو ، لابدات و سازش لەسەری بکات .

وەك نموونە: لە هەشتاکاندا باسێك لە ئەوقاف کەوتە ناو بە ناوی (ئیستیبدالی زەوی و خانووی وەقف)، باسەکە خرایە بەردەمی (مجلس الاوقاف الاعلی)، کەبەزۆری لە زانایانی ئاینی پێکهاتبوو، ژمارەیان لە دەورووبەری (٩) کەسدا بوو، ئەندامانی ئەو مەجلیسە جگە لە مامۆستای مودەڕڕیس بە تێکڕای دەنگ ئەوەیان پەسەند کرد، کە دروستە ئەو خانوو زەوییانە بفرۆشرێن، و بە پارەکەیان شتی دی بکڕێتە شوێنیان، بەلام مامۆستا بڕوای وابوو، قسەو مەرجی واقیف ئەو کەسەی لەبنەڕەتدا مالەکەی وەقف

کردووە، وەك نەص و دەقی شەرع وایە و گۆڕینی دروست نییە، و بە تەنها مامۆستا ئەو بڕیارەی ئیمزا نەکرد، و گوێی لە هیچ هەڕەشەو مەترسی و دەرئەنجامێك نەبوو!

**حەوتەم : بەتەنگەوە هاتنی نەداران و هەژاران:**

مامۆستا بە حوکمی ئەوەی لەو جێگە گەورەو پیرۆزەدا بوو، خۆیشی پیاوێکی ناودارو ناسراو بوو ، دەسترۆیشتوان خێر و زەکاتیان بۆ ئەهێنا، مامۆستایش بێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە بۆ بەرژەوەندی خۆی شتێك لەو پارە هەڵبگرێت ، چاوی دەگێڕاو بێدەنگ و بەدزییەوە هەژاران ونەبووانی دەستنیشان دەکردو مانگانەی بۆ دەبڕینەوەو لەڕێگەی تایبەتی خۆیەوە بۆی دەناردن ، ئاگاداری گەلێك لەوانەم ولە کاتی نەبوونیی خەڵکی سلێمانیدا دوای ڕاپەرین ،دەیان کەس وخێزان هەبوون لەسلێمانی و دەوروبەریدا مامۆستا دەستگرۆیی دەکردن ، و بە کۆچی دوای مامۆستا ئەو سەرچاوە ووشکی کرد، و ئەو خێزانانە ئەو هیوایەیان نەما.

*** مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، وکاردانەوەی زانایان لە سەری:**

زانایان کاردانەوەیان لەسەر یەکدی بووە لەئارامگرتن و سوور بوون، و نووسین و دارشتن و سەخاوەت و .... ویکچوون لەنێوانیاندا بووە ، تایبەت گەر لە زەمەنێکدا ژیابن و تایبەتی تریش گەر قوتابی و مامۆستا بووبن ..تەنانەت لەشێوازی بیرکردنەوەو بگرە لە هیواکانی خوێندنیشدا .

مامۆستای مودەڕیس ڕەحمەتی خوای لێ بێت، کاریگەر بووە لەژیانی خۆیدا بەزۆرێك لە گەورە پیاوو ناوداران و زۆریش کاردانەوەیان لەسەر درووست بوونی کەسایەتی زانستی ئەو بووە، لە تەقاندنەوەی گڕوتینە شاراوەکانی و بیر فراوانکردنی و چاندنی هیواو ئاواتی بەرز و گەورە لە نووسین و وانە ووتنەوە و بەردەوامی ئەودا دەستی دیار و بەرچاویان هەیە .

وەلێ پێش ئەوەی بچمە سەر باسی ئەم کەسایەتییانە پێمخۆشە ماندوبوونی دایك و باوکی بنرخێنم، لەسەرەتای گەشەی مودەڕڕیسدا کە چۆن بابی (سۆفی موحەممەد) دەستی دەگرێ و دەیخاتە سەر ڕێڕەوی خوێندن و دایکیشی وەکو زۆر هیوای گەورەی بە کوڕە تاقانەکەی هەیە، و بە (حاجی مەلا عەبدولکەریم)نەبێ، قەتاوقەت بانگی نەکردووەن هانی بەردەوامی خوێندنی دەدا، دوای کۆچی دوایی مێردەکەی ، کەئەمە وا لە مودەڕڕیس دەکات، بە بێ پچڕان لەسەر خوێندنەکەی بەردەوام بێـت .

مامۆستای مودەڕڕیس کاردانەوەی دوو کەسایەتی لەسەر بووە ، ئەوانیش (شێخ عومەری) ناسراو بە (أبن القرداغی)، و (شێخ عەلائەددینی نەقشبەندی) یەو مودەڕڕیس زۆر بە ڕوونی ئەمەی پێوە دیارە .

**یەکەمیان** : کەسایەتییەکی زانستییەو زۆر سیفاتی بەرزی لە مامۆستای مودەڕڕیسدا چاندووەو هەر لەوێشەوە فێری نوسین و شێوازی تاقیق بووە، و بە ڕوونی مودەڕڕیس ئەمەی وتووە : ( هیچ کەسایەتییەك لە زانست و وانە بێژیدا سەرسامی نەکردووم ، تەنها مامۆستام شێخ عومەری قەرەداغی نەبێت)، هەروەها هەریەك لە شێخ موحەممەد

عدلی قەرەداغی، و دکتۆر سەلاحەددین سەنگاوی، ئەم ڕاستییەیان بۆ دووبارە کردمەوە، کە مامۆستای مودەڕڕیس هەمیشە باسی (أبن القرداغی) دەکرد، و سەرسامی خۆی دەردەبڕی بۆی!

(أبن القرداغی) توانی کیانێك بۆ مودەڕڕیس پێك بێنێ و کەسایەتی زانسق بەهێز کات لە پێش چاوی خەڵکیدا ، تایبەت کاتێك تەشریف دەباتە بیارە لە بەهاری (١٣٤٧ ك) داو لەپێشچاوی شێخی عەلائەددین و خەڵکی بیارەو تەنانەت ئەوانەی دژایەتی مودەڕڕیسیشیان دەکرد، فەرمووی : ( ئەم زاتە لە من مەلاتر ئەبێت، ئەگەر شێخ لوتف بفەرمێ لە گەڵیا، ئەوەی ئێمە زانیومانە لە خوێندنا وەری گرتووە، بە هۆی تەدریسەوە ئەتوانێ زیادەشی بخاتە سەر ) .

بەردەوام نامە گۆڕینەوە لە نێوانیاندا گوزەراوە، و زیاتر لە بیست نامە لە (ڕۆژگاری ژیانم)دا هاتووە، لە (أبن القرداغی)ییەوە، بۆ مامۆستای مودەڕڕیس ، کە لە ڕێیانەوە ئامۆژگارییەکانی خۆی ئاڕاستەی مودەڕڕیس کردووە .

دیارترینی ئەم نامانە ئەو نامەیە کەسەبر و بەردەوامی لەسەر وانەبێژی دەداتە مامۆستای مودەڕڕیس لە ڕۆژگاری ساردبونەوەو نارەحەتی مودەڕڕیس بەهۆی کۆچی دوایی خێزانی یەکەمییەوە کەتێیدا هاتووە ( انشاء الله ) خەریك بوونت بە وانە بێژییەوە لە جاران زیاتر دەبێ و غەمی مناڵەکان لەمە دوات ناخات و ( ومن یتوکل علی اللە فهو حسبه ) .

**دووەمیان :** (شیخ علاءالدین) کەسایەتییەکی ڕۆحییەو دەستی مودەڕڕیسی گرتووەو خستوویەتییە سەر ڕێڕەوی تەسەوف و مامۆستای مودەڕڕیسیش بە پێشەوا، و مورشیدی ڕۆحی خۆی قەبوولی کردووە، و دوای ئەویش تەمەسوکی بە کەسی ترەوە نەکردووە، شێخی عەلائەددین هانی مامۆستای مودەڕڕیسی داوە لەسەر خوێندن کاتێ قوتابی بووە لە خانەقای (دووڕۆ)، و وەك باوك چاودێری کردووەو لەڕووی ماددی و مەعنەوییەوە یارمەتی داوە، بە تایبەت لە ڕۆژگاری گرانی گەورەدا.

عەلی قەرەداغی، و دکتۆر سەلاحەدین سەنگاوی، ئەم ڕاستییەیان بۆ دووبارە کردمەوە، کە مامۆستای مودەڕڕیس هەمیشە باسی (أبن القرداغی) دەکرد، و سەرسامی خۆی دەردەبڕی بۆی!

(أبن القرداغی) توانی کیانێك بۆ مودەڕڕیس پێك بێنێ و کەسایەتی زانستی بەهێز کات لە پێش چاوی خەڵکیدا ، تایبەت کاتێك تەشریف دەباتە بیارە لە بەهاری (١٣٤٧ ك) داو لەپێشچاوی شێخی عەلائەددین و خەڵکی بیارەو تەنانەت ئەوانەی دژایەتی مودەڕڕیسیشیان دەکرد، فەرمووی : ( ئەم زاتە لە من مەلاتر ئەبێت، ئەگەر شێخ لوتف بفەرمێ لە گەڵیا، ئەوەی ئێمە زانیومانە لە خوێندنا وەری گرتووە، بە هۆی تەدریسەوە ئەتوانێ زیادەشی بخاتە سەر ) .

بەردەوام نامە گۆڕینەوە لە نێوانیاندا گوزەراوە، و زیاتر لە بیست نامە لە (ڕۆژگاری ژیانم)دا هاتووە، لە (أبن القرداغی)یەوە، بۆ مامۆستای مودەڕڕیس ، کە لە ڕێیانەوە ئامۆژگارییەکانی خۆی ئاڕاستەی مودەڕڕیس کردووە .

دیارترینی ئەم نامانە ئەو نامەیە کەسەبر و بەردەوامی لەسەر وانەبێژی دەداتە مامۆستای مودەڕڕیس لە ڕۆژگاری ساردبونەوەو نارەحەتی مودەڕڕیس بەهۆی کۆچی دوایی خێزانی یەکەمییەوە کەتێیدا هاتووە ( انشاء الله ) خەریك بوونت بە وانە بێژییەوە لە جاران زیاتر دەبێ و غەمی منداڵەکان لەمە دوات ناخات و ( ومن يتوكل على الله فهو حسبه ) .

**دووەمیان :** (شیخ علاءالدین) کەسایەتییەکی ڕۆحییەو دەستی مودەڕڕیسی گرتووەو خستوویەتییە سەر ڕێڕەوی تەسەوف و مامۆستای مودەڕڕیسیش بە پێشەوا، و مورشیدی ڕۆحی خۆی قەبوڵی کردووە، و دوای ئەویش تەمەسوکی بە کەسی ترەوە نەکردووە، شێخی عەلائەددین هانی مامۆستای مودەڕڕیسی داوە لەسەر خوێندن کاتێ قوتابی بووە لە خانەقای (دوورۆ)، و وەك باوك چاودێری کردووەو لەڕووی ماددی و مەعنەوییەوە یارمەتی داوە، بە تایبەت لە ڕۆژگاری گرانی گەورەدا.

سیفەتی سەخاوەت و یارمەتی دانی هەزاران هەر لەو ساتەوە لە مودەڕڕیسدا چەکەرەی کردووە و دیاردەکەی بە ئاشکرا دەبینرێ ، کاتێ مامۆستای مودەڕڕیس لە بەغداد دادەنیشێ و یارمەتی لێقەوماوانی کورد دەدات کەرێیان دەکەوێتە بەغداد بۆ پاروە نانێکی بژێوی یان لەبەر شیفایەك بۆ نەخۆشییەکانیان ، بەراستی حوجرەکەی گەیلانی خانەی بێنەوایان و لێقەوماوانی کورد بوو ، هەزاران کورد شاهیدی ئەم ڕاستییە دەدەن و من بۆ خۆم چەندەها جار یارمەتی مودەڕڕیسم بینیوە بۆ لێقەوماوانی کورد و داماوی بێ جێ و ڕێم دیوە لەکنجوری حوجرەکەی مامۆستای مودەڕڕیسدا حەواوەتەوەتەوە، و ئۆقرەی گرتووە .

لەدوای ئەوەی مودەڕڕیس ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێت، و لە (نێرگسەجاڕ) دەبێتە مەلا هەر شێخی عەلائەدین دەستی دەگرێ و لە بیارە دایدەمەزرێنێ و لەپەنای شێخدا بیست و پێنج ساڵ وانە دەڵێتەوە و چەندین مامۆستای بەرز لەسەر دەستی ئیجازە وەردەگرن .

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ مامۆستای مودەڕڕیس زۆر موتەئەسیر بووە بە دوو کەسایەتی یەکێکیان کەسایەتییەکی بەهێزی زانستی و ئەویتریان کەسایەتییەکی ڕۆحی بەرز و پاك هەر ئەم کاردانەوەیە مامۆستای مودەڕڕیس دەکاتە زانایەکی سۆفی ، دەکاتە موجتەهیدێکی دیندارو نووسراوەکانی شاهیدی ئەم ڕاستییەن .

*** وەسف و سەنای زانایان لە سەر مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس:**

لەگەڵ سازدانی چەند دیمانە و چاو پێکەوتنێکدا لەگەڵ هەندێ زاناو ناودارو کەسایەتیدا ، هەریەك بە چەشنێ وەسفی مامۆستای مودەڕڕیسی دەکردو لە سەنای ئەودا بەجۆرێ دەپشکوا، ئەمەش مشتێکە لە خەروارێك :

**١. شێخ طەیـبـی بەحرکی :**

مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس – رحمه الله – زانایەکی بە تەقوا بوو ، قەت ڕیای نەدەکرد، و خۆی لە دەسەڵاتداران نزیك نەدەکردەوە، زۆر بە ئیخلاص بوو، بۆ مەداریسی دینی ، ئەوەی سەرسامی کردبووم، ئەو ئەدەبە کوردانە کەوەری گرتبوو دانیشتنی چەند ساڵەی لە بەغداد پێی نەگۆڕی بوو!

**٢. مامۆستا عەبدولقادری کوڕی حاجی ڕەسوڵی بەحرکی :**

مامۆستام مودەڕڕیس – رحمه الله – هەرکات یادی دەکەم وا دەزانم بەرامبەر زانای پایە بەرز ئیمامی (سیوطی) وەستاوم، هەمیشە وتوومە : بەڕاستی ئەو (سیوطی) زەمەنی ئێمەیە ، بە مەندە کۆتایی دێنم لە حەقیدا ، خوا ڕەحمان پێ بکات بەهۆی بەرەکەت و شوێنەواری پاکییەتی ئەوەوە .

**٣. دکتۆر موحەممەد ئەحمەد گەزنەیی :**

مامۆستای مودەڕڕیس بەنموونەی نوسەر و تاقیقیان لەنێوان زانایانی کورددا لە عێراق دێتە ژمار و بگرە لەنێو زانایانی گشت عێراق ، هەروەها بە دەریایەك لەزانست قەڵەم ڕەو دەکرێ، لە سەرجەم زانستە عەقلی و نەقلییەکاندا، بە سەرچاوەی تەقواو ڕەوشی بەرزی پەسەند حساب دەکرێ.

بەڕاستی زۆر خۆ بەکەم زانە ، زۆر بەسۆزە ، لەگەڵ قوتابییەکانیدا بە بەزەییە ، لەگەڵ گەلەکەیدا و لەگەڵ هەموو خەڵکی ، بڕوای زۆر بەتینە ، پشت بە خوا

بەستدیەکی بەهێزە ، زانست و ژیانی خۆی تەرخان کردووە بۆ خزمەتی دینی پاك و بڵاوکردنەوەی بە هەرسێ زمانی عەرەبی و کوردی و فارسی .

**٤. دکتۆر عوسمان موحەممەد غەریبی هاشمی کوردی – یەکێکە لە موجازەکانی :**

ئێستە ئەوەم دێنێتەوە یاد(١)، کە دکتۆر عەبدولحەمید حەمەد شەهاب ئەلعوبێدی، چاودێر لەسەر دکتۆراکەم، لەبەردەم سەرجەم مامۆستایاندا و لەکلتی گفتوگۆی سەرنامەی دکتۆراکە فەرمووی :

( زانای عەللامە ، موحەددیسی گەورە ، شێخ "عەبدولفەتاح أبو غدة"، سەردانی مامۆستا مودەڕریسی کرد لە بەغداو هاتە دەرەوە بەسەرسامییەوە ووتی : قەت بەبڕوامدا نەدەهات لەبەغداد کەسانی وەك شافعی هەبن لە زەمانی خۆیدا ، بگرە لەویش زاناتر .

**٥. مامۆستا شێخ جەلال، شێخ عەبدوڵڵا دەمەیەوی:**

مامۆستا شێخ جەلالی، کوڕی شێخ عەبدوڵڵای دەمەیەوی، کە موجیزمە، و مامی باوکمە، و زانایەکی پایەبەرزی ناوچەی هەورامان ومەریوانی کوردستانی ئێرانە، و موجازی عەللامە مامۆستا سەیید بابەشێخی ئەڵمانەیە، و تێکڕای تەمەنی نزیکەی (٥٤) ساڵ لە خزمەت حوجرە، و فەقێدا بووە، و لە بیارە لە سەر دەستی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس خوێندویەتی، و تەنانەت ئەو کاتەی کە جەنابی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، بۆ دواجار بیارەی جێهێشتووە، مامۆستا شێخ جەلال، لەوێ دوامادەی خوێندووە، و فەرمووی: لە گەڵ مامۆستا بە تکا ورجا وگریان تا ملەگای چنار، واتە: (ئەوبەری بیارە) ڕۆیشتم، و زۆر لێی پاڕامەوە، کە نەڕوات و بەجێمان نەهێڵێ، بەڵام بارودۆخی جەنابیان وای خواست، کە تەشریفی لەوێ نەمێنێت، و ئەوەیشی فەرموو، کە بۆ خۆم بینیم، کە شێخی

---

(١) واتە، مامۆستا عبدالدائم هەورامانی.

عەلائەددین زانی، تەشریفی مامۆستای مودەڕیس ڕۆیشتووە، گریا، وە دوای ئەم واقیعەیە بە فەرمانی شێخی عەلائەددین، مامۆستا شێخ جەلال کراوەتە مودەڕیسی بیارە، و ماوەی شەش مانگ کاروباری تەدریس وحوجرەی ڕاپەڕاندووە، و ئەو شەرەفەی مودەڕسێتی بیارەیشی بەرکەوتووە، تا (عەللامەی بالیسانی) تەشریفی هاتۆتە بیارە، لەم نێوەندەدا مامۆستا شێخ جەلال لە وەسفی مامۆستا (نامی)دا، فەرموویەتی:

## ﴿چەند دێڕێك لە ستایشی شافعیی دووەم، مامۆستای نامی، عەللامە مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس﴾

مامۆستای نامی، عەللامەی زەمان      دەست نەناڵێ، تا ئاخر زەمان
مامۆسای بەڕێز، زانای کوردەوار      دانەری تەفسیر، کەلامی نازار
تەفسیری نامی، دەلیلی دینە      کلیلی دەرگای، پیرۆزی ژینە
عەللامەی زەمان، ڕەهبەری سەروەر      ئیحیاکەرەوەی شەرعی پێغەمبەرﷺ
عومری درێژکە، ئەی خوای ئەکبەر      بۆ تەرویجی دین، شەرعی پێغەمبەرﷺ
شافیعیی دووەم، لە کوردستانا      هەر وەصفی تۆیە، لە ڕووی جیهانا
مامۆسای نامی، صاحێب غوڕڕ، وتاج      تەفسیری نامی، خوا دای ڕەواج
من بۆچی باشم، بێ کەڵك، و جورە      مامۆسا باشە، دڵی پڕ نوورە
ئوستادی نامی، بۆ تۆ سەد سەلام      هەم عەفوی خودا، خاتیمەی کەلام
نووری چاوەکەم، نووری ئیسلامە      لە دنیا و دینا، ئەمە مەرامە
من بە قوربانی قەڵەم، و زووانی      حیکمەت، و وەرەع، و نوکتە، و بەیانی
گوڵزار بە نەشئە، وەکو بەهارە      شیعر، و نەسری ئەو، وەکو گوڵزارە

نامـەکەی هۆشیار، لـە لای جـەلالـە   لـە نـاو تەصنیفات، وەکو هیلالـە
دەسنووس مودەڕیس، شافیعیی زەمان   ئوستادی نامیی، کورد، و کوردستان
بەهاری نامی، چونکە گوڵزارە   بۆنی بەهەشتی، تێدا دیـارە
هـەموو حیکمەت، و ئایە، و حـەدیسە   تـەربیە، و تەکلیف، بـــۆ جینن، و ئینسە
ڕێنومای خەیرە، بۆ گەلی کوردان   بۆ زانین مەعنای ئایاتی قورئان
نامەی ئایینە، بۆ عیلم، و عیرفان   بە نەشری ئەحکام، ئایاتی قورئان
تەفسیری نامی، مەعنای تەواوە   بۆ گەلی ئیسلام، نەفعی دراوە
بە دەستی (جەلال) ئەمـە نووسراوە   نەفعی بۆ عوموم، تەرتیب کراوە

### ٦. مامۆستا کاکەشێخی، شێخ جەلیلی شێخ عەبدوڵڵای دەمەیەوی:

ئەم مامۆستا بەڕێزەیش، کە دەکاتە ئامۆزای باوکم، یەکێکە لـە مەلا باش، وکەسایەتییە دیارەکانی ناوچەی هەورامان، ومەریوان لـە کوردستانی ئێران، کوڕی مامۆستا شێخ جەلیلی شێخ عەبدوڵڵای دەمەیەوی،یە، لـە ناوچەی هەورامانی ئێران، کە جەنابی مامۆستا شێخ جەلیل (خوا لێی خۆش بێت) هاو فەقێ، و دۆستی گیانیی جەنابی عەلـلامەی مودەڕیس بووە، وپەیوەندی دۆستانە، وقوڵ لـە نێوانیاندا هەبووە، و تەنانەت مامۆستای مودەڕیس دوای وەفاتی مامۆستا شێخ جەلیل، ئەو پەیوەندییانەی نەپساندووە، و کتێبەکانی خۆی بە هەدیە لـە بەغداوە ناردووە، بۆ جەنابی مامۆستا کاکەشێخی، کوڕی مامۆستا شێخ جەلیل، و مەرحەمەت و لوتفی خۆی زۆر دەربارەی جەنابیان وتەواوی خانەوادەی شێخ عەبدوڵڵای دەمەیەوی،

نواندووه،(غفرالله له، وأسكنه فسيح جناته)، جا مامۆستا كاكه شێخ له وەصفی مامۆستای (نامی)یدا، نووسیویەتی:

مامۆستای ئازیز، شوعلەی چرای دین ڕۆشنكەرەوەی صەحرای دەشتی ژین

ئوستادی هـــــونەر، باخەوانی دین واریسی حـەزرەت ڕەسولی ئەمینﷺ

چرای ڕووناكی بۆ كـــورد هەڵكرا پێنووسی هونەر دەستی تـۆ درا

نازانم وەصفی كام هونەرت كـــەم درێژیی ژینم، بـــــــە قوربانت كەم

## ٧. مامۆستا نوری فارس حەمەخان:

زانای مەزن، و وەرگێڕی (ریاض الصالحین)، و (موختەصەری صەحیحی بوخاری)، و (التاج الجامع للاصول)، و هەزاران فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بۆ سەر زمانی كوردی، لە وەصفی مامۆستا مەلا عەبدولكەریمی مودەڕیسدا، فەرموویەتی:

علماء امة الهدى أرواحنا

لهم الفدى سور لدينك خافر

ألقت مواكبهم بكوبة من أل

كرد الهداة بهم تقر نواظر

من بينهم زين الشيوخ شيخنا

عبدالكريم لدين أحمد ناشر

بوركت يا ابن الكردى سوف تفاخر

امم بكم وبعلمكم ستناظر

لخوالد الكتب العظام نوادر

ومؤلفاتكم لتلك بوادر

سارت خزائن الكنوز فانها

لخير مجمع العلوم مصادر

تفنى الجبال والكتاب سيخلد

ففي الجنان للهداة منابر

بالنور مكتوب على جبينه

سيماه في هذا الشعار ظاهر

نور الوقار على الجبين اذاسما

يعني هنا روح الديانة حاظر

*** ئەو پلەو وەزیفانەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، بینیونی:**

لەگەڵ ئەوەی مامۆستای مودەڕڕیس بە گوزەرێکی نائارامی سیاسیدا تێپەڕیوە لەگەڵ ئەو بارە ئابورییە داتەپیوەی ولاتەکەیدا، توانیویەتی هەندێ پلە وەرگرێ و لە چەند وەزیفەیەکدا بەشدار بێت، لەم باسەدا، و بە پێی مێژووەکانیان ڕیزیان دەکەین.

١. بووەتە مامۆستا لە قوتابخانەو حوجرەی (نێرگسەجاڕ)، ئەمەش لە ساڵی (١٣٤٧ك/١٩٢٤ز)، هەتا کۆتایی ساڵی (١٣٤٦ /١٩٢٧ز).

٢. بووەتە مامۆستا و وانەبێژ لە (خانەقای بیارە)، لە سەرەتای ساڵی (١٣٤٧ك/١٩٢٨ز)، تا ساڵی (١٣٧١ك / ١٩٥١ز) .

٣. بەفەرمی بووەتە وانەبێژ لەمزگەوتی ( حاجی حان) لە سلێمانی، ئەمەش لەساڵی (١٣٧١ك / ١٩٥١ز)، تا ساڵی (١٣٧٤/١٩٥٤ز) .

٤. چووەتە کەرکوك و لە (تەکییەی حاجی شێخ جەمیلی تاڵەبانی)، ماوەتەوە، و وانە بێژ بووە لەم تەکییەدا، لە ساڵی (١٣٧٤ ك /١٩٥٤ ز) تاساڵی ( ١٣٨٠ك / ١٩٦٠ ز ) .

٥. بووەتە پێشنوێژ و وتار خوێن لە مزگەوتی (ئەحمەدی)، لە نزیك وەزارەتی بەرگری پێشوو لە بەغداد، ئەمەش لە ساڵی(١٩٦٠ز)، دوای دەرچوون لە تاقیکردنەوەی وتار خوێنی و پێشنوێژیدا .

٦. دامەزراوە بە وانەبێژ لە قوتابخانەی (عاتیکە خاتوون)، لە مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانییدا ، لە جەمادی یەکەمی ( ١٣٨٠ ك / ١٩٦٠ ز ) .

٧. لەدوای ئەوەی ساڵی (١٣٩٣ ك / ١٩٧٣ ز ) خانەنشین کراوە، لە لایەن بنەماڵەی شێخی گەیلانییەوە، شەرەفی مانەوەی لە مزگەوتی گەیلانی پێبەخشراوە بۆ فەتوادان بۆ مسوڵمانان و پێشنوێژی کردنی عەسر و نیوەڕۆ، و دواتر بووەتە موفتی هەموو عێراق.

٨. سەرۆکی ڕابیتەی زانایانی مسوڵمان بووە لە عێراق، لە ساڵی (١٩٧٤ز)، تا (٢٠٠٣ ز ) .

٩. لە ئەندامە کاراو دیارەکانی کۆڕی زانیاری عێراق بووە ،لە ساڵی ١٩٧٨ ز، تا کۆچی دوایی، وەلێ کارایەتی مامۆستا لە کۆڕدا لە پازدە ساڵ تێپەڕ ناکات، و دواتر ئەندامی شەرەفی کۆڕ بووە.

- **مامۆستاکانی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس:**

مامۆستای مودەڕڕیس لای مامۆستاگەلێ خوێندویەتی ، لە بەحری پڕ زانستیاندا لێوانێکی هەڵگۆزیوە، و لە سینگی خۆیدا کۆی کردووەتەوەو پاش بوونە دەریا لەلێوی شیرین و قەڵەمی ڕەنگینییەوە زەنگۆڵ زەنگۆڵ لێی ڕژاوەو قوتابی گەلێکی تینو لێی تێراو بوون .

**ئەمەش ناونیشانی هەندێك لە مامۆستاكانییەتی:**

**١. مەلا عەبدولواحیدی كوڕی مەلا عەبدوڵڵای هەجیجی :**

لەساڵەكانی (١٣٠٣ ك) دا، لە دایك بووە، لای جەنابی باوكی لە دێی ( بالك ) خوێندویەتی و گەڕاوە بەدوای زانستدا ، هۆگری مامۆستا عەبدولقادری مودەڕڕیسی بیارە بووە و ئیجازەی لە خزمەتییا وەرگرتووە و یەكەمین كەسێكە كە زمانی مامۆستای مودەڕیسی بە پیتەكان ناساندووە، یەكێكە لە دۆستەكانی صۆفی موحەممەدی باوكی مودەڕڕیس و لەدەورروبەری ساڵی(١٣٥٢ك)، لە ساوجی نزیك مەریوان وەفاتی كردووە.

**٢. مەلا مەحمودی جوانڕۆیی :**

لەساڵەكانی دەورروبەری(١٣٠٠ك)، لە دایك بووە، مامۆستای (بالك) بووە، و پاشان چووەتە گوندی (دەرەتفیٚ)، و لەساڵی (١٣٦٣ك)، وەفاتی كردووە .

**٣. مەلا ئەحمەدی ڕەش :**

زانای پایە بەرزی ناسراو بە ( مەلای ڕەش ) خەڵكی گوندی ( پاش بەرد ) ی پێنجوێنە ، لە دەوروبەری(١٣١٣ك) لەدایك بووە، و ئیجازەی لە خزمەتی مەلا عەبدولقادری مودەڕڕیس وەرگرتووە، و دواتریش لە مەلا ئەبوبەكری ئەفەندی بڕوانامەی وەرگرتووە، ئەو زانایەكی وانەبێژی زۆر سەركەوتوو بووە ، لە ساڵی (١٣٧٣ ك)، وەفاتی كردووە .

**٤. شێخ عومەری ناسراو بە ئیبنولقەرەداغی :**

عەلامەی تێگەشتوو ، پیاو چاكی پێگەشتوو ، شێخ عومەری كوڕی شێخ عەبدوللەتیفی گەورەی كوڕی شێخ مەعروفی دەرەقوولە، لە ساڵی(١٣٠٣ ك)، لە شاری سلێمانی لەدایك بووە ، ئیجازەی مەلایەتی لای شێخ نەجیبی قەرەداغی وەرگرتووە، زانایەكی وردەكار بووە، و حاشیەو پەراوێزی لەسەر زۆرێك لە پەڕتووكە

زانستییەکان هەیە، لەساڵی(١٣٥٥ ك . ١٩٣٦ز)، وەفاتیکردووە، و لە گردی سەیوان، لە شاری سلێمانی نێژراوە .

٥. شێخ سلێمانی کوڕی فەقێ عوسمان .

٦. مەلا شەریفی کانی سانان.

٧. مەلا عەزیزی بالیکەدەری .

٨. مەلا عەبدوللەتیفی بانەیی .

٩. مەلا فەیزوڵڵای تاڵش .

١٠. مەلا عارف کوڕی مەلا عەبدوللەتیفی هەجیجی .

١١. شێخ بابە ڕەسوڵی بەرزنجی .

١٢. سەید موحەممەدی کوڕی سەید ئەمینی گیزەملی .

١٣. مەلا موحەممەد سەعیدی عەبابەیلێ.

١٤. حاجی مەلا عەزیزی دەرەتفێ .

- **ژمارەیەك قوتابییەکانی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس:**

١. مەلا موحەممەد زاهدی کوڕی حاجی صاڵحی پاوەیی،(١٣٥١ك، ١٩٣٣ز)، ئیجازەی پێبەخشراوە، و یەکەمین ئیجازەی مامۆستای مودەڕڕیسی لە بیارە بەدەست هێناوە .

٢. مەلا ئەسەدوڵڵای تاڵش ، هەمان ساڵ .

٣. سەید حیسامەدینی موکریانی ١٣٥٥ ك – ١٩٣٦ز .

٤. سەید بەهادینی خوڕخوڕەیی ١٣٥٦ك – ١٩٣٧ز .

٥. مەلا خضری ئالوثی ئالانی، هەمان ساڵ .

٦. شێخ ئەحمەدی سەردەشتی ، هەمان ساڵ .

٧. شێخ عومەری عیززی دێرزوری کوڕی شێخ ئەحمەدی سوریی، (١٣٥٧ ك – ١٩٣٨ ز) .
٨. مەلا عەلی جوانڕۆیی ، هەمان ساڵ .
٩. مەلا مەحمودی وەیسەیی ، هەمان ساڵ .
١٠. مەلا سەعیدی بالکی، ١٣٥٨ ك ١٩٣٩ ز .
١١. مەلا موحسنی ئەڵمانەیی ، هەمان ساڵ .
١٢. شێخ موحەممەدی کوڕی شێخ مارفی نێرگسەجاڕی ، ١٣٥٩ ك ١٩٤٠ ز .
١٣. مەلا محەمەد ئەمینی موکریانی، هەمان ساڵ .
١٤. مەلا قادری کوڕی حاجی ئەحمەدی هاروونی ، ١٣٦٠ ك – ١٩٤١ ز .
١٥. مەلا مەجیدی کانی ساردی وارماوایی، هەمان ساڵ .
١٦. مەلا ئەحمەدی کوڕی سۆفی مەحمودی کوێرکی ، هەمان ساڵ .
١٧. مەلا مەحمودی کانی بەردینەیی ، ١٣٦١ ك – ١٩٤٢ ز .
١٨. مەلا عەلی کوێرکی ، هەمان ساڵ .
١٩. مەلا صاڵحی کوڕی صۆفی عەبدولقادری ژاڵەناوی ، ١٣٦٢ ك – ١٩٤٣ ز .
٢٠. مەلا فەتاحی شاتری ، هەمان ساڵ .
٢١. مەلا صدیقی کوڕی خەلیفە مەلا ڕەحیمی هەوشاری، ١٣٦٣ ك – ١٩٤٤ ز .
٢٢. مەلا سەعیدی گلێجاڵی ، ١٣٦٤ ك – ١٩٤٥ ز .
٢٣. مەلا مەجیدی وەڵەدبەگی، هەمان ساڵ .
٢٤. مەلا محەمەدی کوڕی مەلا ئەحمەدی هەوشاری، ١٣٦٨ ك – ١٩٤٩ ز .
٢٥. مەلا موحەممەد ئەمینی بانەیی ، هەمان ساڵ .
٢٦. مەلا عەبدولقادری خۆشناوی ، هەمان ساڵ .
٢٧. شێخ نەجمەدینی کوڕی شێخ عەبدولقادری حەوتاشی ، ١٣٧١ ك – ١٩٥٢ ز .
٢٨. مەلا موحەممەدی کوڕی عەباسی بانەیی ، هەمان ساڵ .

**ئەو ناوانەی سەرەوە لە بیارە ئیجازەیان وەرگرتووە، لە سلێمانیشدا مامۆستای مودەڕڕیس ئیجازەی هەریەك لەم مامۆستایانەی داوە:**

٢٩. مەلا موحەممەد ئەمین گدورەدێیی ، ١٣٧٥ ك -١٩٥٦ ز .

٣٠. مەلا خدری مەنگوڕی ، هەمان ساڵ .

**لەکەرکووك ئیجازەی ئەم مامۆستایانەی داوە :**

٣١. مەلا ڕەشیدی کوڕی حاجی کاکە حەمەی قوڵی جانی، ١٣٧٦ ك – ١٩٥٧ ز .

٣٢. مەلا عومەر ڕەشیدی نۆدەریاویی، ١٣٧٧ ك ، ١٩٥٨ ز .

٣٣. مەلا حسێنی کۆیی، هەمان ساڵ .

**لە بەغدادیش زۆر مامۆستا لە خزمەتیدا سودمەند بوون، و ئیجازەیان وەرگرتووە، ئەمەش هەندێکیانن:**

٣٤. مەلا عەبدولقادری کوڕی شێخ ڕەسوڵی بەحرکی.

٣٥. دکتۆر عوسمان موحەممەد ئەلهاشمی .

٣٦. شێخ موحەممەد عەلی قەرەداغی ، لە ساڵی (١٩٦٨) ئیجازەی وەرگرتووە.

٣٧. دکتۆر محەممەد مەلا ئەحمەد گەزنەیی، وەزیری ئەوقافی پێشوو، لە ئیدارەی سلێمانی، لە ساڵی (١٩٦٩ز)، ئیجازەی وەرگرتووە .

٣٨. مامۆستا یاسین دەروێش .

٣٩. مەلا موستەفای کۆزە پانکی .

٤٠. دکتۆر صلاح الدین سەنگاوی ، ١٩٦٥.

هەروەها زانا، و مەلای زۆر لە خزمەتیدا خوێندوویانە، بەڵام ئیجازەیان لە جێگای تر وەرگرتووە، لەوانە:

٤١. مامۆستا شێخ جەلال، شێخ عەبدوڵلا دەمەیەوی.

٤٢. مامۆستا مەلا شێخ ئەحمەدی، ئەحمەدئاوا، (باوکم).

*** نازناوەکانی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس:**

مامۆستای مودەڕیس نازناوێکی زۆری هەیە، و لەهەموویان دیارتر (مودەڕڕیس)ـە، کە بە مانای (وانەبێژ) دێت، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە (٢٥) ساڵ لەبیارەدا وانەی وتووەتەوە، خۆیشی هێما بەم نازناوە دەدات و لەکۆتایی کتێبی ( فوائد الفوائح ) دا فەرموویەتی : (فقیر مؤلف عبدالكريم فرزند محمد مشهور بــمدرس) .

یەکێکی تر لە نازناوەکانی بریتییە لە (نامی)، کەئەمەش نازناوی شیعرییەتی و لەشیعرە کوردی و فارسییەکانیدا بەکاری دێنێت، بەڵام لە شیعرە عەرەبییەکانیدا بەکاری ناهێنێ ، هەربۆیە لەنێوەندی عێراقدا بەم نازناوە نەناسراوە .

هەربەم نازناوەوە سێ پەڕتووکی بە چاپگەیاندووە، کە بریتین لە:

١. بەدیع و عەرووزی نامی .

٢. تەفسیری نامی .

٣. خولاصەی تەفسیری نامی .

هەروەها ووشەی ﴿نامی﴾، لەکۆتایی زۆرێك لە شیعرەکانیدا بەدی دەکرێت، وەك :

(نامی) ئەناڵێ لە دەرگای ڕەحمەت

بۆ عەفوی خۆی، و ماباقی ئوممەت

یان :

(نامـــی) بۆمەولای ساداتی کیرام

دیاری ئەنێرێ، بە بەستەی سەلام

یان :

(نامی) ئەم نامـــە ئەنوسێ بۆتان

واتە خادیم بن، بۆ خودای خۆتان

لەگەڵ ئەم دوو نازناوەدا، مامۆستای مودەڕڕیس ناوەکەی پاڵ دەدرێتە پەنای هەندێ شوێن، وەك :

٤ . مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی بیارە، لە بەر ئەوەی پەروەردەی بیارەیە، و پوختەی گەنجی وتوانا، و زۆری تەمەنی لەوێ بە سەر بردووە، و زۆر ماوەتەوە .

٥ مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی کوردی، دەدرێتە پاڵ گەلەکەی.

## * کتێبەکانی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس:

یەکەم : بەزمانی کوردی :

١. سەرچاوەی ئایین: ئەم پەڕتووکە ، لە ساڵی(١٩٨٢ز)دا، بە چاپی گەیاندووە، و لە شەش نامیلکە پێکهاتووە، کە ئەمانەن:

أ- ئیمان و ئیسلام : لە عەقیدەدا نوسراوەو وەرگیراوەلە کتێبی (عەقیدەی هەورامیانە)ی، مەلا مەلا حامدی کاتبی سیراجەددین، کە بە شێوەزاری هەورامی نووسراوە، لە ساڵی(١٣٥٢ ك - ١٩٣٣ز)، لە بیارە دایناوە.

ب-ئەساسی سەعادەت : شیعرە لەباسی ئادابی ئیسلام و ئەرکانی ئیمان لە ساڵی (١٣٥٤ ك - ١٩٣٥ ز)، لە سەر شێوەی پرسیار، و وەڵام نووسیویەتی.

ج- ئاوی حەیات : ژیاننامەی ئەو پێغەمبەرانەیە، کە لە قورئاندا ناویان هاتووە، و پاشان باسی عەشەرەی موبەشەرە، و چوار ئیمامەی موجتەهید دەکات ، ساڵی (١٣٥٨ ك - ١٩٣٩ز)، لە بیارە نووسیویەتی.

د- چل چرای ئیسلام : ڕاڤەی چل فەرمودەی پێغەمبەرە (ﷺ)، ساڵی (١٣٧٣ ك - ١٩٥٤ز)، لە سلێمانی نووسیوییەتی.

ه- نورو نەجات : شیعرێکی کوردییە لە مەدحی پێغەمبەر(ﷺ)، و هاوەڵانیدا، ساڵی (١٣٧٥ ك - ١٩٥٦ز)، لە کەرکوك نووسراوە.

و- ئیقباڵنامە : هۆنراوەیە ، وەرگێڕدراوی پەڕتووکی (دولت نامە) ی مەلا خضری ڕوواریيە، کە بە شێوازی هەورامی لە ساڵی(١٣٥٣ ك- ١٩٣٤ز) نووسراوە.

٧. مەولوودنامە و میعراج نامە ، لە ساڵی(١٣٧٨ ك – ١٩٥٩ ز)، لە کەرکوك نوسیویەتی، و لە ساڵی (١٩٨٢ز)، بە چاپ گەیشتووە .

٨. دوورِشتە : فەرهەنگێکی عەرەبی _ کوردییە ، ساڵی(١٣٨٥ ك -١٩٦٦ ز)، نوسیویەتی، و ساڵی (١٩٩٢ز)، بە چاپ گەیشتووە .

٩. بەهار و گوڵزار : حیکمەت و دانایەتییە، مامۆستای مودەڕڕیس هۆنیویەتیەوە، ساڵی(١٩٧٧ز)، بە چاپ گەیشتووە.

١٠. شەریعەتی ئیسلام : وەرگێڕاوی (منهاج الطالبين)ی، ئیمامی نەوەوییە، چوار بەرگە، دانراوی ساڵی(١٣٧٨ك-١٩٥٨ز)، تا ساڵی(١٣٨١ك-١٩٦١ز)یە.

١١. ووتاری ئاینی بۆ ڕۆژانی هەینی ، بەزمانی کوردی و پوختەیەکی عەرەبی لەساڵی(١٣٨٠ك-١٩٦١ز)، لە بەغدا نوسیویەتی، و لە ساڵی (١٩٧٠ز)دا، بە چاپ گەیشتووە .

١٢. بارانی ڕەحمەت : هۆنراوەیەکە بەژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، دەست پێدەکات، و دواتر کورتە ژیانێکی چوار خەلیفەکە و پاشان بە چەند بابەتێکی فیقهی کۆتایی دێنێ بە چەند باسێك لە باوەڕدا ، لە ساڵی (١٣٥٤ك-١٩٣٥ز)، نووسیویەتی، و لە ساڵی (١٩٥٨ز)، بە چاپ گەیشتووە .

١٣. یادی مەردان : دوو بەرگە، و بەرگێکی باسی (مەولانا خالیدی نەقشبەندییە)، و بەرگەکەی تریش باسی (شێخ عوسمان سیراجەددینە)، لە گەڵ بنەماڵەکەی، بەرگی یەکەم لە ساڵی (١٩٧٩ز)، بە چاپ گەیشتوە، و بەرگی دووەم لە ساڵی (١٩٨٣ ز)، چاپکراوە.

١٤. دیوانی مەولەوی : لێکۆڵینەوەو ڕاڤەی شیعرەکانی مەولەوییە، و لە ساڵی (١٩٥٩ز)، دانراوە، و لە ساڵی (١٩٦١ز)، چاپکراوە .

١٥. ڕاڤەی شیعرەکانی دیوانی (نالی)، فاتحی کوڕی هاوکاری کردووە، و لە حەفتاکاندا چاپکراوە.

١٦. ڕاڤەی شیعرەکانی دیوانی (مەحوی) لە ساڵی(١٣٨٢ك – ١٩٦٢ز)، دایناوە، و لە ساڵی (١٩٧٩ز)، بە چاپ گەیشتووە .

١٧. کۆمەڵە شیعرێکی فەقێ قادری هەمەوەندی ، فاتحی کوڕی هاوکاری باوکی کردووە، و لە ساڵی (١٩٨٠ز)دا، بە چاپ گەیشتووە .

١٨. حەج نامە : لە باسی ئادابی حەج .

١٩. ڕاڤەی (عەقیدەی مەرضیة)ی، مەولەوی لە زانستی کەلامدا، و لە ساڵی (١٩٨٨)، بە چاپی گەیاندووە .

٢٠. مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ : وەرگێڕاوە لە فارسییەوە، پەنجاوپێنج مەکتوبو نووسراوە ، لە ساڵی (١٩٨٤–١٩٩١ز)، لە چوار بەرگدا چاپکراوە، و دواتریش دەزگای (ئاراس)، لە هەولێر، بە شێوەیەکی قەشەنگ چاپی کردۆتەوە.

٢١. بنەماڵەی زانیاران : باس لە هەندێ لە بنەماڵە ناسراوەکان دەکات، کە شۆرەتیان بەزانست و دین بڵاو بووەتەوە، و لە ساڵی (١٩٨٤ز)، بە چاپ گەیشتووە، و لە کتێبی (علماؤنا)دا، بە (بنەماڵەکانی کوردستان ) ناوی هاتووە .

٢٢. تەفسیری نامی : حەوت بەرگە لە تەفسیری قورئانی پیرۆزدا ، لە ساڵی (١٩٨٠–١٩٨٤ز)، بە چاپ گەیشتووە .

٢٣. خولاصەی تەفسیری نامی : سێ بەرگە، بۆ خۆی لە ساڵی (١٩٨٥ز)،دا، کورتی کردۆتەوە.

٢٤.نووری قورئان : لە زانستەکانی قورئاندا، لە ساڵی(١٣١٩ك–١٩٧١ز)، دانراوە، لە بەغدا، و لە ساڵی (١٩٨٥ ز)، بە چاپ گەیشتووە .

٢٥. ڕێگای بەهەشت : لە ساڵی(١٩٨٧ز)، بەچاپ گەیەنراوە .

٢٦. نامەی هۆشیار : ساڵی(١٤٠٩ك-١٩٨٩ز)، لە بەغدا نووسراوە، و لە ساڵی (١٩٩٢ ز)، بە چاپ گەیشتووە .

٢٧.شەرحی (فتح القريب)، لە فیقهی پێشەوا شافیعیدا.

٢٨.بەدیع و عەروزی نامی : لە ساڵی (١٤٠٩ك-١٩٨٩ز)، لە بەغدا نووسراوە، و لە ساڵی (١٩٩١ز)دا، بە چاپ گەیشتووە .

٢٩.ڕێگای ڕەهبەر : لە زانستەکانی فەرموودەدا، (علوم الحديث)، لە ساڵی (١٤٠٢ك-١٩٨٢ز)، لە بەغدا نووسراوە، و لە ساڵی (١٩٨٥ز)، چاپکراوە .

٣٠.سەنا، و سکاڵا: لە ساڵی(١٤٠٦ك-١٩٨٦ز)، لە بەغدا دانراوە، و لە ساڵی (١٩٨٧ز)، چاپکراوە .

بەزمانی عەرەبی :

٣١.جواهر الفتاوى : فەتوای زانا گەلێکی کوردی تێدا کۆکردووەتەوە و لە فەوتان قوتاریکردوون ، سێ بەرگە، و لە ساڵی(١٣٨٢ك ١٩٦٢ز)، دایناوە، و لە ساڵی (١٩٦٩ - ١٩٧١ ز)، بە چاپ گەیشتووە .

٣٢.جواهر الكلام فى عقائد أهل الاسلام : کتێبێکی نایابی عەقائیدە ، کەخۆی هۆنیویەتییەوە، و ڕاڤەی کردووە، لە ساڵی(١٤١١ك - ١٩٥٦ز)، دایناوە، و لە ساڵی (١٩٩٣ز)، بە چاپ گەیشتووە .

٣٣.صفوة اللآلى من مستصفى الامام الغزالي: لە زانستی (اصول الفقه) دایە، و توانای مودەڕڕیس لەم زانستەدا دەخاتە ڕوو، و مەودای تێگەیشتنی لە ئوصوڵ ئاشکرا دەکات، لە ساڵی (١٣٧٥ ك _ ١٩٥٥ ز)، لە کەرکوك دایناوە، و لە ساڵی (١٩٨٦ ز)، چاپکراوە .

٣٤.ارشاد السالك إِلى المناسك : لە باسی حەجدا نووسیویەتی، لە ساڵی (١٩٨٣ز)دا، چاپکراوە .

٣٥.المواهب الحميدة في شرح الفريدة: لە زانستی (نەحو)دا، ئەمەی نووسیوە، و زۆر بە جوانی (فريدة)کەی، ئیمامی سیوطی ڕاڤە کردووە، و لە دونیای فەوتان ڕزگاری کردووە ، و لە ساڵی(١٣٧٤ك – ١٩٥٤ز)، لە سلێمانی داینـاوە، و لە ساڵی (١٩٧٧ز)دا، چاپکراوە .

٣٦. نور الايمان: لە زانستی عەقائید دا نووسراوە، لە ساڵی (١٩٧٨ز)دا، چاپکراوە.

٣٧.ارشاد ألانام الى أركان ألاسلام : لە زانستی فیقهدا نووسیویەتی ، لە ساڵی (١٤٠٨ك – ١٩٨٧ز)، داینـاوە، و لە ساڵی (١٩٩٠ز)، بە چاپ گەیشتووە .

٣٨.رسائل العرفان في الصرف والنحو والوضع والبيان: ئەمەش چەند نامیلکەیەکی لە خۆ گرتووە :

أ- الصرف الواضح للمبتدئين : ساڵی(١٣٨٣ك-١٩٦٣ز)، لە بەغدا داینـاوە.

ب- مفتاح الاداب : لە زانستی نەحودا، و لە ساڵی(١٣٩٣ك-١٩٧٣ز)، نووسراوە، کە ئەم بەرهەمەی بەردەستمانە.

ج- الخلاصة في الوضع والبيان.

د – التبيان في الوضع البيان: ئەم دووانەی کۆتایی، لە ساڵی(١٣٥١ك-١٩٣٢ز)دا، لە بیارە نووسیونی.

٤١. رسائل الرحمة، في المنطق والحكمة : پێنج نامیلکەی لە خۆ گرتووە :

أ. المفتاح في المنطق : لەزانستی لۆژیکدا، وەك سەرەتايەك زۆر بە سوودە، و ساڵی (١٣٥٣ك-١٩٣٤ز)، لە بیارە نووسیویەتی .

ب. الورقات فى المنطق : ساڵی(١٣٤٩ك-١٩٣٠ز)، داینـاوە.

ج. المقالات فى المقولات: هەمان ساڵ نووسیویەتی .

د. رسالة العزيزة في المنطق: ساڵی(١٣٤٨ك – ١٩٢٩ز)، لە بیارە نووسراوە.

هـ. الوجيهة المرضية في المواجهات: لە ساڵی(١٣٤٩ك-١٩٣٠ز)، نووسراوە.

٤٦. اعلام بالغیب، و ایهام بلا ریب: ڕاڤەی هەندێ فەرموودەی پێغەمبەرە، (ﷺ)، لە ساڵی (١٩٩٢ز)، چاپکراوە .

٤٧. نور الاسلام : لە زانستی عەقائیددا نووسراوە، و لە ساڵی(١٣٩٧ك – ١٩٧٧ز)، دایناوە، و لە ساڵی (١٩٧٨ز)، چاپکراوە .

٤٨. علماؤنا في خدمة العلم و الدين : ساڵی(١٤٠١ك – ١٩٨١ز)، نووسیویەتی، و لە ساڵی (١٩٨٣ز)، چاپکراوە ، بە ڕاستی لەم پەڕتووکەوە مامۆستا وەك کەشکۆڵێك بۆ زانایانی کورد دەردەکەوێت.

٤٩.مواهب الرحمن فی تفسیر القرآن : حەوت بەرگە لە تەفسیری قورئاندا لە ساڵی (١٩٨٤ز)، لە بەغدا دایناوە، و لە ساڵی (١٩٨٦-١٩٨٩ز)، چاپکراوە .

٥٠.خلاصة منظومة جواهر الكلام في عقائد اهل الاسلام: کورتکراوەی پەڕتووکی (جواهر الكلام)ـی؛ خۆیەتی ، لە ساڵی (١٩٩٢ز)، لە بەغدا کورتی کردۆتەوە، و لە ساڵی (١٩٨٩ز)، چاپکراوە .

٥١.الرسالة و أنوارها: سەبارەت بە پەیامی پێغەمبەران، و موعجیزەکانیان، (على نبينا، و عليهم أفضل الصلاة، والسلام)، لە ساڵی (١٩٨٩ز)، چاپکراوە.

٥٢.اسناد الاعلام الیٰ حضرة سيد الأنام : لە ساڵی (١٩٩٥ز)، چاپکراوە.

٥٣.الفرائد الجديدة على المطالع السعيدة : ڕاڤەی (مطالعي سيوطى)يە، لە زانستی نەحودا .

٥٤.الوردة العنبرية، في مدح حضرة خير البرية: ساڵی(١٤١٣ك-١٩٩٢ز)، دایناوە، و لە ساڵی (١٩٩٤ز)، چاپکراوە .

٥٥.الأنوار القدسية، في ألأحوال الشخصية.

٥٦.الوسيلة فی شرح الفضيلة : راڤەی (الفضيلة)ی، مەولەوییە، بە عەرەبی لە زانستی (بیروباوەڕ – کەلام)دا، و لە ساڵی (١٩٥٩ز)، لە کەرکووك نووسیویەتی، و لە ساڵی (١٩٧٢ز)، لە دوو بەرگدا چاپکراوە.

سێهەم : بە زمانی فارسی :

٥٧.نامیلکەی (شمشیر کاری بر نسیمی رستگاری)، وەڵامە بۆ پەڕتووکی (نسیمی رستگاری)، کە لە سەر ئیجتیهاد و تەقلید، (ئایەتوڵلا موحەممەد مەردۆخی کوردستانی، سنەیی)، نووسیویەتی، و مامۆستای مودەڕڕیس وەڵامی بۆ نووسیوە، و لە ساڵی(١٣٥٦ك)دا، دایناوە.

٥٨.فوائد الفوائح، در شرح (منظومة الفوائح)، کە مەولەوی لە عەقیدەدا، و بە زمانی فارسی هۆنیویەتییەوە، و مودەڕڕیسیش شیکە ڕاڤەیەکی کردووە، و مەولەوی مەلەوانی لە فارسیدا ناساندووە، بە عەجەمستان.

## دەستنووسەکانی مامۆستای مودەڕڕیس:

٥٩.برکات الأحدية، فی شرح الفوائد الصمدية، لە زانستی نەحودا.

٦٠.العقد الذهب في جيد الأدب، لە زانستی (بديع و عروض)دا، دایناوە.

٦١.العلمان فی علمين: لە زانستی (وضع، و إستعارة) دا، و لە ساڵی(١٣٧٣ك)، نووسراوە.

٦٢. خلاصة التبيان، لە ساڵی(١٣٧٤ك)، دایناوە .

* ئەمانە هەمووی دەستنووسن، و بە زمانی عەرەبی نووسراون.

بە زمانی کوردیش، ئەمانەی نووسیوە:

٦٣.نامەی حەقیقەت : لە ساڵی(١٣٦٢ك)، دایناوە .

٦٤.ڕۆژگاری ژیانم : دەستنوسێکی زۆر جوانەو لەبەسەرهات و ڕۆژگاری ژیانی خۆی نووسیویەتی، (٢٥٦) لاپەڕەی خورشیدییە، و تا ساڵی(١٩٦٩)، ژیانی خۆی بە درێژی تیادا نووسیوە.

٦٥.سۆسەنی کۆسار: ئامۆژگارییە بۆ مسوڵمانان، لە ساڵی(١٤١٩ك)، نووسیویەتی.

٦٦.وەنەوشەی نازار : لە ساڵی(١٤٠٣ك)، دایناوە .

٦٧. پەیڕەوان: باسی خەلیفە دیارەکانی شێخ عوسمان سیراجەددینی یەکەم، و کوڕەکانی دەکات.

٦٨.باخچەی مەعریفەت، لە ساڵی(١٣٧٣ك)، نووسیویەتی .

٦٩.ڕاڤە، و لێکۆڵینەوەی شیعرەکانی سالـم.

٧٠. ڕاڤە، و لێکۆڵینەوەی شیعرەکانی بێسارانی .

٧١.شەمامەی بیندار : فەلسەفەو ئامۆژگارییە .

٧٢.نامەی بەختیار، ئامۆژگاری گشتییە بۆ مسوڵمانان، لە ساڵی(١٣٨٤ك)، دایناوە.

٧٣.ڕاڤەی تەصریفی زەنجانی، بە کوردی لە زانستی صەرفدا، ئێستا چاپکراوە.

٧٤.باوەشێنی دڵ بەچەند دەستە گوڵ باسی ژیانی خۆی دەکات تا بوونە مامۆستا لەبیارە، پاشان وەك وەفایەك باسی شێخەکانی نەقشی دەکات، بە (مەولانا خالید)، دەست پێدەکات، و بە شێخ (عومەر ضیاءالدین) کۆتایی دێت، و مەخابن ئەم کتێبەی تەواو نەکردووە، و بە خەتەکەیدا پێدەچێ، لە تەواوی پیری و دەست لەرزۆکیدا نووسیبێتی!

٧٥.(شهاب سما در رجم جن جان نما)، ئەمەش وەڵامە بۆ کتێبی (جان نما)، دانراوی (ئایەتوڵڵای مەردۆخی)، لە عەقیدەدا، شێخی مودەڕڕیس لە ساڵی (١٣٥٧ك)دا، وەڵامی بۆ نووسیوە.

٧٦.فیوضاتی خدای ذی من: وەڵامە بۆ پەرتووکی کتێبی (یزدان و أهریمن)، دانراوی (ئایەتوڵڵای مەردۆخییە)، کە هەم کتێبەکەی مەردۆخی، و هەم وەڵامەکەی مودەڕڕیس هۆنراوەیە، و لە ساڵی(١٣٥٨ك)دا، دایناوە.

٧٧.گلزار حکمت، در رباعیات فارسی: نامیلکەیەکە لەسەر شێوەی هۆنراوەی فارسی، لە گەڵ چەند چوارینەیەکی فارسی، لە ساڵی(١٣٧٧ك)، دایناوە .

٧٨.هۆنراوەیەکی فارسی لە زانستی تەجویددا ، ساڵی(١٣٧٣ك)، نووسیویەتی .

٧٩.ڕاه رحمت حق، شیعرە بە فارسی .

*** کۆچی دوایی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس:**

زانای پایە بەرز، و مەزن، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، پاش بە سەربردنی تەمەنێکی درێژ، و پڕاوپڕ لە خزمەت، بۆ دواجار لە شەوی بیست و نۆ، لە سەر سی، مانگی هەشتی، ساڵی (٢٠٠٥)ـی، زایینی، کۆچی دوایی کرد، و لە گۆڕستانی (قطب العارفین)، شێخ عەبدولقادری گەیلانی، لە شاری بەغدای پایتەختی عێراق بە خاك سپێردرا. فسلام علیه، یوم ولد، و یوم مات، و یوم یبعث حیًّا.

*** لە پاش کۆچی دوایی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس:**

زانای پایەبەرز، و ئەدیبی ناسراوو، و موجازی عەللامەی مودەڕیس، جەنابی مامۆستا محەمەد عەلیی قەرەداغی، فەرموویەتی:

گەلانی جیهان شانازی گەورەیان لەوەدایە پیاوی زاناو ناودارو بلیمەت و هەڵکەوتویان هەبێت ، تا خۆیانیان پێوە هەڵبکێشن و بەهۆیانەوە شان لەشانی گەلانی پێشکەوتووی جیهان بدەن، و ناوی وولاتیان وزاناکانیان لەڕیزی پێشەوەی شوێنی شانازیدا تۆمار بکرێن، بەڵام گەلی کورد وا باو بووە، بە پەند لەناوماندا کە دەڵێین :(زیندوو کوژی، مردوو پەرست!)، وا بزانم هەرئەمەیشە قانیعی شاعیری والێکردووە، بڵێت:

**وەختە زەمانە منیش کا بە پیاو**

**بمباتە ڕیزی پیـاوانی بـە نـاو**

کەچی بە داخەوە دەڵێم : وەختە بچینە سەر ئەو بڕوایە، بۆ مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس ، دوای کۆچی دوایشی ڕێزی لێنەگیراوە، و وەك پێویست لای لێ نەکراوەتەوە، ئەوەی کە زۆر جێگەی داخە، دوای ڕوخانی ڕژێمی صەددام پێی بەرپرسان و لێپرسراوانی کورد بۆ بەغداد کرایەوە، و جاری وا هەبوو، مانگ و کەمترو زیاتر لە بەغدا دەمانەوە، و سەردانی چەندین کەسیان بە ئاشکرا، و نهێنی

دەکرد، بەڵام نەمانبیست و نەمانبینی یەکێکیان بیر لەوە بکاتەوە، سەردانێکی –با زۆر کورتیش بێت–، مامۆستای مودەڕڕیس بکات!!

ئەوەندەی من(١) لە خزمەتی مامۆستادا ژیاوم و ئاگاداری هەڵسوکەوت و ڕەفتاری لەتەك خەڵکاو پلەی زانیاری و خزمەتگوزاری ودنیانەویستی و لێبوردوویی و چاوپۆشیکردنی ودڵسۆزی بۆگەل و وولات وئایین و بەتەنگەوە بوونی بۆ مەلاو فەقێ و حوجرەو خوێندن و خۆبەکەم زانینی و دووربینی و ..... بووم، بێ سێ و دوو دەڵێم: لەم چەرخەی ئێمەدا هاوتای نەبووە و لەگەلێ ڕوویشەوە لەمەو پێشیش وێنەی لە مێژووی کورددا ڕانەبوردوە، گومانیشم لەوەدا هەیە، لەمەولایش وێنەیەکی وەها لەڕووی ئەو گشتگیرییەوە کەباسمان کرد، لە ناو کورددا هەڵبکەوێتەوە، بەڵام بەداخەوە چەند خۆی خاکی، و بێ فیز، و هەوا بوو، هەروەهایش ماڵئاوایی لێکردین، و ئێمەیش وەك پێویست ڕێزمان لێ نەگرت، و ئەوەی شیاویەتی بۆمان نەکرد!

گومانم لەوەدا نییە، ئێستایش مامۆستا تەشریفی بێتەوە ناومان، و عەرزی بکەین، کە دوای کۆچی دواییشی شتێکی وامان بۆ نەکردووە، کە شیاوی پلەو پایەی ئەو بێت، هەر گلەییمان لێ ناکات، چونکە ئەو بە خواستی خۆی، ئەو ڕێگەی بۆخۆی هەڵبژاردبوو ، بەڵام دەبێ ئێمەیش بۆ ڕێزی خۆمان ئەوەندە کەمتەرخەم بین، دەبێ پیاوی هەڵکەوتووی وامان تێدا بووبێت، و کاری وای بۆ نەکەین، بە جیهانی بناسێنین؟

مامۆستا بە بەرهەمەکانی، و بە دانراوە ناوازە، و نایابەکانی، نەك لای ئێمە، لە لای گەلێ لە گەلانی جیهانیش زیندووە، و زیندووتریش دەمێنێتەوە، ڕۆژبەڕۆژ پلەو پایەی بەرزتر دەبێتەوە و زیاتر دەناسرێت .

بەڵام ئەمانەو لەمانەیش زیاتر بری ئەوە ناکەون، کەئێمەی خاوەنی مامۆستا ، وەك گەلی کوردو ، قەرزارانی کۆڕی دەرس وحوجرەیشی ، وەك فەقێ ومەلا و سەدان

---

(١) واتە، مامۆستا محەممەد عەلی قەرەداغی.

وهەزاران کەسی سوود دیو لەخزمەتیدا، هەرکەس لە ئاستی خۆمانەوە وەفامان بۆی هەبێت، و سوچێك لەو قەرزەی بدەینەوە، کە لە ئەستۆماندایە.

مامۆستا لە ڕووی بەرهەمی زانستی وئەدەبی و مێژوویی، و ئاینییەوە، لەم چەرخەدا کەسی نەگدیوەتیێ، و بەتاقانەی چەرخ و سەردەم دەمێنێتەوە ، ئەمانە هەموو شتێك نەبوون لەژیانی مامۆستادا و گەلێ لایەنی گەورە وپڕ بایەخی دیکە هەبوون لەژیانی مامۆستادا زۆریان بەهۆی کەمتەرخەمی کردنی ئێمەوە لەئاستیاندا لە کیسمان چوون و تێداچوون و دەبێ هەرداخیان بۆ بخۆین .

زۆرمان باش دەزانین، مامۆستا لەڕووی بیرو هۆش و زاکیرە، و لەبیرنەچوونەوەی ئەو شتانەی کە لە ژیانیدا دیونی، هاوتای کەم بوو، مامۆستا بیرەوەری(٩٠)ساڵ زیاتری لە مێشکدا بوو ، هەرکەس لەخزمەتیا بووایە، و گوێی لە قسە، و باس، وگێڕانەوەکانی بگرتایە، لە لایەکەوە تێری لە دانیشتن، لە خزمەتیدا نەدەخوارد، و لەولایشەوە سەرسام دەبوو، لەو هەموو باس و ناو، و مێژوو، و زانیارییانەی، لە مێشکیدا بە ئەمانەتەوە پارێزرابوون، و لە کاتی پێویستدا وەك خۆی دەیگێڕانەوە .

زۆر زوو هەستم بەمە کردبوو، ئاواتم ئەوە بوو، مامۆستا بتوانێ بیرەوەرییەکانی خۆی بنوسێتەوە و ، لەکۆتایی کتێبی (علماؤنا في خدمة العلم والدين)یشەوە، ئاماژەم بۆ سوچێکی ئەمە کردووە ، کاتێکیش زانیم مامۆستا لەوە کەوتووە پێدا ڕابگات، بیرەوەرییەکانی خۆی بنووسێتەوە ، کەوتمە بیرکردنەوە لەوەی هەرشتێك بکەم و زەرەربار، نەك لە نیوەی، لە سەد، یەکیشی بگەڕێتەوە، هەر باشە، بۆیە ساڵی (١٩٩٨)، ئەم باسەم لا درکاندو عەرزم کرد: (ئەگەر بفەرمووی هەفتەی دووسێ شەو دێمە خزمەتت و ، تەسجیل دادەنێم و ، پرسیاری جۆراوجۆرت عەرز دەکەم و دوایی خۆم بەشێنەیی دەیانخەمە سەر کاغەز ، مامۆستا فەرمووی: باشە با نەختێ هەوا فێنك بکات و شەوگار درێژ ببێت ، پارەی تەسجیلەکەیش لەسەرخۆم !).

بەلاّم بەداخەوە، کۆسپ وتەگەرەی وەها هاتنە پێش نەمتوانی ئەم ئاواتەیش بێنمە دی، هەرچەندە کە جارجار ئەچومە خزمەتی تەسجیلی بچوکم لەگەڵ خۆمدا دەبرد، و ئەگەر بارودۆخ گونجاو بوایە پرسیارم لێ ئەکرد، و وەڵامەکانیم تۆمار ئەکرد، بەلاّم ئەمە بێ سەر ئێشە نەبوو ، جارێکیان کەسێك چاوی لێبوو، تەسجیلم بە دەستەوەیە، مامۆستا چاوی کز بووبوو، تەسجیلەکەی نەدەبینی ... کەسەکە کردی بە هەراو کارەکەمی بەشتێکی خراپ وناشایستە دایە قەڵەم .

## لەئاستی خۆمەوە یەك دوو پێشنیاز دەکەم(١):

یەکەم: مامۆستا مەلا عەبدولکەریم، بەڵێ کەڵە زاناو بلیمەتی کورد بوو ، بەلاّم خزمەتەکەی بە تەنها بۆ نەوەی گەلی کورد نەبوو، مامۆستا نزیکەی نیوسەدە لە بەغداد خزمەتی کردو ، ئەو خزمەتکردنەی ، بەشێکی زۆری بەخەڵکی بەغداو ناوەڕاست وخوارتر و نەوەکانیان بوو ، بەدەرس ووتنەوەو فەتواو چارەسەر کردنی گیروگرفتیان و بەشداری کردنی کاروباری کۆمەلاّیەتییان وچەندین لایەنی دیکەیش، ئەوەبوو دواییش ئەوێی گۆڕییەوە بەکوردستان و ، ئارامگاو گڵکۆی هەمیشەیی خۆی لەوێ هەڵبژارد، کەچی ئەوانیش وەك ئێمە سوچێکی ئەو قەرزانەی مامۆستایان نەدایەوە ، کەدەبوو هیچ نەبێ یەکێ لە دانیشگا گەورەکانی بەغدادیان بەناوی ئەوەوە ناو بنایە، و چەند هۆڵ و شەقام و شوێنی دیاریش بەناوی مامۆستا بڕازایەتەوە .

ئێمەی کوردیش حەق وابوو ، کە مامۆستا سەر بە پارێزگای سلێمانییە ، دەروازەی شارمان بەپەیکەری مامۆستا بڕازایەتەوە، و عەموود وکۆڵەکەکانی لەباتی هەڵگرتنی هەندێ وێنەو تابلۆی دیوانی نالی ومەحوی ومەولەوی وکتێبەکانی، یادی مەردان وبنەماڵەی زانیاران وتەفسیری نامی وشەریعەتی ئیسلام وبەهار، وگوڵزارو ......

---

(١) واتە، مامۆستا شێخ محەممەد عەلی قەرەداغی.

بەرهەمەکانی دیکەی مامۆستا برازایەتەوە و ، ئێستەیش نەچوە بچێت و بابدەینەوە بەلای ئەم ئەرکە پیرۆزەدا، و سەروەری ئەم لایەنە لەکیس خۆمان نەدەین، چونکە ئەمڕۆ بێ یا سبەی کەسانێك دەبن، وەك شیاویەتی ڕێز لە مامۆستا بگرن، وئەمانەو زیاتریشی بۆ بکەن .

دووەم: بەشێکی دی لەقەرزدانەوەمان بۆمامۆستا فریاکەوتنی پاشماوەی شوێنەوارەکانییەتی، بۆ ئەمەیش چەند ڕێگایەك هەیە :

١. یەکێك لە ڕەوشتە بەرزەکانی مامۆستا وەفای بۆ هاوەڵان و دۆستان وئەو کەسانە بوو، کە لە کوردستاندا، بە شێوەیەك لە شێوەکان ناسیونی، ئەمەیش لەوەدا ڕەنگدەداتەوە کەمامۆستا ئەوماوە دوورودرێژەی لە بەغداد بوو، ئەو هاوەڵ ودۆستانەی لەبیر نەچووبوو، کوردستانی فەرامۆش نەکردبوو، گەلێ جار لەخزمەتییا بووم یەکێکی خەڵکی سلێمانی ئەهاتە خزمەتی هەواڵی دۆست و مامۆستا وناسراوانی لێئەپرسی، وادەبوو ئەو کەسە عەرزی دەکرد : فلانەکەس کۆچی دوایی کرد ، ئیتر مامۆستا دوای خەفەتخواردن و خوێندنی (إنا لله وإنا إليه راجعون)، دەستی دەدایە ئووچەکەی و پەڕەیەك کاغەزی بەلەپی دەستی و پەنجەکانی دەگرت و هەربەدەم قسە کردنیشەوە لەگەڵ میوانەکانیدا کەکەم وادەبوو ژوورەکەی بێ میوان بێت ، نامەیەکی زۆر جوانی پرسەنامەی بۆ کەسوکاری ئەو کۆچکردووە دەنووسی ، ئەمە جگە لە دەیان نامەی کۆمەڵایەتی و چارەسەرکردنی کێشەو گرفت و ناکۆکیی نێوان کەسان وتایفەوهۆزەکان ، کە بەخەتەجوانەکەی خۆی بۆی نووسیون، و بۆی ناردوون، و یەکێك لەو لایەنانەی وەفا بۆ مامۆستا کەمن بیرم لێکردووەتەوە، کۆکردنەوەی نامەکانییەتی.

ئێستەیش لە ئاستی خۆمەوە هەر لەسەر قسەی خۆمم و بەهیوام بەیارمەتی خوا ئەو پرۆژە جێبەجێ بکەم، و داوا لەهەموو دۆستان و مامۆستا دۆستان و ، خۆشەویستانی

دەکەم، هەرکەس نامەیەکی لەلایە بۆمانی بنێریێ، تا ئەو (گەنجینەی وەفا)ی مامۆستا لە لەناوچوون ڕزگار بکەین.

٢. لایەنێکی دی لە ژیانی مامۆستادا کۆڕوکۆمەڵی حوجرەکەی بوو ، کەدوای تەواوبوونی دەرسەکانی دەبوو، بە دیوەخانێکی گەرمی کەم وێنە، و ئەو حوجرەیەی کە هەمیشە دەرگای بۆ هەموو کەس باز و والاّ بوو، ئەگەر لەبری مامۆستای مودەڕڕیس کەسێکی دی بووایە، دەبوو پاش گوزەرانی دوو سێ پرسگە ، ئەوسا یەکێك کە بیەوێ ببینێ، بیگەیشتایەتێ، ئەو حوجرە دوای دەرس، کۆڕی هەموو بابەتێکی بەسوود و خۆش بوو، یەکێك بۆ پرسیاری شەرع و داوای فەتوا دەهات، یەکێك بۆ باسی ئەدەبی و زانینی مانا و مەبەستی قەصیدەیەك یان شیعرێکی شاعیرێکی کورد دەهات ، یەکێك لەرشتەی باوباپیری کۆنیدا هەندێك سەرەداوی لەدەستدا بوو، هاتبوو مامۆستا بۆی بدۆزێتەوە، یەکێك نەخۆشی هێنابوو، بۆ لای دکتۆر، هاتبوو مامۆستا ڕێنومایی بکات ودوعای خێریشی بۆ بکات ..... ئەمانەو ئەوانەو چەندینی دی ، جگە لەوەی هەرکەسێ لە کوردستانەوە بچوایەتە بەغدا، و زیارەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانیی بکردایە، ئەگەر زیارەتی مامۆستای مودەڕیسی نەکردایە زیارەتەکەی شێخ عبدالقادری بەدڵەوە نەدەنووسا ..... ئەم کۆڕ وکۆمەڵانە گەرم دەبوون و، قسە قسەی ڕادەکێشاو ، دەریای بیرەوەرییەکانی مامۆستا دەجۆشاو ، شەپۆلی یادگارەکانی بەرەو بناری هەورامان و، ملەگای چنار و، خانەقاکانی بیارە، و تەوێڵە، بازرەقەیان دەبەست، سەرگوزەشتە گەلی وەهایان لێ بەرجەستە دەبوو ، ئەگەر تۆمار بکرایەن ، سەربەسەر بە تەلاّو گەوهەر بۆ مێژووی کورد هەرزان بوون، دیارە ئەو کاتانە ئەوانە نەکران، بەلاّم گومانم لەوەدا نییە، سەدان کەس هەن، دوای ئەوە بەشداری ئەو کۆڕو کۆمەڵانە بوون، هەرکەس بەش بەحاڵی خۆی بەهرەمەند بووە، و دانەیەك یان زیاتر گەوهەر، و مرواری لەوانەی لە دەمی پیرۆزی مامۆستا کەوتوونەتە خوارەوە هەڵگرتووەتەوە.

جا پێش ئەوەی ئەوانەی لەسنگی ئەو کەسانەدان، بچنە سکی خاکەوە، وەك ئەوانەی لەسنگی مامۆستادا بوون ، هەوڵی کۆکردنەوەیان و یەکخستن و بابەتبەندییان بدرێت ، بەمەش بەشێك لە گەنجینەی دیوەخانی مامۆستای مودەڕیس دەخرێتە سەر خەرمانی کەلەپوور وشوێنەواری مامۆستای مودەڕیس .

دوا خاڵ دوای کۆچی دوایی مامۆستامان، ئێمەیش وجیهانیش، مامۆستا لە ڕێگەی دانراوەکانییەوە دەناسین، و یادی بە زیندوویی لە دڵ ودەروون وکۆڕو کۆمەڵماندا دەمێنێتەوە، هەموویشمان دەزانین، دانراوەکانی مامۆستا لەو جۆرە دانراوانە نین کەبەجارێك چاپکردن وخوێندنەوەیان کاتیان بەسەر بچێت وخوێنەر کاری پێیان نەمێنێت، بەڵکو دانراوەکانی ڕۆژ بەڕۆژ گەشاوەترو زیندووتر دێنە پێش چاوو پێویستی پێیان زیاتر دەبێت، ئەوەتا دەبینین گەلێك لەو بەرهەمانە یەکجار چاپ دەکرێنەوە، و خەڵکیش زیاتر بە دوواياندا دەگەڕێن.

سەرگوزەشتەی چاپکردنی بەرهەمەکانی کتێبێکی سەربەخۆی دەوێت، کەم کەسیش بەئەندازەی من[1] لەنزیکەوە ئەو سەرگوزەشتە دەزانێت ، مامۆستا ئاواتی گەورەی چاپکردن وبلاوکردنەوەی کتێبەکانی بوو ، بەڵام ئامادەیش نەبوو مندتی کەس هەڵبگرێت، بۆ ئەرکی لەچاپدانیان، هەر ئەمەیش بوو وایکرد لەمن کە دڵسۆزانەو ، بێتەمای پارەو پوول ، ئەو ڕەنجەی بۆ بدەم، کە گەلێجار دەیفەرموو: ئەوەی تۆ بۆت کردووم، کوڕەکانم بۆیان نەکردووم ، بەڵام کەسانێکیش بوون، وایان دەزانی مامۆستا من دەگرێتە ئاڵتوون و کە دەیانبینی سادە دەژیم، دەیانووت: ئەی مامۆستا سەیارەی بۆ نەکڕیوی؟

ببورن لەم قسە زیادەم، تەنها لە بەر مێژوو کردم!

---

(1) واتە، مامۆستا محەممد عەلی قەرەداغی.

هەر لەبەر ئەوە بوو، کە مامۆستا زۆر بەتەنگ دانراوەکانییەوە بوو، وەسییەتنامەی بۆ نووسیم، دەربارەی چاپکردنەوەی بەرهەمەکانی دوای خۆی، و ئەو وەسییەتنامەیە، لە لام پارێزراوە.

لەم ڕووەوە، یەك یادگاری مامۆستام لایە، وەك ئەمانەت دەیگێڕمەوە:

دوای ڕووخانی ڕژێم و ، هاتنەوەم بۆ سلێمانی، مامۆستا (ئەحمەدی نەزیری) سەردانی کردم، و گوتی : مامۆستا مەلا ڕەحیمی دەمەیەوی، خاوەنی(ئینتشاراتی کوردستان)، لە (سنە)، کتێبەکانی مامۆستا چاپ دەکاتەوە، و ئامادەیە وەك مافی چاپکردنەوە، شتێك پارە بداتەوە بە مامۆستا، منیش دوای ئەوەی چووم بۆ بەغدا، و چوومە خزمەتی مامۆستا، و باس و مەبەستەکەم وەك خۆی عەرز کرد، فەرمووی: کتێبەکانی من چاپ دەکەنەوە؟

عەرزم کرد : بەڵێ .........

سێ جار فەرمووی : ئۆخەی ، ئۆخەی ، ئۆخەی!

دوایی فەرمووی: نەوەڵڵا هیچم ناوێ، پێیان بڵێ: کێ چاپیان دەکاتەوە، با چاپیان بکاتەوە، بە مەرجێك دەستکارییان نەکات، و هیچیان لێ نەگۆڕێت!

لێرەدا پێشنیازی ئەوە دەکەم لە کوردستاندا دەزگایەك بەناوی (دەزگای مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس) دابمەزرێنرێت، ئەرکی ئەوە بێت، سەرجەمی بەرهەمەکانی مامۆستا بە شێوەیەکی پوخت و ڕێك و پێك و زانستییانە چاپ بکاتەوە، و بە یەك ڕیز و دەور، و بەرگی قەشەنگ، و شیاوەوە، بخرێنەوە، کتێبخانەی کوردی، و بەردەستی خوێنەرانی گەلەکەمان.

**داستـــانـــی هیجری تـــــۆ، شەرحی بـــــە دەفتەر ناکرێ**
**پێت دەڵێم چۆنـــــە؟ ئـــەگەر چاوم بـــــە چاوت کـــــەوتەوە!**

"بسم الله الرحمن الرحيم"

الحمدلله الذي علم الإنسان مالم يعلم، والصلاة والسلام على الرسول الأكرم، محمد الهادى الى المنهج الأسلم، وعلى آله وصحبه وأتباعه المهتدين بهديه الأقوم.

و بعد: فهذه رسالة وجيزة في علم النحو، سميتها (مفتاح الآداب)، لِفتحها أبواب العلم بقواعد الإعراب، ورتبتها على مقدمات وخمسة أبواب، نرجوا بها الوصول إلى المأمول بتوفيق المعين الوهاب.

---

"بەناوی خوای گەورەو میهرەبان"

سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە مرۆڤی فێرە شتێك کرد، کە نەیدەزانی ،وە صەلاّت و سەلام لەسەر پێغەمبەری رێزدارموحەممەدﷺ، کە رێپیشاندەرە، بۆ رێبازی سەلامەتی، کە ئیسلامە، وە لەسەر شوێنکەوتوانی وهاوەڵانی و کەسوکاری ئەوانەی کە هیدایەتی بەهێزیان وەرگرت.

## ﴿پوختەیەك دەربارەی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحيم)﴾:

لە سەر کەسرەی پیتی"باء"زانای زمانزان سیبەوەیهی پێی وایە، لە بەر ئەوەی کەعەمەلی "باء" هەمیشە مەجرورکردنە، هەر لەم ڕووەوە بائەکە کەسرەی لە ژێردا دانراوە، تا لەگەڵ عەمەلەکەیدا هاوڕێك ببێتەوە، و زانای گەورە "مبرد"یش پێی وایە، کە کەسرەی بائەکە لەو ڕووەوەیەکە پیتی "باء"، لەو پیتانەیە کە بە "ذوات الياء" ناسراون، واتە: "باء" لە ئەسڵدا "بی" بووە، کە "ياء"حەزفکراوە، و دواتر کەسرەکە موناسەبەتی لە

گەڵ"یاء"دا هەیە، و گونجاوە لە گەڵیدا لە جێی یائەکەدا ماوەتەوە، بۆ مانای "باء" زانایان پێیان وایە، کە مانای "حەقیقی:ڕاستەقینە"ی"باء" بریتی یە لە (ألصاق:پێکەوە لکان)، بەڵام لێرەدا بە شێوەیەکی گشتی مەبەست مانا حەقیقی یەکەی نی یە، و دیسانەوە لە سەر مانا مەجازی یەکەیشی ڕاجیایی هەیە، هەندێ لە زانایان ڕایان وایە کە "باء" لە (بسم الله)دا، بۆ (أستغاثة:پشت پێ بەستن)ـە، وە یاخود بۆ (مصاحبة:هاوڕێیەتی و لەگەڵدابوون)ـە، و مەبەست لە (أستعانة) ئەوەیە کە ئەچێتە سەر ئالەتی فیعلەکە، وەك"کتبت بالقلم"، و مەبەست لە "باء"ی موصاحەبە ئەوەیە کە بە مانای "مع" دێت، وەك(و قد دخلوا بالکفر)أی: مع الکفر!

بەڵام ژمارەیەك لە زانایان مانای (أستعانة)یان لە پێشتر داناوە، چونکە (أستعانة: پشت پێ بەستن) زیاتر لێرەدا لەگەڵ ناوەکەی خوای پەروەردگار دا گونجاوترە، ومانایەکی پڕاوپڕوپڕ لە سودی هەیە، کەچی لە موصاحەبە کەدا ئەو مانا جوانەی لێ نافامرێتەوە.

وە هەندێکی تردەڵێن: چونکە مەبەست و مەرامی تەواو لێرەدا ، سوپاسی خواودەرخستنی بەندایەتی و پەرستنی ویی یە، و داواکردنی یارمەتی و ڕێنوێنی یە لەزاتی خوای پەروەردگار، بۆیە ئەم کارە گەورەیە کە لە چوارچێوەی (بسم الله الرحمن الرحیم)دا جێی بۆتەوە، پێویستە ئەو "باء"ـە، بۆ پشت پێ بەستنی ئەو زاتە بێت لەسەرجەم ئەو کارانەدا، وە لێرەدا پێویستە جەخت لەسەر ئەوە بکرێتەوە، کەئەوەی ڕابورد بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە "باء"لە "بسم الله"دا، بە مانای ئیبتیدایە.

## ﴿أســـم﴾:

لە لای بەصری یەکان "أسم" لە "سمو"ـەوە، وەرگیراوە، کە مانای "رفعة: بالآیەتی" هەیە، وە ئەسڵەکەی "یسمو"وە، چونکە جەمعەکەی "أسماء"ـە، وەك "قنو"و"أقناء"، وە ئیسمە بچوککراوەکە (مصغر)ـەکەی، "سمی"یە.

و لە لای کوفییەکان "أسم" لە "وسمة" وەرگیراوە، کە بە مانای "علامة" دێت، بەڵام گوتەی یەکەم ڕاستترە، چونکە وشەیەك کە (فاء الفعل)ـەکەی مەحزوف بێت، وە هەمزەی موتتەصیلی پێوە لکابێت، لە زمانی عەرەبیدا بەکار نەهاتووە، وەك (صلة)،(وصل)،(عدة)،(وعدة)، و بەڵگەیەکی تریش ئەوەیە کە هەر کات وەرگرتنەکەی لە (وسیم) یان،(سمة)ـەوە، هاتبێت، دەبێت هەر لە حاڵەتی تەصغیرەکەیشیدا هەر (وسیم) بە کار بێت، لە کاتێکدا کە لە عەرەبەوە بۆ تەصغیری (أسم)،(وسیم) نەبیستراوە، بەڵام بۆ تەصغیری (عدة)، (وعدة)، (وعیدة)، (صلة)، (وصل)، (وصیلة) بیستراوە.

## ﴿اللـــه﴾:

ئەم ناوە پیرۆزە لە ئەسڵدا (ألاِله)بووە،کە هەمزەی دووەمی لەئەنجامی زۆر دووبارە بونەوەیدا حەزف کراوە، کە مانا ڕەسەنەکەی پەرستن وسەرسامی (متحیر)بوونە، وە لەو ڕووەوە ماناکەی لێك دراوەتەوە، کە بەس خوای گەورە شایەنی پەرستنە، وە عەقڵ وهزر و لۆژیکی مرۆڤەکان لە ئاستانەی ئەو زاتەدا سەرسامن!

هەندێ لە زانایان ئەم ناوە بە عەلەم دادەنێن، بۆ خودای "واجب الوجود"کە کۆکەرەوەی سەرجەم صیفاتەکانی کامڵێتی یە، ولە پیاوچاکانەوە بیستراوە کە فەرمویانە: (ألله): ناوی هەرە گەورەی خودایە،

چونکە بەڵگەیە لە سەر تەواوی ناوە جوانەکان، و صیفاتە باڵاکانی پەروەردگار، بەڵام ناوەکانی تر هەر یەکەیان ئاماژە بە لایەنێك، و پلەیەك لە پلەکانی خوای باڵا دەست دەکەن.

وە هەندێکی تر لە زانایان پێیان وایە، کە ئەم لەفزە هەمیشە مەوصوفە، و هەرگیز نابێتە (صفة)، وئەم مانایەش بەڵگەیە لەسەر عەلەم بوون،واتە:ئەمە لەو بەڵگانەیە کە ئاماژە بە عەلەمبوونی ناوی (ألله)دەکەن.

وە سەرجەم ناوەکانی تری خوای پەروەردگار دەکرێت کە ببنە صیفەت، چونکە هەر یەکەیان باس لەلایەنێکی دیاریکراوی خوای گەورە دەکەن،بەڵام ناتوانرێ کە (ألله)بە صیفەت دابنرێت، بۆیە بۆ نموونە دروستە بڵێین (ألله العالم): بەڵام ناتوانرێ کە بگوترێ: (ألعالم ألله).

﴿الرحمن الرحیم﴾:

زانایان لە سەر جیاوازی نێوان ئەو دوو ناوە، ڕاجیاییەکی زۆریان هەیە، گوتەی دروست لەسەر ئەوەیە کە (الرحمن)، لە(الرحمة)ـەوە، ، وەرگیراوە، کە لە زماندا بە مانای"ناسکی دڵ و بە عاتیفە بوون"یەوە هاتووە، بە دەستەواژەیەکی تر (الرحمة): واتە: میهرەبانیەك کە فەزڵ و چاکە کاری لە گەڵدایە، وە خاوەنی (الکشاف): گوتویەتی(الرحمن)، لە زمانی عیبری یەکانە و (الرحیم)، لە زمانی عارەبە، و کافرەکانی قورەیش لە سەردەمی نەفامیدا ناوی (الرحمن)یان نەدەزانی، هەر وەك لە کرۆکی ( و ما الرحمن) و (یکفرون بالرحمن)یەوە دەفامرێتەوە.

وە هەندێکیش لەسەر ئەوەن کە لەفزی (الرحمن)عەرەبی یە، بەڵام لە تەوراتدا باس کراوە، وە گێڕدراوەتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام پرسیاری لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کرد، گوتی:ئەی پێغەمبەری خوا(صلی

الله عليه وسلم)، ئێمە ناوی ڕەحمانمان لەتەوراتدا زۆر خوێندۆتەوە، بەلاّم لە قورئاندا کەمتر هاتووە، ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو:

﴿قُلْ ادْعُوا اللَّهَ أَوْ ادْعُوا الرَّحْمَانَ أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً(الاسراء :١١٠)﴾ پێیان بلّێ: لەنزاو دۆعاکانتاندا ئەگەر ناوی پیرۆزی (الله) بەرن، و یان هاوار بە هەر یەکێ لە سیفەتە پیرۆزەکانی ئەو بکەن، بۆ نموونە: وەك (الرحمن) هەر یەکە، و قەبوولّە، جا ئێوەش بە هەر ناوو سیفەتێکەوە، لەو ناوو سیفەتانە بۆخۆی دیارییکردوون، دەتوانن داوای لێ بکەن و هاواری بۆ بەرن ، چونکە ناوی پیرۆزی خوا زۆرن، ئەم دوانەیش: (الله، الرحمن) هەر لەوانن، لە کاتی خوێندنی قورئاندا بە تایبەت لە نوێژەکانتدا دەنگ بەرز مەکەرەوە، و مەقیرێنە تا قورەیش نەبیستن و جنێو نەدەن بە دینەکەت، زۆریش هێواش و نزمی مەکە، بەڵکو لە سەرخۆ بە، و بە شێوەیەك بیخوێنە کە ئەوانە لە پشتەوەن گوێیان لێبێت، لە نێوان ئەو دوو حالّەتەدا ڕێگایەکی مامناوەندیی و لەبار بۆ خۆت ڕەچاو بکە(١١٠)﴾، واتە:ئیتر بەناوی(ألله)وە بخوێنن، یان بەناوی (الرحمن)ـەوە، ئەم دوو ناوە هەردوکیان تایبەتن بە خودا.

و کەسانێکیش گوتویانە کە(رحمن)صیغەی موبالەغەیە،وبەڵگەیە لەسەر زۆری وفراوانی، وە لەپیاو چاکێکیشەوە گێڕدراوەتەوە کە فەرمویەتی: "الرحمن": ناوێکی تایبەتە بۆصیفەتێکی گشتی، واتە،(الرحمن):ناوێکە کەبەکار هێنانی بۆ غەیری خوای پەروەردگار نابێت، چونکە تیایدا میهرەبانیی وڕەحمەت بۆ سەرجەم بونەوەر دەفامرێتەوە، و صیفەت گەلێکی وا پڕ ماناى لەخۆگرتوە، کە تەنها بۆ زاتی پەروەردگار دەبن.

وە(الرحيم): ناوێکە کە لەفزەکەی گشتی یە، بەڵام ماناکەی تایبەتە ،واتە: ناوێکە کەبەکارهێنانی بۆ غەیری خوای پەروەردگار دروستە، چونکە بەڵگەیە لە سەر صیفەتێك کەبەسنورداری لە هەندێ بەندەو دروستکراودا هەیە، بەڵام بە مانا فراوانەکەی کە ئەوپەڕی میهرەبانی نواندنە، تایبەتە تەنها بە زاتی پەروەردگارەوە.

*** ئیعرابی ( بسم الله الرحمن الرحيم ):**

ب : حەرفی جەڕ.

اسم : أسم مجرور ، جارومجرور موتەعەللیقە بە عاملێکی مقدرە ، (شاراوە) وە، کە (ابتدا)یە, وهو مضاف.

الله: مضاف اليه، و ( اسم علم ) يشه

الرحمن الرحيم : صیغەی مبالغەن، لەسەر قەولی ( أصح ) ی زانایانی (نحو) وە ( صیغەی مشبهـ )ـەن و مەجرورن.

* ئایا دروستە دوو ( صفة ) لە شوێن یەکتری بێن؟

ــ بەڵێ دروستە: وەك چۆن دوو خەبەر و دوو حال لە شوێنی یەك دێن.

**وە لەسەر ئیعرابی (الرحمن الرحيم)، چەند ڕایەك هەیە:**

أ:هەردوکیان مەرفوعن، کە لەم شێوازەدا دەبنە خەبەر، بۆ موبتەدایەکی مەحزوف، وەك: (هو الرحمن، و هو الرحيم).

ب:هەردوکیان مەنصوبن، کە لەم کاتەدا مەفعولن، بۆ فیعلێکی مەحزوف وەك: (أعني الرحمن، و أعني الرحيم).

ج: هەردووكیان مەجرورن، كە لەم شێوازەشیاندا، دەبنە صیفەت بۆ(ألله)، كە مەوصوفەكەیە.

پاشان: ئەمە پەیامێكی كورتە، لە زانستی نەحودا، وە ناوم نایە، (مفتاح الآداب) بۆ ئەوەی كە دەرگاكەرەوەی ئەو زانستە بێت، كە لەخۆگری یاساكانی ئیعرابە، و تەرتیبم كرد، لەسەر چەند پێشەكیەك و پێنج باب، و لە خوا ی گەورە دا واكارین، كە بگەین، بەمەبەستەكانمان، بە پشتیوانی پەروەردگاری یارمەتیدەرو بەخشەر.

## ﴿أما بعد﴾:

أما بعد: لەئەسڵدا لە سەر شێوازی"مهمایك من شیء فبعد الحمد والصلوة" بووە، كە هائەكە كراوەتە هەمزە، چونكە، (هاء)و(همزة)مەخرەجەكانیان لە یەكترەوە نزیكن، وە هەمزەیان لە سەرەتادا دانا، و میمەكە لە میمەكەی تر ئیدغام كرا، و بوویە"أما"، وە لە بەر ئەوەی كە "أما" لە حەرفەكانی شەرتە، و پێویستی بە دوو جوملە هەیە، كە جوملەی یەكەم بە شەرتیة، و دووەم بە جەزائیة ناوزەد دەكرێن، بەلأم شەرتی "أما" لە سەر شێوازێك لە شێوازەكانی حەزف لێرەدا حەزفكراوە، و بۆیە"یكن من شیء"حەزف كرا، و بوویە(أما فبعد): جا"بعد"، ظەرفە، و لەئیسمە"دائم الاضافة" كانە، وە لێرەشدا"الحمد والصلوة"موضاف ألیە،یە بۆی، وە ئەمیش لە بەر ئەوەی كە لە سەرەتای"خطبة الحاجة"كەدا، هێنای لێرەدا حەزفی كرد، جا كە موضاف ألیە،یەكەی حەزف بوو، بوویە "مبنی علی الضم"، وە بە "أما بعد" دەرچوو، وە لە بەر ئەوەی كە چوونە سەری حەرفی شەرت بۆ سەر فائی جەزائیە قەدەغەیە، وە دەبێت لە نێوان "أما"و"فاء"دا، یەكێك لەو شەش شتەی كە ئێستا باسیان دەكرێت هەبێت، و نێوانیان بخات، بۆیە ئەویشیان حەزف كرد، و دەرەنجام، "أما بعد": دەرچوو.

المقدمة الأولى: النحو: أصول وقواعد تعرف بها أحوال أواخر الكلمة من حيث البناء والإعراب، وموضوعه، أی الأمر الذي يبحث عنه في النحو، الكلمة والكلام.

و فائدته: حفظ اللسان عن الخطأ حسب الآداب.

واللفظ: صوت يعتمد على مقطع من مقاطع الفم، فأن لم يدل على معنى فمهمل، كديز، وإلاّ فموضوعٌ، كزيدٍ.

---

پێشەکی یەکەم: نەحو: چەند بنەماو یاسایەکە بەهۆیانەوە، چونیەتی کۆتایی کەلیمە یان پێ دەناسرێت، لەڕووی (أعراب و بناء)ـەوە.

وە باسەکەی واتە: ئەو بابەتەی کە نەحو باسی لێوە دەکات (کلمة، وکلام)ـە، و سوودەکەی پاراستنی زمانە لە هەڵە بە گوێرەی ئەو یاسایانە.

وە (اللفظ): بریتی‌یە لە و دەنگەی کە لەیەکێك لەبەشەکانی دەمەوە دەردەچێت، و ەدەم تیایدا کاریگەرە، ئەگەر ئەو لەفظە بێ مانا بوو، ئەوا موهمەلە، وەك (دیز) کە موهمەل و بێ مانایە، و ئەگەر خاوەن مانابوو، ئەوە، مەوضوعە، وەك (زید) کە خاوەن مانایە، و بۆ واتایەك دانراوە.

**پێناسەی زانستی ﴿نەحو﴾:**

**نەحو: بریتی یە لە پەیدا کردنی شارەزایی لە یاساو ڕێسا گشتی یەکاندا ، وەك ئەوەی کە بزانرێت هەموو، فاعیلێك مرفوعە و هەموو مفعولێك منصوبە و هەموو مضافێك مجرورە، کە بە هۆی ئەو یاساوڕێسایانەوە چۆنیەتی کۆتایی (أسم و فعل و حرف ) مان بۆ دیاری دەکرێت، و پێمان دەناسرێن.**

و کيفية ترکيب بعضها مع بعض – **هەروەها چۆنیەتی ڕیز کردنی ووشەشمان بۆ ڕون دەبێتەوە.**

بۆ نموونە:

كە ( جاء ) فیعلە ، كە خرایە پاڵ ( زید)، كە أسمە ( جاء زید ) مان بۆ دروست دەبێت، كە ئەمەش ڕستەیەكی كرداریە.

وە كە ( زید ) خرایە پاڵ ( في الدار ) ( زید في الدار ) دروست دەبێت ، كە ڕستەیەكی ناویە.

## ﴿ووشـــــەی نـەحـــو﴾:

**لەزمانەوانیدا نەحو، بۆ شەش مانا بەكار دەهێنرێت:**

أ.بەمانای، (مثل: وەك)، نموونە:"جائني صبي نحوك"، واتە:مثلك.

ب. بەمانای ئاڕاستە، وەك:"ذهبت نحو البیت"واتە:جهة البیت.

ج. بەمانای مەبەست، (قصد)، وەك"نحوت نحو زید"، واتە: قصد زید.

د. بەمانای جۆر(نوع)، وەك"هذا الشيء على أربعة أنحاء"واتە:أربعة أنواع.

هـ. بەمانای ئەندازە گیری،(مقدار)، وەك:"أخذت نحو ألف"واتە: مقدار ألف.

و. بەمانای جێگا(موضع)، وەك:"قصدت نحو زید"، واتە: موضع زید.

## ﴿پوختەیەك دەربارەی پێناسە"تعریف"ی، دروست وتەواو﴾:

ئەوە پێناسەی نەحو بوو، جا ئەوە بزانە كە پێناسە دەبێت بە جۆرێك بخرێتە ڕوو، كە"جامع" و "مانع"بێت، واتە: كۆكەرەوەی سەرجەم تاكەكانی ئەو پێناسەیە بێت، وە لە هەمان كاتدا "مانع:جڵەوگیر"بێت،

لەوەی کە ئەو شتانە بکاتە دەرەوە کە لە بازنەی ئەو پێناسەیەدا جێگایان نابێتەوە، بە دەستەواژەیەکی تر لە کاتێکدا کە کەسێك بیەوێت، پێناسەی زانستێك بکات، دەبێت بە جۆرێك بێت، کە تەواوی بابەت، و ئەفرادەکانی ئەو زانستە بگرێتەوە، ئەوە سەرجەم ئەو شتانەی کە لە دەرەوەی بازنەی ئەو زانستەدان بیانکاتە دەرەوە، بۆ نموونە: لە کاتێکدا کە دەڵێین: "ألانسان حیوان"، بە هێنانی" قید:پەیوەستە"ی "حیوان" سەرجەم تاکەکانی "حیوان" لەم پێناسەیەدا جێگایان دەبێتەوە، وە بە باسکردنی "قید:پەیوەستە"ی "ناطق" سەرجەم تاکەکانی تر دەردەکرێن، و تەنها مرۆڤ لە چوارچێوەی پێناسەکەدا دەمێنێتەوە، جا کە دەوترێت:"النحو علم" کە بەم "قید:پەیوەستە"یە بێت، سەرجەم زانستەکان دەگرێتەوە، بەڵام بە "قید:پەیوەستە"ی "أصول" ئەو ڕێسایانەی کەیاسایی نین، و چوارچێوەیەکی تایبەتیان نی یە، دەچنە دەرەوە، وە کە وترا"أعرابا، و بناءا"، زانستی صەرفیشی لێ دەچێتە دەرەوە، وە لە پێناسەکەدا جێگای نابێتەوە، چونکە لە زانستی صەرفدا باس لە ڕێسا گەلێك دەکرێت، کە "وَزْن" و "صیغة"ی ووشەکان ڕوون دەکاتەوە، وە بەگوێرەی شێواز و هەیئەتی هەر صیغەیەك تایبەتمەندی ماناکانیشی دەردەکەون.

<u>سودی زانستی نەحو:</u> سودی دراسە کردن و خوێندنی ئەم عیلمە ، ئەوەیە کە زمانمان بپارێزین لە هەڵە، لە کاتێکدا کە بە عەرەبی دەدوێین، و گرنگتر لەمە لەبەر ئەوەیە کە عەرەبی زمانی قورئانی پیرۆز و پێغەمبەرﷺو چاکانە، لە بەر ئەوە ئەگەر کەسێك ( فعل و فاعل و مفعول) بزانێت ڕێك

بخات و ئیعرابیان بکات ئیتر ناکەوێتە ناو ئەم جۆرە هەڵانەوە، و فاعیل بە مەرفوعی، و مەفعول بە مەنصوبی دەخوێنێتەوە.

وەك ڕستەی ( ضرب زید ) هیچ کات ( زید ) لەو شوێنە دا بە منصوبی ناخوێنرێتەوە، بەڵکو مضمومی بو دادەنێت، چونکە دەزانرێت کە فاعلە و پێویستە مرفوع بێت.

**تێبینی:**

زۆر لە تامەزرۆیانی ئەم زانستە، دەڵێن ئێمە هەموو یاساو ڕێساکانی (نحو) دەزانین، کەچی لە کاتی قسەکردندا هەڵەمان هەیە.

لە وەڵامدا دەڵێین :

چونکە لە کاتی قسە کردندا ، گوێ بە سابت کردنی قاعدە نحوی یەکان نادات ، و بۆیە دەکەوینە هەڵەوە.

وموضوعە الکلمة و الکلام — هەر زانستەی باس لە شتێك دەکات ، باسی نەحوش ( کلمة و کلام )ـە، بۆیە لە سەرەتای کتێبەکەوە ، تاکۆتایی ( فعل ، فاعل ، مفعول ، جملە، مفرد، مبتدا ، خبر ، حال ، صفە ، تمیز )، ئەمانە باس دەکرێت ، وە ئەمانەش یان ( کلمة ) یان ( کلام ) ن.

هەندێ دەڵێن باسی ئەم عیلمە ( ألفاظ عرب )ـە ، ئەمەش هەر هەمان قسەیە چونکە ، ( الفاظ عرب ) یش، یان ( کلمة)، یان (کەلام)ن!

**المقدمة الثانية: الكلمة: لفظ موضوع لمعنى مفرد، وأقسامها ثلاثة، أسم و فعل و حرف، فالِأسم: ما دَلَّ على معنى بنفسه، (أي: بدون الِأحتياج إِلى كلمة أخرى، تذكر معه)، غير مقترن بأحد الأزمنة الثلاثة، كزيدٍ، و علم، و عالم، و علامته قبول الجرّ و التنوين ولام التعريف، نحو: الكتاب في يد أمين، و إِسناد شيىءٍ إِليه، نحو: زيد فاضلٌ.**

---

پێشەکی دووەم:

پێناسەی کەلیمە: بریتی یە لەو لەفزەی کە لەدەمەوە دێتە دەرێ، وە دانراوە، بۆ مانایەکی موفرەدی غەیرە مورەککەب.

**کەلیمە سێ بەشە:**

(الأِسم): ئەوەیە کە لەخودی خۆیدا واتایەك دەگەیەنێت.. واتە پێویستی بە کە لیمە یەکی تر نی یە، کە لەگەڵیدا باس بکرێت، وە ماناکەی پەیوەست نی یە، بەیەکێك لەکاتەکانەوە، وەك (زید ، علم، عالم) کە (زید) لەفزێکە لەدەم دێتە دەرێ وە دانراوە بۆ مانایەك، و مورەککەب نی یە، وەك (خمسة عشر) لەفزێکە لەدەم دێتە دەرێ، وە دانراوە بۆمانایەك، و مورەککەب نی یە، وەك (خمسة عشر) وە پەیوەست نی یە بەکاتەوە.

وە نیشانەکانی ئیسم ئەوەیە، کە (جرّ ، تنوین) ئەلف و لامی تەعریف، وەردەگرێت، وەك (الکتاب في يد أمين) کە (کتاب) ئەلف و لامی لەسەرە،و(يد) جەڕی چووەتە سەر، (أمين) تەنوینی کەسرەی وەرگرتووە، وە ناوەکە ئیسنادی دەدرێتە پاڵ وەك (زید فاضلٌ) کە (زەید) موبتەدایە، و (فاضلٌ)، خەبەرە، کە فەزڵ وڕێزداری ئیسناد دراوەتەوە لای (زید)ودراوەتە پاڵی.

**والفعل: ما دَلَّ على معنى بنفسه مقترناً بأحدها، وهو فعل ماضي، كضرب، ومضارع كيضرب، وأمر كأضرب، وعلامة الماضي لحوق تاء التأنيث الساكنة به، نحو: كتبت، وعلامة المضارع دخول السين، وسوف ولم ولمّا، نحو: سأجتهدُ، وسوف أنجح، ولم أكسل عن أداء واجبي، ولما أدرك مطلوبي، وعلامة الأمر، فهم الطلب منه، وقبول ياء المخاطبة، نحو: أكرمي أمّك، واحفظي دينك.**

---

وە فيعل: ئەوەيە، كە دەلالەت بكاتە سەر مانايەك و پەيوەست بێت، بەكاتێكەوە، كە يان (ماضى)يە، وەك (ضَرَب) يان موضاريعە وەك (يضرب) يان ئەمرە، وەك (أضرِب) وە نيشانەى فيعلى ماضى، ئەوەيە كە (تاء التأنيث الساكنة)ى دەچێتە سەر، وەك (كتبت) وە نيشانەى موضاريع ئەوەيە كە (سين) ى دەچێتە سەر وەك (سأجتهد)، و( سوف) ى دەچێتە سەر وەك (سوف أنجح) و (لم)ى، دەچێتە سەر وەك (لم أكسل من أداء واجبي) و( لمّا)ى دەچێتە سەر وەك (لما أدرك مطلوبى).

وە نيشانەى فيعلى (ئەمر)، ئەوەيە كە داخوازى و داواكارى لێوە تێدەگەين، وە (ياء مخاطب)ـى، دەچێتە سەر، وەك (أكرمى أمّك واحفظى دينك). ئيبن ماليك دەڵێت:

بِتَا فَعَلْتَ وَأَتَتْ وَيَا افْعَلِي    وَنُونِ أَقْبِلَنَّ فِعْلٌ يَنْجَلِي

١- قبوله التاء المتحركة ، نحو : ذَهَبْتِ.

٢- قبوله تاء التأنيث الساكنة ، نحو : ذَهَبَتْ ، ونِعْمَتْ ، وبِئْسَتْ .

٣- قبوله ياء المخاطبة ( ياء الفاعلة )، نحو : اضْرِبي ، وتَضْرِبِينَ .

٤- قبوله نون التوكيد الثقيلة ، والخفيفة . فالثقيلة ، نحو قوله تعالى : ﴿لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ﴾.

والخفيفة ، نحو : اذهبَنْ ، وكما في قوله تعالى : ﴿لَنَسْفَعًا بِٱلنَّاصِيَةِ﴾ .

ولم تظهر النون في ﴿لَنَسْفَعًا﴾ لأن الألف فيها بدل من نون التوكيد ، كما في قوله تعالى :

﴿وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ﴾.

**والحرف: ما دَلَّ على معنى بغيرها، نحو: قد حان وقت العمل، وعلامتها عدم قبول شيئٍ من علامات أختيها.**

**والكلام، هو اللفظ المركب المفيد فائدة، يحسن السكوت عليها المقصود لذاته، نحو: (الله خالق كلّ شيء)الرعد.١٦، وميّزالله الأنسان بالعقل.**

**والكلم: ما تركب من ثلاث كلمات، نحو: قد قام خالد.**

**والجملة: هي المركبة من كلمتين مفيدة، نحو: قد قام، أو لا، نحو: إن قامُ.**

---

وە حەرف ئەوەیە، کە بە پالّپشتی غەیری خۆی واتادار دەبێت، وە ك(قد حان وقت العلم) کە (قد) حەرفە وە نیشانەی حەرف ئەوەیە، کە تایبەتمەندیەکانی ئیسم و فیعل وەرناگرێ.

(الكلام): ئەولەفزەیە کە (مرکب)ە و موفرەد نی یە، وە بەسوودە، و بێدەنگی دەبەخشێت، وە (المقصود لذاته) بێت، واتە: موتەکەللیم بە مەبەستی خۆی دەری برێ و قسەی (نائم: خەوتو)، (ساهی: هەلّەکەر)نەبێت. وەك:

(الله خالق كلّ شئ) کە خوا فەرموویەتی: و لەفزە و مورەککەبەو بەسودە، و کەس قسە ناکات، بەبیستنی ئەو کەلامە، و بێدەنگی دەبەخشێ و قسەی (العیاذ بالله) (نائم: خەوتو)، یان(ساهی: هەلّەکەر) نی یە، وە (کلم) ئەوەیە، کە لەدوو کەلیمەی مورەککەبی بەسود پێکهاتبێ، وەك:( قد قام)، یان بێ سودبێت، وەك: (أن قام).

*** کەلیمە سێ بەشە: ئیسم، فیعل، حەرف:**

**أما "تَعْمَلْ" و"تُعْمَلْ" أو "تَعْمَلَ" و"لا تُعْمَلْ" أو "تُعْمَلَ" و"لا تَعْمَلْ" أو "لا تَعْمَلْ" و"لا تُعْمَلْ".**

**١-"تَعْمَلْ وتُعْمَلْ": کەلیمە عامیلیش دەبێت و دەبێتە "مەعمول"یش، وەك فیعلی موضاریعی "یضرب" کە عاملیش دەبێت، وە دەشبێتە "مەعمول" بە هۆی حورووفی جازیمە و ناصیبەوە، وە یان، وەك "اسم فاعل واسم**

مفعول" کە دەبنە "فاعل و نائب فاعل"، وە هەروەها بە هۆی حەرفی جەڕ، و عەوامیلی ناصیبەوە دەبنە "مەعمول".

٢- "تَعْمَلْ ولا تُعْمَلْ": هەندێ جار کەلیمە عەمەل دەکات، کەچی نابێتە "مەعمول"، وەك حورووفی ناصیبەی "أن، لن ، کی، إذن"، وە حورووفی جازیمەی وەك: "لم ،لما، لام الامر، لاء النهی، أن شرطیة" کە ئەمانە عەمەل دەکەن و نابنە مەعمول، وەك: "أن یضرب". کە "أن" ،"یضرب"ی مەنصوب کردووە، کەچی خۆی ناکرێتە مەعمولی شتی تر.

٣- "تُعْمَلْ ولا تَعْمَلْ": هەندێ کەلیمە دەبنە مەعمول، کەچی نابنە عامیل، ئەمانەش وەك ئەسمائی موتەمەککینەی جامیدە، وەك "زید، عمرو، تقی، حسن" ئەمانە کە دەبنە مەعمول کەچی عەمەل ناکەن.

٤-"لا تَعْمَلْ ولا تُعْمَلْ": هەندێك کەلیمە نە دەبنە عامیل، نە دەبنە مەعمول، وەك: حورووفی عەطف، وەك: "واو، ثم، لکن،(الـ)ی، تعریف "وەك (الرجل)و حورووفی ئیستیفهامی، وەك: (أ، هل) کە نە دەبنە مەعمول ونە دەبنە عامیل.

## ﴿هۆی حەصر کردنی کەلیمە لەسێ بەشدا﴾:

هۆی حەصر کردنی کەلیمە لە سێ بەشدا، لە ڕووی هێنانی "بەڵگە:دلیل"ـەوەیە، کە ئەوانیش"الدلیل النقلی"،" الدلیل ألاستقرائی"، "الدلیل العقلی"ین.

١-"الدلیل النقلی": پێشەوا عەلی کوڕی ئەبوتالیب کە خۆی دانەری سەرەتای زانستی نەحوە، دەگێڕنەوە کە بە"ئەبولئەسوەدی دوئلی" گوتوە: کەلیمە سێ بەشە: "ئیسم،فیعل،حەرف".

٢-" الدلیل ألاستقرائی": زانایان و زمانزانانی تایبەت بەم زانستە هەرچی لەهجەکان وجێگا جۆراوجۆرەکانیان پشکاندووە، لەم سێ جۆرە زیاتریان نەدیوە، و نەدۆزیوەتەوە.

٣-" الدلیل العقلی":بەهۆی ئەوەوە کە کەلیمە یان دەلالەت ناکاتە سەر مانایەکی سەربەخۆ، کە ئەویش حەرفە، یان دەلالەت دەکاتە سەر مانایەکی سەربەخۆ، بەڵام

پەیوەست نی یە، بە یەکێك لە سێ کاتەکەوە "ماضی، مضارع، مستقبل" ، کە ئەمەشیان ئیسمە.
وە بە دەستەواژەیەکی تر ئیسم کەلیمەیەکە کەماناکەی لەمەدلولەکەیدا سەربەخۆیە و دیارە، وە"زمان: کات"، بەشی مانا و مەفهومی ئیسمی پێوە نی یە، وەك:"رجل، کاتب"، بۆیە ئەو وشانەی کە بۆ یەکێك لە کاتەکانن، بەڵام سەرجەمی ووشەکە بۆ سەر تاپای کاتێکە، وەك:"أمس،ألان،غدا"، دەگرێتە خۆ، وە هەروەها ئەو ووشانەی کە پەیوەستن، بە یەکێك لەکاتەکانەوە، بە"عرضا"نەك"وضعا"،وەك: "أسماء الافعال"، "أسم فاعل"،"أسم مفعول" ... و هتد.. ئەمانیش لە پێناسەی ئیسمدا جێگایان دەبێتەوە، سەرەنجام لە پێناسەی ئیسمدا فیعل بەگشتی دەچێتە دەرەوە، هەر چەندە لە مانای پەیوەست بوون بە کاتەوە داڕندرابێت، وەك: "نعم" و" بئس"ـەوە، چونکە ئەم فیعلانەی مەدح، و زەم لە ڕووی "وضع:دانان"ـەوە، پەیوەستن بە کاتەوە.

## ﴿تایبەتمەندییەکانی ئیسم﴾:

ئیسم خاوەنی چەند تایبەتمەندیەکە،کە ئەوتایبەتمەندیانە لە غەیری ئیسمدا بەکارنایەن:

١-یەکەم تایبەتمەندی ئیسم "جر"ە،واتە: ئیسم مەجرور دەبێت،وە پێویستە ئەوەش بزانرێت، کە خودی جەڕ سێ بەشە:

أ: مەجروربوون بە حەرفی "باء"، مەجروربوون بە هۆی ئیضافە کردنی تائەوە، مەجروربوون بە هۆی "شوێن کەوتن:متابعة".وەك"بسم الله الرحمن الرحيم"، کە "أسم" تیایدا مەجروربووە، بە هۆی حەرفی "باء"ەوە،وە" الله" تیایدا کە لەفزی جەلالـەیە، مەجرور بووە بە هۆی ئیضافەوە،وە " الرحمن الرحيم"یش، مەجروربووە بە هۆی "شوێن کەوتن:متابعة"ـەوە.

٢-یەکێکی ترلە تایبەتمەندی یەکانی ئیسم ئەوەیە کە دەبێتە موناداد: وەك: "یازید"،"یاعبدالله".

٣- ئەلف ولام"أل":کەمەبەست پێی ئەلف ولامی تەعریفە،وەك:"الرجل".

٤- یەکێکی ترلە تایبەتمەندی یەکانی ئیسم تەنوینە، وئەمیش چوار جۆرە:

أ:"تنوین التمکن":ئەوەیە کەدەچێتە سەر ئیسمی مونصەریف.

ب: "تنوین التنکیر":کەتایبەتە بە ئیسمی مەبنی یەوە،وە دەلالەت کەئەو شتەی کە ئەم چوەتە سەری"مدخول"ەکەی،نادیار"غیرمعین"ەو نەکیرەیە،وەك:"مهٍ،صهٍ".

ج: "تنوین العوض":کە ئەمیش سێ جۆرە:

*" عوض عن أسم محذوف":هاتنی لە جیاتی ناوێکی حەزف کراو،

"و سخر الشمس والقمر کل یجری ألی أجل مسمی"،واتە:" کل واحد منهما"،

کەلەم نمونەیەدا لەفزی" کل"لە گەڵ تەنوینی ڕەفعەدا هێنراوە،بۆیە"بدل"ە،لەجیاتی "واحد منهما"، کە ئیسمێکی مەحزوفە.

*" عوض عن الجملة": هاتنی لە جیاتی ڕستەیەك:وەك تەنوینی"حینئذ"،

لە نمونەی "وأنتم حینئذ تنظرون"،واتە:"حین أذا بلغت الروح الحلقوم"بووە.

*" عوض عن حرف محذوف": بەهاتنی لە جیاتی حەرفێکی حەزف کراو،

وەك"جوار"،کەلەئەصڵدا

" جواری"بووە.کە یائەکەی حەزف کراوە،وەلێرەدا تەنوینەکە جێنشینی حەرفە حەزف کراوەکەیە.

د: "تنوین المقابلة":کە دەچێتە سەر جەمعێك کە"أت"ی، پێوە بێت.

وەك:"مسلمات".

٥- یەکێکی ترلە تایبەتمەندی یەکانی ئیسم موسەننا بوون وجەمع بوونە،

وەك:"الزیدان"،"الرجلان"، " الزیدون"،"الرجال".

* * * * * *

وهي "أي: الجملة"، إمّا أسمية، إن كان صدرها أسماً، نحو: زيد عالم، أو فعلية، أن كان صدرها فعلاً، نحو: قام بكر، أو ظرفية، إن كان صدرها ظرفاً، نحو: في المدرسة المدرّس.

المقدمة الثالثة: المعرب: ما أختلف آخره، بأختلاف العوامل لفظاً، نحو: جاء بكرٌ، و رأيت بكراً، ومررتُ ببكرٍ، أو تقديراً، نحو: جاء الفتى، ورأيت الفتى، ونظرتُ ألى الفتى، فإن آخر الفتى ألفٌ، وهو لا يقبل الحركة، فتقدر وتفرض عليه.

---

وه بزانه، رِسته، یان ئیسمییەیە، وەك (زید عالم) چونكه به (أسم) دەستی پێ كردووه، وه یان فیعلی یه، وەك (قام بكر) چونكه به فیعل دەستی پێ كردووه، وه یان (ظرفیه)یه وەك: (في المدرسة المدرّس)،چونكه به (ظرف) دەستی پێ كردووه.

پێشەكی سێیەم: (معرب) ئەوەیە، كه كۆتاییەكەی لەڕووی لەفزه وه دەگۆڕێت له كاتی چوونه سەر عەوامیلەكاندا، وەك (جاء بكر) كه (بكر) مه ضمومه، و (رأیت بكراً)كه (بكراً) مەنصوبە، وه (مررتُ ببكر) كه (بكرٍ) مەجرورە.

یاخود له (تقدیر)دا، دەگۆڕێ، وەك (جاء فتی) كەله تەقدیردا مەنصوبە، وه (نظرتُ ألی الفتی). كه (فتی)له تەقدیردا مەجرورە.

<u>كه لەم سێ نمونەیەدا:</u>

كۆتایی (فتی) ئەلفە، و حەرەكه وەرناگرێ، بەڵكو تەقدیر دەكرێ، كه مەڕفوعە، یان مەنصوبە، یان مەجرورە، و بەسەریدا دەسەپێنرێ، كه ئەوەیە.

والمبني: ما لـم يختلف آخره، بأختلافها، لا لفظاً، ولا تقديراً، بل محلاً، نحو: جائني هؤلاء، ورأيت هؤلاء، ونظرتُ إِلى هؤلاء، فإِنَّه لا مانع عن الِأعراب، في آخره أعني الهمزه، بل في نفس الكلمة، لأنا ما سمعنا من العرب، من يغير هذا اللفظ، عند إِختلاف العوامل، فعلمنا أنه لا يقبل الِأعراب، فنحكم بأن إِعرابه محلي، أي، إِنه لو وضع في محل هذا اللفظ لفظ قابل للِأعراب كزيد، إِختلف آخره.

---

(مبنى) ئەوەیە، کە نە لە (لفظ)، و نە لە (تقدير)دا، ناتوانرێ کۆتاییەکەی بگۆڕدرێ، بەڵکوو لە مەحەلدا، بۆی دادەنرێ، وەك:

(جائنى هؤلاء، ورأيت هؤلاء ونظرت الى هؤلاء).

کە لەهەرسێ حاڵەتی ڕەفع و نەصب و جەڕدا، یەك جۆرە.

بۆیە مەبنی یە، وە لەکۆتایی (هؤلاء)دا کە (همزة)یە، و هەمزە نی یە کە بوویێتە هۆی مەنع کردنی ئیعرابەکەی، بەڵکو نەفسی کەلیمەکە ئیعراب وەرناگرێ، چونکە ئێمە، لە عەرەبەوە، ئەو لەفزە مان نەبیستووە، کە بگۆڕدرێ، لەکاتی چوونەسەری عەوامیلەکاندا، بۆیە زانیمان کە ئیعراب وەرناگرێ، بۆیە حوکمی ئیعرابی (محلى) بەسەردا دەدەین، واتە: ئەگەر لە جێی ئەو لەفزە ، لەفزێکی موعرەب دابنێین، وەك (زيد)، بە چونەسەری عەوامیلەکانی دەگۆڕێ.

فالِأسم منه معرب، كزيد و عمرو، ومنه مبني كهذا، وهؤلاء، وكذلك الفعل، فإن الفعل الماضي، والأمر مبنيان، وأما المضارع فمعربٌ، إلاّ إذا، اتّصل به نون جمع المؤنث، فيبنى على السكون، نحو: يكتبن وتكتبن، أو نون التأكيد المباشر، نحو: إضربن، ولا تضربن، فيبنى على الفتح، و أمّا الحروف، فكلّها مبنيّة، إمّا على السكون، كقد، أو على الفتح كأنَّ، أو على الضّم، كمُنذُ، أو على الكسر، كجيرٍ، بمعنى نَعَمْ.

---

ئیسم هەندێکی موعرەبە، وەك (زيد ، عمرو) و هەندێکی (مبنی)یە وەك: (هذا، هؤلاء)، وە فیعلیش هەر وایە، فیعلی ماضي وئەمر، مەبنی یە، و موضاریع، موعرەبە، وە کاتێك کە (نونی جەمعی مؤنث)ی چوویە سەر، وەك (یکتبن وتکتبن، ئەوە مەبنی یە لەسەر سکون، وە کە نونی تەئکیدی ڕاستەوخۆی چویە سەر وەك (أضربنّ ولا تضربّن)، ئەوە مەبنی یە، لەسەر فەتحە، وە حەرفەکان هەمویان (مبنی)ین، هەنێکیان بەسکون وەك (قد) و هەندێکیان، بە فەتحە وەك (أنّ) و هەندێکیان بەضە ممّە، وەك (منذ) و هەندێکیان بە کەسرە، وەك (جیر) کە واتای (نعم: بەڵێ) دەگەیەنێ.

* * * * *

المقدمة الرابعة: إِن النحو دائر على العامل و المعمول والعمل، أي الإِعراب.

فالعامل: ما إِقتضى حالة مخصوصة لآخر الكلمة.

والمعمول: نفس هذه الكملة.

والعمل: هي الحالة المخصوصة، لآخرها، ومثاله، كتب العباس القرطاس، فكتب عامل لِأقتضائه رفع العباس، ونصب القرطاس، وهما معمولان معربان، أثر فيهما العامل، و إِختلف آخرهما به، والرفع والنصب إِعراب، وكلّ منهما حالة خاصة تمتاز عن الأُخرى.

---

پێشەکی چوارەم: زانستی نەحو: لەدەوری سێ شت دەسوڕێتەوە، عامیل و مەعمول، و عەمەل یاخود (أعراب)، کە (عامل) ئەوەیە کە حاڵەتێکی تایبەت بەسەرکۆتایی کەلیمەدا دێنێت، وە (معمول) خودی ئەو کەلیمەیەیە، کە حاڵەتەکەی بەسەردا دێت، وە عەمەل.. حاڵەتێکی تایبەتی یە، کە لە کۆتاییەکەیدا، دروست دەبێت، وەك:( کتب العباسُ القرطاس).. کە.. (کتب)، عامیلە، چونکە (عباس)ی مەرفوع و (قرطاس)ی ،مەنصوب کردووە وە (عباس و قرطاس) مەعمولن و موعرەبن، چونەحاڵەتەکە بەسەریاندا هاتووە، و حەرەکاتیان گۆڕاوە، وە بە (ڕەفع و نەصب)ەکە، دەگوترێ (أعراب) وە هەریەکە لەمانە حاڵەتی تایبەتین و لەوانی تر جیا دەکرێنەوە.

فالأِعراب ما اِختلف به آخر الكلمة، بحسب اِقتضاء العامل، وأنواعه أربعة: الرفع والنصب، وهما مشتركان بين الأِسم، والفعل، والجرّ ويختص بالأِسم، والجزم، ويختص بالفعل، وأبوابه ثمانية:

الباب الأول: الأِعراب بتمام الحركات، أي اِن الرفع بالضمة، والنصب بالفتحة، والجرّ بالكسرة، والجزم بالسكون، وذلك في الأِسم المفرد، والجمع المكسر المنصرفين، والمضارع الصحيح الآخر، والمنصرف: اِسم يقبل الجرّ والتنوين، نحو: جائني رجل و رجال، و رأيت رجلاً أو رجالاً، ومررتُ برجل أو رجال، والذئب يأكل الغنم، ولـم يترك عادته، ولن يتركَها.

---

وە ئیعراب ئەوەیە، کە بەهۆ یەوەکۆتایی کەلیمە دەگۆڕێ، بەگوێرەی عەوامیلەکان، و چوار جۆرە: ڕەفع و نەصب کە هی (أسم و فعل)ـە، وە (جرّ) تایبەتە بە ئیسم. و(جەزم) تایبەتە بە فیعل.وڕونکردنەوەیشی لەهەشت باس دادێت.

باسی یەکەم: ئیعراب، بەحەرەکاتە تەواوەکان، واتە: کە ڕەفع بەضەمّە، و نەصب بە فەتحەو جەڕ بە کەسرە، بێت، وە (جەزم) بە سکون بێت، ئەمەش، لە ئیسمی "موفرەد: تاك"، و (جەمعی تەکسیری مونصەریف)دا، هەیە وە لە موضاریعی (صحیح الآخر)دا، بۆ جەزمەکەو سیانەکەی تر، وە (مونصەریف) ئەوەیە کە (جرّ و تنوین) وە ردەگریێ، وەك (جائني رجل، ورجال ورأيت رجلاً أو رجالاً، ومررتُ برجل أو رجال...)،و بۆ فیعل وەك (الذئب يأكل....) کە لەیەکەمدا (رجل) مەڕفوعەو لە دووەمدا، (رجل) مەنصوبە و لەسێیەمدا، (رجل) مەجرورە، وە (يأكل)، مەڕفوعەو (يترك) مەجزومەو (يترك)ی دووەم مەنصوبە، بەهۆی (لن)ـەوە.

الباب الثاني: أن يكون الرفع بالضمة، والنصب والجرّ بالفتحة، وذلك في الإِسم غير المنصرف، أعني: ما لا يقبل الجرّ والتنوين، نحو: بعث أحمد الى كافة الناس، وصدقت أحمد، وآمنتُ بأحمد.

الباب الثالث: أن يكون الرفع بالضمة، والنصب والجرّ بالكسرة، وذلك في الجمع بالألف والتاء، نحو: تعلمت المسلمات الآيات، فعلّمنها البنات.

---

باسی دووەم: دەبێت، ڕەفع بەضە مّمە و نەصب و جەرِ بە فەتحەبێت، کە ئەمەش لە ئیسمی غەیر مونصەریف دایە واتە: ئەو ئیسمەی تەنوین و جەرِ وەرناگرێ، وەك (بعث أحمد) کە مەرفوعە، و لە (صدقت احمد) و(آمنت بأحمد)دا، کەحاڵەتی نەصب و جەرِە ، مەفتوحە.

باسی سێیەم: دەبێت ڕەفع بە ضە مّە و نەصب و جەرِ بەکەسرە بێت، ئەمەش لە جەمعی مؤنثی سالمدایە، وەك (تعلمتُ المسلمات) کە مەفعولەو مەکسورە، وە (فعلمنها البنات) کە مەجرورە.

*** لە عەوامیلی بورکەویدا فەرموویەتی:**

وإما ناقص الإعراب، وهو على قسمين: قسم رفعه بالضمة ونصبه وجره بالفتحة، وذلك غير المنصرف، نحو: جاءَنا أحمدُ عليه السلام، وصدقنا أحمدَ عليه السلام، وآمنا بأحمدَ عليه السلام.

**بەشی یەکەم بە (ناقص الإعراب)یش دێت، بەم شێوازە کە دوو جۆرە:**

**بەشێکیان ئەوەیە کە ڕەفعەکەی بە ضەممە بێت و نەصب و جەڕەکەی بە فەتحە بێت، کە ئەویش (غەیرە مونصەریف) دەگرێتەوە، وەك:**

**(جاءنا أحمد).**

**و(صدقنا أحمد).**

**و(آمنا بأحمد).**

**ئیعرابیی ئەم سێ نموونە، وەك هی پێشوو وایە.**

الباب الرابع: الأِعراب بتمام الحروف النائبة عن الحركات، أي إِن الرفع بالواو، والنصب بالألف، والجرّ بالياء، وذلك في الأسماء الستة، وهي: أب، و أخ، و حم، و هن، و فم، و ذو بمعنى صاحب، بشرط أن تكون مفردة، لا مثناة، ولا جمعاً، و مكبّرة، لا مصغّرة، كأبي، ومضافة ألى غير ياء المتكلم، وأن تحذف ميم، فم، نحو: جائني أبوه، ورأيت أباه، ومررتُ بأبيه، و جاءني حموها، و رأيت حماها، ومررتُ بحميها، وانكشف هنوه، واستقبحوا هناه، و أمروه بستر هنيه، وجاءني ذو عقلٍ، وعين لي أستاذاً ذا حلم، بدل جاهلاً بذي علم.

---

باسی چوارەم: باسی ئیعرابە بەو حەرفانەی کە لەجێی حەرەکات، دادەنیشن، کە ڕەفعیان بەواوە، وە نەصب و جەڕ یان بە (یاء)ە، ئەمەش لە (أسماء الستة) دایە، کە ئەمانەن، (أي، أخ، حم، هن، فم، ذو،) کە "ذو" واتای (خاوەن) دەگەیەنێ، وە پێویستە موفرەد بن و موسەننا و جەمع نەبن و (مصغر: بچوك کراوە) نەبن، و (مکبرة) بن، وەك (أبی) و ئیضافەکرابن، بۆ لای غەیری (یاء متکلم) وەلە (فم)دا میمەکە حەذف بکرێت، وە نمونە بۆ هەمویان لەسەرەوە هێنراوە، وە نمونە بۆ (فم) وەك، (هذا فوه) (چونکە ئەگەر حەذف نەکرێت ئیعرابە ئەصلیەکە دەردەکەوێت). وەك: ئیبن مالیك لە ئەلفیەکەیدا دەڵێت:

وَارْفَعْ بِوَاوٍ وَانْصِبَنَّ بِالأَلِفْ　　وَاجْرُرْ بِيَاءٍ مَا مِنَ الأَسْمَا أَصِفْ

مِنْ ذَاكَ ذُو إِنْ صُحْبَةً أَبَانَا　　وَالفَمُ حَيْثُ الْمِيمُ مِنْهُ بَانَـــا

أَبٌ أَخٌ حَمٌ كَذَاكَ وَهَنُ　　وَالنَّقْصُ فى هَذَا الأَخِيرِ أَحْسَنُ

وَفى أَبٍ وَتَالِيَيْهِ يَنْــدُرُ　　وَ قَصْرُهَا مِنْ نَقْصِهِنَّ أَشْـــهَرُ

وَشَرْطُ ذَا الإِعْرَابِ أَنْ يُضَفْنَ　　لالِلْيَا كَجَا أَخُو أَبِيكَ ذَا اعْتِلاَ

* * * *

**الباب الخامس: أن يكون الرفع بالألف، والنصب والجرّ بالياء، وذلك في المثنى، كالرجلين، و ما أُلحق به، كأثنين وأثنتين، وكلا و كلتا مضافين، إلى ضمير المثنى، ومثل الأبوين، والعمرين، نحو: الوالدان كلاهما، أمرا الولدين كليهما، بمحافظة العينين كلتيهما، و بإحترام العمرين، والنظر إليهما كالقمرين.**

---

باسی پێنجەم: دەبێت ڕەفعە بە ئەلف و نەصبە و جەڕە بە (ياء) بێت، کە ئەمەش لە (مثنى)دایە و ئەوەی وەك (مثنى) وایە وەکو (أثنين و أثنتين، و كلا، كلتا)، کاتێ کە ئیضافە کرابن، بۆلای ضە میری(مثنى).

<u>وەك ئیبن مالیك لە ئەلفیەکەیدا دەڵێت:</u>

**بالألـــف ارفع المثنى وكلا أذا بمضمر مضافاً و صلا.**
**كلتا كذاك أثنان وأثنتان كابنين وابنتين يـــجـــريان.**

وەك ئەو نمونانەی سەرەوە، کە "الوالدان و كلا" مەرفوعن بە ئەلف و "الولدين، و كليهما، والعينين" مەجرورن و مەنصوبن بە "ياء" .

## <u>* لە عەوامیلی بورکەویدا فەرموویەتی:</u>

**بەشی دووەم: لە (ناقص الإعراب) بە حوروف ئەوەیە کە: ڕەفعەی بە ئەلف و نەصب و جەڕەی بە (ياء)بێت، کە ئەمیش (تثنية) و ووشەی (اثنان و كلا)، کە بۆ لای ضە میرێك ئیضافە کرابێت، دەگرێتەوە:وەك: (جاءنا الإثنان كلاهما أي الكتاب والسنة، واتبعنا الإثنين كليهما، وعملنا بالإثنين كليهما: هەردووکمان بۆ هاتوون، واتە: قورئان وسوننەت، وشوێن هەردووکیان کەوتین، واتە: قورئان وسوننەت، وکارمان بە هەردووکیان کرد، واتە: قورئان وسوننەت).**

**(جاءنا الإثنان): فیعل و مەفعول و فاعیل. (كلاهما): تەئکیدی مەعنوی یە، (هما): مضاف إليه.**

**(اتبعنا الإثنين): فیعل و فاعیل ومەفعول. (كليهما): تەئکیدی مەعنەوی یە، (هما): مضاف إليه. (علمنا): فیعل و فاعیل. (بالإثنين): جارو مەجرورە، وموتەعەللیقە بە(علمنا)، (كليهما): تەئکیدی مەعنەوی یە، (هما): مضاف إليه.**

**<u>مەبەست:</u> لەم سێ نموونەیەدا (اثنان و كلا)یە، کە (ناقص الإعراب)ن بە حوروف.**

الباب السادس: أن يكون الرفع بالواو، والنصب والجرّ بالياء، وذلك في الجمع المذكر السالم، و ما أُلحق به، كباب عشرين، ولفظ العليين ، والاهلين، والعالمين، وأرضين، وعانسين، نحو: المسلمون قاتلوا الكافرين، فأسروا منهم سبعين محارباً، و تنورت الأرضون، بأعمال المجاهدين، أُولي الأِخلاص، وصعدت أَعماهم إِلى العليين، كل ذلك ببركة من بعث رحمة للعالمين.

---

باسی شەشەم:

دەبێت ڕەفعە بە واو، و نەصبە و جەڕە ی بە (یاء) بێت، کە ئەمەش لە "جمع مذکر سالم" دا یەو ئەوەی پێوەی بەندە، وەك "عشرین"وهاووێنەکانی ،" العليين، أهلين، العالمين، أرضين، عانسين"، هەروەك ئەو وەهان، وەك: ( المسلمون قاتلوا الكافرين، فأسروا منهم سبعين، محارباً و تنورت الأرضون، بأعمال المجاهدين، أولي الأخلاص وصعدت أعماهم إلى العليين، كل ذلك ببركة من بعث رحمة للعالمين: مسوڵمانەکان کوشتاری کافرەکانیان کرد، وحەفتا چەکداریان لێ بە دیل کردن، سەرزەوی "هەرلەوکاتەوە تائەمڕۆ"بەم کردەوەیەی موجاهیدە نیازپاکەکان نورانی بوو، وئەم کردەوە پاکانەیان بەرز بویەوە بۆ کەشکەشانی فەلەك، ئەمەش هەموو لەبەرەکەتی هاتنی پێشەوای مرۆڤایەتی یەوەﷺ بوو!

"المسلمون" مەرفوعە بەواو "الكافرين" مەجرورە بە "یاء" وە هەروەها "سبعين" مەجرورە، بە "یاء" و "أرضون" مەرفوعە بە واو" و "مجاهدين، العليين، عالمی" مەنصوب و مەجرورون بە "یاء".

الباب السابع: أن يكون الرفع بالضمة، والنصب بالفتحة، والجزم بحذف الآخر، وذلك في المضارع المعتل، وهو (في النحو)، ماكان آخره، واوا، أو ياء، أو ألفاً، نحو: الكسلان لم يعل، ولن يعلو، و يدعو بالثبور.

الباب الثامن: أن يكون الرفع بالنون، والنصب والجزم بحذفها، وذلك في الأفعال الخمسة، أعني، يفعلان و تفعلان، و يفعلون، وتفعلون، و تفعلين، نحو: الصديقان اللذان يتحابان في الله لن يخسرا، و لـم يخسرا.

---

باسی حەوتەم:

دەبێت بە ڕەفع بە ضە مە و نەصبە بە فەتحەو، و جەزمە بە حەذفی ئاخرەكەی بێت، ئەمەش لە موضاریعی موعتەل داهەیە، كە لەپێناسەی (نەحو)دا موضاریعی موعتەل، ئەوەیە كە كۆتایی یە كەی "واو"، یان، "یاء"، یان، " ئەلف" بێت، وەك: (الكسلان لم یعل، ولن یعلو ویدعو بالثبور)، كە (یعلو) مەنصوبە بە فەتحە، و (یعل) مەجزومە بە حەذفی ئاخر، و (یدعو) مەرفوعە، بە ضە مە.

باس هەشتەم:

دەبێت، ڕەفعە، بە "نون" وە ونەصبە و جەزمە بە "حە زفی نون" بێت. وە ئەمەش لە ئەفعالی خەمسەدایە، كە ئەمانەن "یفعلان، تفعلان، یفعلون، تفعلون، تفعلین" ، وەك "الصدیقان اللذان یتحابان في الله، لن یخسرا ولم یخسرا" كە "لن یخسرا ولم یخسرا" نەصبە و جەزمە، بە حەزفی نونە، وە "یتحابان" مەرفوعەبە "نون".

* * *

المقدمة الخامسة: تكون جميع الحركات مقدّرة، في المضاف ألى ياء المتكلم، نحو: هذا غلامي، ورأيت غلامي، ومررتُ بغلامي، وفي المقصور، وهو ما في آخره، ألف مقصورة، نحو: جاء الفتى، و رأيت الفتى، ومررتُ بالفتى.

والرفع والجرّ فقط في المنقوص، وهوما في آخره ياء، مكسور ما قبلها، نحو: هذا ساعٍ، ورأيت ساعياً، ومررتُ بساعٍ.

والرفع والنصب في المضارع المعتل بالألف، نحو: زيد يخشى، ولن يخشى، و الرفع فقط في المضارع، المعتل بالواو، والياء، نحو: زيد يدعو، و الصَّيَّاد يَرمي.

---

پێشەکی پێنجەم:

ئەوەیە، کە هەموو حەرەکاتەکان شاراوەن، ئەمەش لەکاتی ئیضافەکردن دایە، بۆلای "یاء متکلم" وەك "هذا غلامی..." کە حەرەکات دیار نین، وە هەروەها لە ئیسمی مەقصوردا، نادیارە، وەك "جاء الفتی...." کە بێ حەرەکەیە وە لە ڕەفع و جەڕەی ئیسمی مەنقوص دا، حەرەکات شاراوەیە، وەك "هذا ساعٍ" کە مەرفوعە، و "مررت بساعٍ" کە مەجرورە، و دیار نین، و لە "رأیت ساعیاً" دا مەنصوبە و دیارە.

وە "ڕەفعە و نەصبە" لە موضاریعی موعتەل بە "ألف" دا وەك "زید یخشی"، و"لن یخشی" کە حەرەکە نی یە، و لە ڕەفعەی موضاریعی موعتەل بە "واو ویاء" دا، وەك: "زید یدعو، والصیاد یرمی" کە حەرەکەت دیار نی یە، چونکە "یدعو" موضاریعی بە واوە، و "یرمی" موضاریعی موعتەل بە "یاء"ە.

* * *

المقدمة السادسة: الأِسم المعرب، إمّا منصرف، وهو ما دخله الجرّ والتنوين، وهو كثيرٌ لا يحصى، وأمّا غير منصرف، و هو ما لـم يدخله الجرّ ولا التنوين، لعلّتين من العلل التسع، أو علة واحدة، تقوم مقام علتين، وهي العدل، أي كون الأِسم، خارجاً عن صيغة أصلية، كعمر، فأنه معدول، عن عامر، والتأنيث: لفظياً، كفاطمة وطلحة، أو معنوياً، كعقرب، والعلمية كبغداد، والعجمة، أي كَوْن الأِسم أعجمي الوضع، مثل: أبراهيم، والوصف: أي كَوْن الأِسم دالاً على ذات ملحوظ، مع صفة من الصفات، كأفضل، والتركيب، اي كَوْن الأِسم مركباً من كلمتين، كبعلبك.

---

پێشەکی شەشەم: بزانە کە ئیسمی موعرەب، یان مونصەریفە، واتە "جرّ" و"تنوين"ی دەچێتە سەر کە ئەمەش لە ئەژمار نایەت، وەیان "غير منصرف"ە، ئەویش ئەوەیە کە "جرّ" و" تنوين"ی ناچێتە سەر، بە هۆی ،هۆکارێك : عیللەتێك لە نۆ عیللەتەکە ، یان یەك عیللەت، کە لە جێی دوو عیللەتدا، دابنیشێت، و عیللەتەکان ئەمانەن:

**العدل:** واتە ئەو ئیسمەی کەلە صیغە ئەصڵیەکەی خۆی لادرابێ، وەك "عمر" کە ئەصڵەکەی "عامر" بووە.

**"التأنيث"**: لەفزی بێت، وەك " فاطمة" و" طلحة" یان مەعنەوی بێت، وەك "عقرب" .

**"علميه"**: وەك بغداد، وە "المحبة" واتە: ئەو ئیسمەی کە لەغەیری عەرەبی دانرابێ، وەك "أبراهيم".

**"الوصف"**: واتە: ئەو ئیسمەی کە دەلالەت بکاتە سەر زاتی شتێك، و صیفەتیش بێت، وەك "أفضل" وە "مركب" بێت واتە: لە دوو کەلیمە پێك هاتبێت، وەك "بعلبك".

والألف والنون الزائدتان، في آخره، كسكران، و وَزْنُ الفعل، كأحمد، وألف التأنيث مقصورة، كحُبلى، أو ممدودة، أي بعدها همزة زائدة، كحمراء، وصيغة منتهى الجموع، أي:"صيغة جمع فوق جمع"، إشارة إلى أنه قد يتكرر جمع التكسير في بعض الكلمات، وآخر الجمع يكون على هذا الوزن، كأكاليب، جمع أكلب، و هو جمع كلب، و أناعيم جمع أنعام، جمع نعم، و إن لم يتكرر الجمع، في بعض الصيغ، كمساجد جمع مسجد، ومصابيح، جمع مصباح.

---

وه ئەلف و نونی زیاده، لەکۆتاییدا هەبێت، وەك" سكران وه "وزن الفعل" بێت، وەك "أحمد" وه "ألف تأنيث مقصوره"ی هەبێت وەك "حبلى" یان مەمدودەی هەبێت، وەك "حمراء". مەمدووده، واته: لەدوایەوه هەمزەی زیاده هەبێت.

یان "صیغەی منتهى الجموع" بێت، واته صیغەی جەمعێ لەسەروی جەمعێکی ترەوه، لێرەدا ئاماژه یه، بۆ ئەوەی كه جەمعی تەکسیر چەند جار له هەندێ ووشەداجەمع دەکرێتەوەو ئاخرەمین جەمعی لەسەر ئەو وەزنه دەبێت، كه " أكاليب"..ەكه جەمعی "أكلب"ە، و ئەویش جمعی "كلب"ە، وه "أناعيم" جمعی "أنعام"ە،و ئەویش جەمعی "نعم"ە، وه لەهەندێ صیغەیدا، دوباره نابێتەوه، وەك "مساجد" كه جەمعی "مسجد"ە،و "مصابيح" جەمعی "مصباح"ە، كه صیغەی "منتهى الجموع"ن.

* * *

وضابط الصيغة: ماكان أولها مفتوحا، و ثالثها ألفا، و بعدها حرفان متحركان، كمساجد، أو ثلاثة أحرف أوسطها ساكن، كمصابيح، و إنّما سُمِّيَت صيغة منتهى الجمع، لأنها لا تجمع جمع التكسير مرة أخرى، فهذه العلل متى أجتمعت ثنتان منها، كأحمد فإنّ فيه العلمية، و وزن الفعل، أو علة واحدة تقوم مقام علّتين، و تنحصر في ألف التأنيث، كما في حُبلى، و حمراء، و صيغة منتهى الجمع، كمساجد، و مصابيح، إمتنع عن قبول الجرّ والتنوين، فَعُمَر غير منصرفٍ، للعدل والعلمية، وكذا فاطمة للتأنيث والعلمية، وأفضل للوصفية، و وزن الفعل، و بغداد، للعجمة، و العلمية، و بعلبك، للتركيب، والعلمية، وسكران للألف والنون والوصفية، وأحمد لوزن الفعل والعلمية، وحبلى لألف التأنيث المقصورة فقط، وحمراء لِألف التأنيث الممدودة فقط، ومساجد لصيغة منتهى الجمع فقط.

---

"ضابط الصيغة": ئەوەیە کەسەرەتاکەی مەفتوح بێت وە سێیەم حەرفی ئەلف بێت وە دوای ئەلف دوحەرفی حەرەکەدار هەبێت وەك "مساجد" یان دوای ئەلفەکە سێ حەرف هەبێت، ناوەڕاستینەکەیان مەسکون بێت، وەك "مصابيح" وە بۆیە ناونراوەتە، "صیغه منتهى الجمع" چونکە لەوە زیاتر جەمع ناکرێت، ئەم نۆ عیللەتە هەرکات، کۆبوونەوە لە ئیسمێکدا، غەیرە مونصەریفە، وەك "أحمد" کە "عەلەمیەت و (وزن الفعل)ی.. تیادایە، و یان عیللەتێك هەبێت، کە لەجێی دوان دانیشێت، کە ئەوانیش "تأنيث"ی وەك "حبلى و حمراء"و، "صیغه منتهى الجمع"ی، وەك "مساجد و مصابيح" دەگرێتەوە، کە خۆیان لە "جرّ" و "تنوين" دەپارێزن، بۆیە "عمر" غەیرە مونصەریفە، بەهۆی "عدل" و" علمية". و"فاطمة" غەیرە مونصەریفە بەهۆی "تأنيث وعلمية"ەوە. وە "افضل" بەهۆی وەصفیەت و "وزن الفعل". وە "بغداد" بەهۆی عەجەمیەت و عەلەمیەت، وە (بعلبك) بەهۆی تەرکیب و عەلەمیەت، و (سكران) بەهۆی ئەلف و نون و ، وەصفیەت. وە "أحمد" بەهۆی "وزن الفعل" و عەلەمیەت .

وە (حبلى: ئافرەتی سك پڕ)، بە هۆی ئەلفی تەئنیثی مەقصورەوە، وە (حمراء) بەهۆی ئەلفی تەئنیثی مەمدودە وە، (مساجد) بەهۆی "صیغەی منتهى الجموع"ەوە. هەر بۆیە شاعیر دەڵێ:

فمعرفة وتأنيث و نعت ونون قبلها ألف و جمع
وعجمة ثم تركيب وعدل ووزن الفعل وأسباب تسع

وە ئیبن مالیك، لە ئەلفیەكەیدا، دەڵێت:

والعلم امنع صرفه مركّبا تركيب مزج نحو معديكربا
كذاك حاوي زائدَيْ فعلانا كغطفان وكأصبهانا
كذا مؤنث بهاء مطلقا وشرط منع العار كونه ارتقى
فوق الثلاث أو كجَوْر او سقر أوزيد أسم امرأة لاأسم ذكر
وجهان في العادم تذكير سبق أو عجمة كهند والمنع أحقّ
كذاك ذو وزن يخصّ الفعلا أو غالب كأحمد و يعلى
وما يصير علماً من ذي ألف زيدت لألحاق فليس ينصرف
ووصف أصليّ ووزن أفعلا ممنوع تأنيث بتا كأشهلا.

* * *

## ﴿ مونصەریف و غەیرە مونصەریف ﴾

ئیسمی موعرەب دوو بەشە: مونصەریف و غەیرە مونصەریف

١-ئیسمی مونصەریف: ئەو ئیسمە موعرەبەیە كە تەنوین وەردەگرێت، وە زۆرینەی ئیسمەكان موعرەبن، وەك: (جاءَ رجُلٌ)، (إشترَيتُ كتاباً) ، (سلّمتُ على زيدٍ).

٢-ئیسمی غەیرە مونصەریف، یان ئیسمی (لا ينصرف) یاخود ئیسمی (ممنوع الصّرف): ئەو ئیسمە موعرەبەیە كە تەنوین وەرناگرێت: وەك: (خرج إبراهيمُ) ، (رأيتُ إبراهيمَ) ، (سلمتُ على إبراهيمَ). هەڵبەتە ئیسمی غەیرە مونصەریف خاوەنی

تایبەتمەندی تریشە، وە زۆرینەی کاتیش غەیرە مونصەریف لە حاڵەتی جەڕدا مەفتوح دەبێت، وە لەسەرەنجامدا ئیعرابەکەی لە ضەممە و فەتحە دا حەصر دەبێت.

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانرێت بگوترێت، ئیسم لە پێنج حاڵەتدا تەنوین وەرناگرێت.

١–لە موسەننا و جەمعی موزەککەری سالم دا لەم حاڵەتەدا (نون) جێگری تەنوینە، وەك: (معلمّان – معلمين – معلمون – معلمين).

٢–ئیسمە مەبنی یەکانی وەك: (أمس – حيثُ – أين – كمْ).

٣–ئیسمی موعەڕەف بـە (أن)ی، وەك: الرّجل.

٤–ئیسمێك کە بۆلای ئیسمێکی تر ئیضافە بکرێت، وەك: (كتابُك – قلمنا).

٥–ئیسمی غەیرە مونصەریف: وەك: (أبراهيم – أحمد).

وە هەرکات لە ئیسمی موعرەبدا، دوو سەبەب لە نۆ سەبەبەکە یان یەك سەبەب کە (قائم مقام، لە جێگای) دوو سەبەب دابنیشێت، کۆ ببنەوە، ئەوا لەم کاتەدا ئیسمەکە غەیرە مونصەریفە.

١–علميّت، ٢–تأنيث ٣–جمع ٤–تركيب "مركّب بوون" ٥–وصف ٦–ألف و نونی زيادة ٧–عدل ٨–وزن الفعل ٩–عجمة.

وە بەدرێژی ئیسمە غەیرە مونصەریفەکان ئەمانەن:

١–عُجمة: "عەرەبی نەبوون": ئیسمی عەجەمی بەو مەرجەی کە لە سێ حەرف زیاتر و لە عەجەمیشدا عەلەم بوبێت، ئەوە غەیرە مونصەریفە، وەك: (إبراهيم) ، (يعقوب)، (إسماعيل)، هەر لەبەر ئەمەش ئەگەر ئیسمی عەجەم لە زمانی عەرەبیدا ببێت بە عەلەم، ئەوە مونصەریفە، وەك: (لجام): ڕەشوەی ئەسپ، لەگەڵ ئەوەدا کە عەلەمە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە لەزمانی عەرەبدا بووەتە عەلەم لەم ڕووەوە مونصەریفە.

٢–تأنيث: هەر ئیسمێکی عەلەم کە مؤنثی لەفزی یان مەعنەوی بێت، وەك: (فاطمة)، (زينَبُ)، (مَريَم)، وە ئەگەر مؤنثە کە "ثلاثي:سیانی" بێت، بەڵام حەرفی ناوەڕاستی (ساكن) بێت، لەم کاتەدا مونصەریفە، وەك: (هندٌ، هنداً، هِندٍ).

٣-جەمع: یەکێك لە هۆکارەکانی مەنع صەرف کە لەجێگای دوو سەبەب دا دەنیشێت. جەمع بوونە. بەڵام هەموو جەمعێك نا. بەڵکو بەتایبەت (جمع منتهی الجموع)ە، کە ئەو جەمعەیە کە سەرەتاکەی مەفتوح و سێیەم پیتی ئەلفی نەگۆڕدراو (غیر عوض) وە لە دوای ئەمیش دوو حەرفی موتەحەڕریك هەبێت، وەك: (دراهم-مساجد) وە یان لە دوای ئەلف سێ حەرفی موتەحەڕریك و حەرفی ناوەڕاستی (ساکن)بێت، وەك: (مصابیح-مفاتیح).

٤-تەرکیب: (مورەککەب بوون): هەر ئیسمێکی عەلەم کە (مورەککەبی مەزجی) بێت، واتە لە دوو بەشی تێکەڵ کراو پێك هاتبێت، بەو مەرجەی کە بەشی دووەمی بە جیاو بەتەنها خۆی بەکار نەهێنرێت، وەك: (بعلبك-معدیکرب).

(بزانە): کە بەپێچەوانەی (مورەککەبی ئیضافی) وەك(عبدالله)و ( مورەککەبی ئیسنادی) وەك: (تأبط شراً) و (زیدٌ منطلق) کە غەیرە مونصەریف نین، بەڵکو بەشی یەکەم و دووەم لە مورەککەب ئیضافی دا مەجرور و لە مورەککەبی ئیسنادی دا ئەو ئیعرابەی کە لەپێش عەلەمیەت دا هەیبوو تیایدا وەردەگیرێت.

٥-وصف: (صیفەت بوون):- هەر صیفەتێك کە لە سەر وەزنی (أفعل) بێت: ئیتر گشتی تر لەوەی کە صیفەتیموشەبیهەیش بێت، وەك: (أحمر، أخضَر،أعوج)، وە یان (أفعل التفضیل) واتە: ئیسمی تەفضیل بێت، وەك: (أکبر-أصغر-أفضل-أعلم).

٦-ئەلف و نونی زائیدە: ئیسمی عەلەم یان صیفەتێك كە بە ئەلف و نونی زیادە كۆتایی بێت، وەك: (عثمان-عطشان).

٧-لادان لە ئەصلْ (عدول عن الاصل):ئیسمی عەلەم یان صیفەتێك كە لە ئەصڵەكەی خۆی گۆڕدرابێت، وەك: (عمر) كە لە ئەصلدا (عامر) بووە، وە وەك: (جەمع) كە لە ئەصڵدا (جمعاوات) یان (جمع) بووە، و وەك (أخرة) كە جەمعی (أخرى)یە، و لە (آخر)ەوە، وەرگیراوەو ئەو گۆڕانەی بەسەردا كراوە.

٨-وەزن فیعل: (هاو وەزنی فیعل): ئیسمی عەلەم یان صیفەتێك كە هاو وەزنی فیعل بێت، وەك: (یزید: أحمد-یشكر-تغلب-ترجس) وە هەروەها وەصفێك كە مؤنث ،ەكەی بەبێ (تاء) بێت، غەیرە مونصەریفە، وەك: (أحمر) كە مؤنث ەكەی (حمرى)یە، و بەبێ (تاء) بەكاردەهێنرێت، وە لەبەر ئەوەی كە خاوەنی دوو فەرع (وزن فعل، علمیت)ە، بوەتە غەیرە مونصەریفە.

٩-علمیّت:هەر ئیسمێكە كە دیارو ناسراوبێت، وەك: (أبراهیم، مریم)، وە ئیسمی غەیرە مونصەریف، هەر بەو شێوازەی كە باسكراو ڕابورد، لە حاڵەتی جەڕدا مەفتوح دەبێت، بەڵام هەركات لەگەڵ حەرفی تەعریف دا هات، وە یان بۆلای ئیسمێكی تر ئیضافە كرا، ئەوا لە حاڵەتی جەڕدا كۆتایی یەكەی مەكسور دەبێت،وەك :(سلّمتُ على الرّجل (لأكْبَرِ) و (سلّمتُ على أكبر الرجال).

مەبەست لە (ضمیر الشأن)ی (كان)ەیە، كە بووەتە ئیسم بۆی، وە جوملەی (الناس صقان) بووەتە خەبەر بۆی.

**المقدمة السابعة: الأِسم، أمّا نكرة، وهو ما دَلَّ على معنى غير معيّن، كرجل، وعلم ، و عالم، و إِمَّا معرفة، وهي ما دَلَّ على معنى معين، كلفظ "الله"، في (لاأِله اِلاّ الله)، ولفظ (محمّد)، في (محمّد رسول الله)، ولها سبعة أقسام: الضمير، والعلم، و أِسم الأِشارة، والمعرف باللام، والموصول، والمضاف أِلى أحد الأقسام الخمسة، و المُنادى.**

---

پێشەکی حەوتەم: بزانە کە: ئیسم یان "نکرة: نەناسراوە"، واتە: ئەوەیە کە دەلالەت لەسەر مانایەکی(غیر معین: دیارینەکراو)، بکات، وەك "رجل" و "علم" و" عالم"، بەلاّم "معرفة" ئەوەیە کە دەلالەت دەکاتە سەر مانایەکی دیاریکراو، وەك "الله" لە "لااله الا الله" داو "محمّدﷺ" لە "محمدر رسول الله"دا، کە مەعریفەن، وە حەوت بەشە:

"الضمیر" ، "العلم" ، "أسم الأشارة" ، "المعرف بأل" ، "موضاف بۆلای یەکێك لەو پێنجە" و" منادی".

**﴿(معرفة: مەعریفە) چی یە؟﴾**

**(معرفة):واتە :ناسین.وەئیسمی مەعریفە،ئیسمێکە دەلالەت بکاتە سەر مەفهومێکی دیاری کراو(معین)وەك :(زید).**

**وە(نکرة)مانای (نەناسراو)ی هەیە ،وەئیسمی نەکیرە،ئیسمێکە دەلالەت بکات لەسەر مەفهوم و مانایەکی موبهەم ونا دیار ،وەك (رجل)،(بلدة)، هەرکات بمانەوێت کەسێك یان شتێك بناسێنین بەبەرامبەرەکانمان ئەوە دەگونجێت،یەکێك لەم بەرکارانەی خوارەوە بەکاربهێنین.**

**بەهۆی ناوە تایبەتیەکەی خۆیەوە، وەك (جاء احمد – ذهبت الی بغداد )،کە ناوی تایبەتی هەر کەسێك و هەرشتێك،کە ئەفرادەکانی تری ئەو شتە کە یەك (جنس)یشیان هەبێت، نەگرێتەوە ئەوە بە( اسم علم) ناسراوە.**

**بەهۆی بەکارهێنانی ضەمیرەوە ،وەك :(هو قائم).**

بەهۆی ئاماژە (اشارة)کردن بۆ کەسێك یان شتێك کە قسەو باسی لەسەر بکرێت ،وەك (جاء ذاك الرجل) ،(اعصانی هذاالکتاب)

بەهۆی مەعریفە چییەتی ناساندن —بەهۆی جوملەیەکەوە ،وەك :"جاء الذی تشری منه کتابك"،کە لەم نمونەیەدا جوملەیەك هاتووە ،کە بۆ ناساندن (مُعَرَّفی )هاتووە وبە صیلە ناوزەد دەکرێت .

بۆئەوەی کە بیسەر ئاگادار بکەینەوە ،کە ئەو کەسە پێشینەیەکی زیهنی هەیە لەو بارەیەوە —واتە:لێی ئاگادارە—ئەمەش لە عەرەبیدا بەهۆی خستنە سەری (ال)بۆ سەر ئیسمێکی نەکیرە دێتە دی .

ناوێك کەخەریکی ناساندنی ئەوین،بەهۆی ناوی کەسێك یان شتێك کە کابرای بیسەر ئەو کەسە یان ئەو شتە دەناسێت.ئیضافە بکەین، وەك (اخذت کتاب علی) (ذهبت الی سوق بغداد).

کە وەك (ضرب) بووە. "تاء"فاعیلە (هذا)لەمەحەللی نەصبدا مەفعول بە،یە.

(بهذا)جارومەجرورە، موتەعەللیقە بە (بعث)، وە مەفعول بە غەیرە صەریحە بۆی.

مەبەستی ئێمە: (باء)ە، کە چوەتە سەر (هذا)و لە مەحەلدا مەجروری کردووە،وە بۆ بەرابەری (مقابلة) بە کار دەهێنرێت.

## ﴿الضمـــــــائر﴾

فالضمير: إسم دلّ على أمر غائب أو حاضر، مثل "هو" و"أنا"، و"أنت"، وهو قسمانٌ: متصل: و هو ما لا يتلفظ به وحده، ويكون مرفوعاً ومنصوباً ومجروراً في المحل، نحو: جاءَني زيدٌ، فارشدته إِليك.

ومنفصل: وهو ما يتلفظ به وحده، ويكون مرفوعاً، ومنصوباً لا غير.

أما الضمير المرفوع المتصلّ، فهو ألف في آخر فعل الإثنين مطلقاً، و واو في آخر فعل جمع المذكر مطلقاً، ونون في آخر فعل جمع المؤنث مطلقاً، وتاء بالحركات الثلاث: بالفتح في آخر فعل الماضي للمذكر المخاطب، وبالكسر فيه للمؤنث المخاطبة الماضي، وبالضم في المتكلم وحده، ولفظ (نا) في المتكلّم مع الغير، وياء في آخر فعل المضارع، والأمر للمؤنث المخاطبة، والأمثلة للماضي،( كتب–كتبا–كتبوا–كتبت–كتبتا–كتبن–كتبت–كتبتما كتبتم، كتبت–كتبتما–كتبتن ـ كتبت ـ كتبنا).

---

## ﴿راناوەكان: الضمـــــــائر﴾

ضه میر: ئیسمێكە دەلالەت دەكاتە سەر كارێك، لە غائیب، یان ئێستادا، وەك،(هو، أنا ، أنت)، وە دوو بەشە:

(متصل: لكاو): ئەوەیە كە تەنها خۆی دەرنابڕدرێ، وەبە مەرفوعی و مەنصوبی و مەجروری لە مەحەلدا دێت، وەك "نی" لە "جائنی زید"دا. (منفصل: جیابووەوە): ئەوەیە كە تەنها خۆی دەردەبڕدرێ ، وە بەتەنها "مەرفوعی و مەنصوبی" دێت.

وە ضه میری مەرفوعی موتتەصیل ئەمانەن: ئەلفی" أثنین : مثنی" ، كە لە فیعلی "أثنین" دایە ،وە "واو"ی جەماعە لە ئاخری فاعیل لە فیعلی ماضی موزەككەردا، وە "نون"ی (نسوة) ، لەئاخری فیعلی مؤنث دا، وە "تاء"ی فاعیل لە فیعلی ماضی موزەككەری موخاطە بدا، و لە مؤنثی موخاطە بی ماضیدا، و وە لە "متكلم وحده"دا، وە لەفیعلی "نا" لە "متكلم مع الغیر"دا، وە "یاء" لە ئاخری فیعلی موضاریعدا، وە لە ئەمری مؤنثی موخاطە بدا، وە نمونە، بۆ ماضی ئەوانەن، كە لەسەرەوە هاتوون.( كتب-كتبا-كتبوا-كتبت-كتبتا-كتبن-كتبت-كتبتما كتبتم، كتبت-كتبتما-كتبتن ـ كتبت ـ كتبنا).

والضمير المرفوع المتصل مستتر في كتب يفسر بلفظ هو، وكذلك في كتبت، ويفسر بلفظ هي، و واو كتبتم محذوفة، فأن أصله كتبتموا، وللمضارع: يكتب ، يكتبان ، يكتبون، تكتب ، تكتبان، يكتبن، تكتب، تكتبان، تكتبون، تكتبين، تكتبان، تكتبن، أكتب، نكتب.

والضمير المرفوع المتصل مستتر في يكتب تفسيره هو، وفي تكتب للغائب المؤنث تفسيره هي ، وفي تكتب للمذكر المخاطب تفسيره أنت، و في أكتب للمتكلم وحده تفسيره أنا، وفي نكتب للمتكلم مع الغير تفسيره نحن.

وللأمر، أكتب ،أكتبا، أكتبوا، أكتبى ، أكتبا ،أكتبن، والضمير المرفوع المتصل مستتر في أُكتب، تفسيره أنت.

---

ضه میری مەرفوعی موتتەصیلی موستەتیر لە "کتب"ەدا، "هو"ەیە، ولە "کتبت"..دا "هی" ،وە لە "کتبتم"دا، لە ئەصلدا "کتبتموا" بووە، وە "واو" حەزف کراوە. وە صیغەی موضاریع، ئەوانەی سەرەوەن،( یکتب ، یکتبان ، یکتبون، تکتب ، تکتبان یکتبن، تکتب، تکتبان، تکتبون، تکتبین، تکتبان، تکتبن، أکتب، نکتب). سەیر بکە: کە ضه میری مەرفوعی موتتەصیلی موستەتیر لە "یکتب"..دا.. "هو"ە یە، و لە "تکتب"دا کە بۆ غائیبی مؤنثه "هی"یە، و لە "تکتب"دا کە بۆ موزەککەری موخاطه ب "أنت"ەیە، و لە "أکتب"دا کە بۆ "متکلم وحده"، "أنا"یە، و لە "نکتب"دا کە بۆ "متکلم مع الغیر"، "نحن" یە.

وە صیغەکانی فیعلی ئەمر ئەوانەی سەرەوەن،( أکتب ،أکتبا، أکتبوا، أکتبی ، أکتبا ،أکتبن)، کە ضه میر لە "أکتب"دا، "أنت"ەیە،

و أما الضمير المنصوب والمجرور المتصلان: فهو ما لحق العوامل الآتية، نحو: أكرمه، أكرمهما، أكرمهم، اكرمها، أكرمهما، أكرمهن، أكرمك، أكرمكما، أكرمكم، أكرمك، أكرمكما، أكرمكن، أكرمني، أكرمنا، و أنا مكرمه، مكرمهما، ومكرمهم، ومكرمها، ومكرمهما، ومكرمهن، ومكرمك، ومكرمكما، ومكرمكم، ومكرمك، ومكرمكما، ومكرمكن، و زيد مكرمي، ومكرمنا.

---

وە ضه میری موتتەصیلی مەنصوب و مەجرورر، ئەوانەن کە بەوصیغانەوە لکاون، کە لەسەرەوە هاتوون، سەرنج بدە:

-أكرمه.

-أكرمهما.

-أكرمهم.

-اكرمها.

-أكرمهما.

-أكرمهن.

-أكرمك.

-أكرمكما.

-أكرمكم.

-أكرمك.

-أكرمكما.

أكرمكن، أكرمني ، أكرمنا، وأنا مكرمه، مكرمهما، ومكرمهم، ومكرمها ومكرمهما ومكرمهن ومكرمك ومكرمكما ومكرمكم، ومكرمك ومكرمكما ومكرمكن، وزيد مكرمي ومكرمنا). کە "هاء"ە، لە "اكرمه"داو "كاف"ـە، لە "اكرمك"دا، و "ياء" لە "أكرمني"دا.

**وأما الضمير المرفوع المنفصل، فمثاله، (أنا)، ( نحن)، (هو، هما، هم، هي، هن، أنت، انتما، أنتم ، أنت، أنتن)، وأما الضمير المنصوب المنفصل، فنحو، (إيّاي، إيّانا، إيّاه، إيّاهما، إيّاهم، إيّاها، إيّاهن، إيّاك، إيّاكما، إيّاكم، إيّاك، إيّاكن)، ويتحد ضمير المثنى في التذكير والتأنيث.**

---

وه بزانه، كه ضه ميرى مەرفوعى مونفەصيل ئەمانەن: (أنا)، ( نحن)، (هو، هما، هم، هي، هن، أنت، انتما، أنتم ، أنت، أنتن)، وه ضه ميرى مەنصوبى مونفەصيل ئەمانەن: (أياي، أيانا، أياه، أياهما، أياهم، اياها، اياهن، اياك، اياكما، اياكم، اياك، أياكن). وه ضه ميرى "مثنى" له "مذكر"و "مؤنث"دا وەك يەكن.

**﴿باسی ضه میر﴾**

**(ضمير): ناوێکه که دەلالەت لەسەر (متكلم)يان (مخاطب)يان (غائب)ێك دەكات ، کەپێشتر باسکراوه،وەك: (انا:من)،(انت:تۆ)،(هوَ:ئەو) .وەلە زمانی عەرەبیدا ضەمیر دوو جۆرە:**

**١ : ضەمیری جودا (منفصل):ئەو ضـه میره دەگونجێت ،ڕستەکه بەو ضەمیره دەست پێبکات .وەك: (انا جالس) ،(انت ذاهب) ،(هو ضارب).**

**٢.ضەمیری( متصل :پەیوەست): ئەو ضەمیرەیه که دەبێت لەکاتی دەربڕینیدا، بلکێنرێت بە ووشەیەکەوە ، وەك ضەمیری (ياء)لـه (کیتابی)دا و (کاف) لـه(احبك)دا ،و (هاء)لـه (له)دا.**

***ضەمیری موتتەصیل دووبەشه :**

**١. ضەمیری موتتەصیلی مەرفوع: که هەموو کات لکاوه بەفیعلەوه . هەندێ جار به فیعلەوه دەلکێت. وەهەندێ جاربەحەرفەوه دەلکێت.وه ضەمیره موتتەصیله مەرفوعەکان بریتین لـه :**

(الف) :بۆ موسەننا(واو) ،بۆ جەمع (نون) ، بۆ جەمعی مؤنث (بیاء) :بۆ موفرەدی مؤنثی موخاطەب لـە موضاریع و ئەمردا وە ضەمیرەکانی (ت- تما- تم-ت- تما- تن)، بۆ صیغەکانی موخاطەبی ماضی ، وە ضەمیری (تاء) بۆ (متکلم وحدە)ی ماضی، و ضە میری (ناء)بۆ(متکلم مع الغیر)ی ماضی، ئەم یانزدە ضەمیرە دەلکێن بە فیعلی مەعلوم و مەجهولـەوە، هەڵبەتە ئەگەر بە فیعلی مەعلومەوە بلکێن ، دەبنە "فاعیل" وە ئەگەر بەفیعلی مەجهولـەوە بلکێن دەبنە "نائیب فاعیل".

*ضەمیرە موتتەصیلە مەنصوب و مەجرورەکان بریتین لـە:

– مذکر غائب: (ە– هـما– هم).

– مؤنث غائب: (ها – هما–هن).

– مذکر مخاطب: ( ك– كـما– كم).

– مؤنث مخاطب: ( ك– كما– كن ).

– متکلم وە حدە: (ی)

– متکلم مع الغیر: ( نا)

ئەم ضەمیرانەش کە بە ئیسمەوەلکان ،دەبنە موضاف الیە، وەك :( قلمة — كتابك- كتابی )، وە ئەگەر بە فیعلەوە بلکێن دەبنە مفعول بە، وە ئەم جۆرە ضەمیرانە ، وەك:(اخذ- نصرك-ضربنی)، وە ئەم جۆرە ضەمیرانە بە حەرفەکانی (مشبە بالفعل)و حەرفە جەڕەکانەوە دەلکێن .وەك :(انك مشتاق الیە).

﴿دانانی (ضمائر) بۆچی یە؟﴾

لـەئەصڵ دا، دانانی (ضمائر) بۆ (کورت بڕی:أختصار)ـە. چونکە کورتترن لـەئیسمی ظاهیر وەلـەلایەکی ترەوە ضەمیری موتتەصیل لـەنێو ضەمیرەکاندا کورت ترو پوخت ترە لـە ضەمیری مونفەصیل ، وە تا کاتێك کە ضەمیری موتتەصیل هەبێت ئەوا هێنانی ضەمیری مونفەصیل دروست نی یە، هەر لـەبەر ئەمەش دەتوانرێت بگوترێ ، لـە

کاتی سەرپشك بووندا هێنانی ضەمیری مونفەصیل دروست نییە، مەگەر هێنانی ضەمیری موتتەصیل لەوشوێنەدا پاساو (عذر)ی هەبێت .

***نەگونجانی لکاندنی ضەمیر لەپێنج جێگادایە :**

١.ئەگەر ببێتە (عامل) لە ضەمیرێکدا کە دواکەوتبێت ،وەك: (أياك نعبد) .

٢.ضەمیرەکە حەصرکراو بێت ، واتە لەدوای (الا) ەوە،یان هەر ئامرازێکی تری حەصرە وەبێت، وەك: (ماضربك الا كأنا ) .

٣.عامیلی سەر ضەمیرەکە حەزف بێت .وەك: (اياك والاسد) کەلەئەصڵدا (بعد نفسك من الاسد ) بووە کەدوای حەزفی عامیلەکە (کاف) کەضە میری موتتەصل بووە، گۆڕا بە ضەمیری مونفەصیل.

٤.عامیلەکە ضەمیرێکی مەعنەوی بێت :وەك: (هو ضارب)، کە (هو): موبتەدا و عامیلەکەی مەعنەویە.

٥.وەیان صیفەتێك کەبوبێتە خەبەر بۆغەیری ئەوکەسەی کەصیفەتەکەی دراوەتە پاڵ جا ئەمە نیسبەت بدرێتە پاڵ ضەمیرەکە .وەك :(زيد هند ضار بهاهو). کە(زید: من هوله )،(ضارب:صیفەتەبۆ زەید ). (هند: غير من هى له) یە.

﴿دەربارەی ضمیر الشأن﴾

(ضمير الشأن):یان ضە میری (قصة) ئەوضە میرەیە کە موفرەدو غائیبە، کە هەندێ جار لەسەرەتای جوملەوە کەبەمەبەستی بەگەورە دانان "تعظیم"و"تفخیم" دێت ،کەئەم ضە میرە بەجوملەکەی دوای خۆی تەفسیر دەکرێت ، هەڵبەتە ئەگەر ئەو ضە میرە غائیبی موزەککەر بێت ، ئەوە بە(شأن) ناودەبرێت .

وەئەگەر (مؤنث) بێت بە (قصة ) ناودەبرێت، وە (ضمير الشان) لە هەندێ جێگادا بەشاراوەیی (مستتر) دێت ،وەئەم ضە میری (شأن وقصة)ـەیە، لە چەند ڕوویەکەوە لەگەڵ دیکەی ضە میرەکاندا جیاوازیان هەیە:

١- ضه میرەکانی تر بۆپێش خۆیان (ماقبل) دەگەڕێنەوە ،لەکاتێکدا کەئەم ضه میرە بۆ (مابعد) ی خۆی دەگەڕێتەوە .

٢- هیچ عامیلێك لەم ضه میرەدا عەمەل ناکات، مەگەر (أبتدائیە)یان (نواسخ الابتداء)، هەر لە سەر ئەمەش ضەمیری (شأن وقصة) نابنە فاعیل و مەفعول بە.

٣- ضه میرەکانی تر دەبنە"مثنی"و جەمع ، بەلام ضه میرەکانی (شأن وقصة) هیچ کات بە شێوەی "مثنی" و جەمع نایەن .

٤- ئەم ضەمیرە تەنها بە جوملە تەفسیر دەکریت ، وە بە موفرەد تەفسیر ناکرێت ،وەك: (هو الامیر راکب) .

٥- وەهەروەها ئەم ضه میرە بە(تابع) ی ناهێنرێت.

وە پێویستە کە (أن)ی موخەففەف لەگەڵ فیعلی(متصرف غیر جامد)دا هات، ئەم نیشانانەی لەسەر بێت، تا لەگەڵ (أن)ی ناصیبەدا جیا بکرێتەوە، وەك:

١-(سین): "علمت أن سیقوم".

(علمت): فعل وفاعل. (أن): مخفف.

(سیقوم): کە لێرەدا (سین) چووەتە سەر فیعلەکەو لە (أن)ی ناصیبەی جیا کردۆتەوە.

٢-(سوف): وەك: (أن سوف یقوم) کە (سوف)ی چووەتە سەر، ئەگەر (سوف) نەبوایە بە (أن)ی ناصیبە دادەنرا.

٣-(قد): (أن قد قمت) کە (قد) نەبوایە (أن) ناصیبە دەبوو.

٤-حرف النفی: (أن لا یقوم) کە (لا) نەبوایە، (أن) بە ناصیبە دادەنرا.

تێبینی: (مصدریةو ناصبة) یەکێکن.

مەبەست لە (کالعوض)، کە لە مەتنەکانی نەحودا بە کار دەهێنرێت، واتە: بۆ لابردنی هەڵەو گومان لە تێکەڵ کردنی (أن)ی مخفف بە (مصدریة) یان بۆ جیاکردنەوەو ناسینی (أن)ی مخفف لە شوێنی خۆی دا.

*　　*　　*

## ﴿العلـــــــم﴾

العلم: اِسم دال على معنى معين بالوضع، كأحمد، و زينب، ودلدل، وذي الفقار، وهو أن صدر بأب، أو أم، فكُنية، كأبى بكر، و أم الفضل، وألا فأن أشعر بمدح أو ذم، فلَقب كشمس الدين، و أنف الناقة، و اِلاّ فاِسم كزيدٍ وعمرو.

ويأتي مفرداً و مضافاً، كما مرّ، و مركباً مزجياً كبعلبك، و يكون منقولاً، كالفضل، و مرتجلاً، كغطفان.

---

## ﴿ناوی ناسرا و: عەلـــەم﴾

ئیسمێکە کە دەلالەت بکاتە سەر مانایەکی دیاریکراو، کە بۆ ئەوە دانرابێت وەك "أحمد، زينب" کە دوو ناون، واتادارن، و بۆ ناوی کچ و کوڕ دانراون، وە "دلدلّ" و" ذي الفقار" کە دیسانەوە ئیسمی "علم"ن ، وە ئەگەر بە "أب" و" أم" ئیسمەکە دەستی پێکرد، ئەوە "کونیه" یە. "وەك" أبى بكر"، "أبومصعب" و"أبوبصير"،و" أم الفضل"و"أم بثينة". وە ئەگەر "مدح و ذم"ی تیابەدی دەکرا، ئەوە "لقب: نازناو"ە. وەك "شمس الدين" و"أنف الناقة" وە ئەگەر نا ئیسم دەبێت، وەك "زيد وعمرو".وە بە موفرەدی موضاف دێت ، وەك ئەوانەی پێشوو، وە بەتێك هەلکێشکراوی دەبێت، وەك "بعلبك" وەیان لە فیعلەوە وەردەگیرێ وەك "فضل" وەیان بە "مرتجل : هەلتۆقیو"ی دێت، وەك "غطفان".

بزانە بۆ"مُرتجل" لەشەرحی "أنموذج"دا دەلێت: "وقد يرتجل العلم، أى يجعل من أوّل وضعه، علماً من غير أن ينقل عن شئ كغطفان، فأنه وضع أوّلاً، علماً لقبيلة، فالعلم أمّا منقول كجعفر ويزيد وأمّا مرتجل كغطفان.

واتە: هەندێ جار لە چینی "علم" ،"مرتجل" دێت، واتە هەر لەسەرەتای دانانیەوە، "علم" بووە و لەشتی ترەوە وەرنەگیراوە، وەك غطفان، کە لەسەرەتادا "علم" بووە، بۆ هۆزێك بۆیە عەلەم یان (منقول: ڕاگوێزراو،ووەرگیراو)ە، لە فیعل و ئیسم جینس وەك "یزید و جعفر" یان "مرتجل"ە، وەك "غطفان". ئەوەبوو، مانای "مرتجل".

## ﴿دریژە باسی عەلەم، وەك ئەوەی کە ئین مالیك بە شیعر، و ئیبن عەقیل بە ڕاڤە نووسیویانە﴾

اِسْمٌ یُعَیِّنُ الْمُسَمَّی مُطْلَقًا عَلَمُهُ کَجَعْفَرٍ وَخِرْنِقَا
وَقَرَنٍ وَعَدَنٍ وَ لاَحِقٍ وَ شَذْقَمٍ وَهَیْلَةٍ وَ وَاشِقٍ

عەلەم: ئەو ئیسمەیە کە (شتە ناونراوەکە و مانا بۆ دانراوەکە (المسمی) بەشێوەیەکی ڕەها دیاری دەکات، ئەمەش بەبێ (پێوە بەستن: قید)ی قسەکردن (التکلم) و قسە لەگەڵ کراو (المخاطب) و نا ئامادەبوون (الغیبە) واتە بە ڕەهایی و بەبێ هیچ بەند و باوێك مانایەك لە شتێکدا درووست دەکات، جا کە وتی: (الاسم) ئەمە جینسەو نەکیرەو مەعریفە پێکەوە دەگرێتەوە، و کە وتی: (یعن مسماە) ئیتر نەکیرە چووە دەرەوە، و کە لە پێناسەکەدا وتی: (بلا قید) ئیتر لێرەشدا سەرجەمی مەعریفەکانی لابرد، وەك ضەمیر، چونکە ضەمیر موسامەکەی دیاری دەکات، بەلام (پێوە بەستن: قید)ی قسەکەر (المتکلم)ی پێوەیە، وەك: (أنا)، یاخود پێوە بەستنی قسە لەگەڵ کراو (المخاطب)ی پێوەیە، وەك (أنت)، یان قەیدی نا ئامادە (غائب)ی پێوەیە، وەك: (هو).

پاشان دانەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ژمارەیەك عەلەمی مرۆڤ و غەیری مرۆڤ بە نموونە هێنتاوەتەوە، تا ئاگادارمان بکاتەوە لەوەی کە مانای عەلەمەکان (مرۆڤ و غەیری ئەو) لە هزر و بیری بیسەردا ڕابێن و جێگیر بن، وەك (جعفر) کە بە مانای (جۆگەلە) هاتووەو ناوی مرۆڤە، و (خرنف) واتە بەچکە کەروێشك، و دوای ئەوەیش بووەتە ناو و عەلەمی ژنە شاعیرێکی عەرەب، و خوشکی دایکی شاعیری مەزنی عەرەب (طەرفەی

کوڕی عەبدە)ە، و پاشان (قرن) ناوی هۆزی بەنی مورادە، و (عدن) ناوی شارێکە لـە کەناری دەریای یەمەندا، (لاحق) ناوی ئەسپەکەی موعاوییەی کوڕی ئـەبوو سـوفیانەو (شذقم) عەلـەمە بۆ وشترەکەی نوعمانی کوڕی مونزیر و (هیلـە) ناوی مەڕێکەو (واثیق) ناوی سەگێکە.

تێبینی: لـە دەستەواژەکەی دانـەردا (إسـم، یعـین المـسمی....) موبتەدایـە، ئـیتر چۆن ئیسمێکی نەکیرە کە (إسم)ە، ببێتە موبتەدا.؟! وەڵامەکەیش ئەوەیە کـە ڕسـتەی (یعـن المسمی) وەصفی ئەو (إسم)ەیە، و یەکێك لـەو جێگایانـەی کـە درووسـتە بـە نـەکیرە دەست پێ بکرێت، و ببێتە موبتەدا، ئەوەیە کە موبتەدا کە نەکیرەی مەوصـوفە بێـت و لەم کاتەشدا کە ڕابوارد، موبتەداکە نەکیرەیەو مەوصوفەیـشە، واتـە وەصـف کـراوە، وەك بینیمان، بۆیە دەست پێکردن پێی هیچ گرفتێکی درووست نەکردووە.

وَاسْمًا أَتَى وَكُنْيَةً وَلَقَباً وَأَخِّرَنْ ذَا إِنْ سِوَاهُ صَحِبَا

﴿ڕەچاوکردنی ڕیزبەندی لەنێوان (إسم – کنیە – لقب)دا﴾

عەلـەم دەبێت بە سێ بەشەوە (ئیسم: ناو)، (کنیە)، (لقب: نازناو) و مەبەست لـە ئیسم لێرەدا ئەوەیە کە کونیەو لەقەب نەبێت، وەك (زەید) و (عەمر)، و مەبەست لـە کونیە، ئەوەیە کە لـە سەرەتاکەوە (أب: باوك) هاتبێت، وەك: (أبو عبدالله: باوکی عبدالله) یـان لـە سەرەتاکەیەوە (أم: دایك) هاتبێت، وەك: (أم الخـیر: دایکـی خـەیر)، مەبەسـت لـە (لەقـەب: نازنـاو) ئەوەیـە کـە (مـەدح: پیاهەڵـدانی) تیـادا بناسـرێتەوە، وەك: (زیـن العابدین)، یاخود (زەم: سەرزەنشت کردن)ی تیادا بناسرێتەوە، وەك: (أنف الناقة).

دانەر لـە دەستەواژەی (وأخرن ذا....)دا ئاماژە بـەوە دەکـات کـە هـەرکات لەقـەب لـەگەڵ ئیسمدا هات، ئەوا پێویستە لەقەبەکە لـەدوای ئیـسمەکەوە بێـت، وەك: (زیـد أنف الناقـة) کـە زەیـد ئیـسمەکەیە پێـشکەوتووە، و (أنـف الناقـة) لەقەبەکەیـەو دوا کەوتووە، و درووست نییە لـەقەب پێش بخرێت بەسەر ئیسمەکەدا و بگوترێـت: (أنـف الناقە زید) مەگەر بە کەمی و دەگمەنی نەبێت، کە ئەمە ڕوویداوە، وەك ئەم شیعرە:

﴿٢٢﴾ بأنَّ ذا الْكَلْبِ عَمْرًا خَيرَهُم حَسَبَا ‌ ‌ ‌ بِبَطْنِ شِرْيانَ يَعْوِي حَوْلَهُ الذِّيبُ

که لێرەدا لەقەبی (ذا الکلب)، پێش ئیسمەکە کەوتووە، کە (عمرو)ەو ئەمەیش بە دەگمەن ڕوو دەدات.

بە ڕووکەشی قسەکەی دانەردا، وا دیارە کە هەر کات لەقەب لەگەڵ ئیسم و کونیەدا هات، دەبێت لە دوایانەوە بێت و، مەبەستی لە دەستەواژەی (سواه)، واتە: ئیسم و کونیە، و کەواتە واجبە بخرێتە دوای ئیسمەوە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ کونیەدا هات، ئەوا سەرپشکی لەنێوان ئەوەیدا کە کونیەکە پێش بخەیت بەسەر لەقەبەکەدا، وە بڵێیت: (أبو عبدالله، زین العابدین) و یاخود لەقەبەکەی پێش بخەیت بەسەر کونیەکەداو بڵێیت: (زین العابدین أبو عبدالله) هەردووکیان چوونیەکە.

وَإِنْ يَكُونَا مُفْرَدَيْنِ فَأَضِفْ ‌ ‌ ‌ حَتْمًا وَإِلاَّ أَتْبِعِ الَّذِى رَدِفْ

ئینجا لە هەندێ نوسخەی ئەلفیەدا دەستەواژەی (وذا إجعل اخرا، إذا إسما صحبا) هاتووە، لە جیاتی (وأخرون ژا إن سواه صحبا)، کە بێگومان ئەوە یەکەمەکەیان جوانترە، چونکە ئەو گرفتەی پێشەوە (کە بریتیە لەوەی کە دواخستنی لەقەب تەنها لە کاتێکدایە کە لەگەڵ ئیسمدا هاتبێت، و ئیتر دەستەواژەکەی دانەر پشتگیری لە ئیسم و کونیە پێکەوە دەکات). و ئەم گرفتە چارەسەر دەکات، و دەستەواژەی (وذا إجعل آخرا إذا إسما صحبا) مانای ئەوە دەگەیەنێت کە دواخستنی لەقەب کاتێك دروستە، کە تەنها لەگەڵ ئیسمدا هاتبێت، بەڵام دەستەواژەکەی تر وا دەگەیەنێت کە هەر کات لەقەب لەگەڵ کونیەدا هات، دواخستنی لە کونیەکەدا واجب نییە، و قسەی ڕاست و دروستیش هەر لەسەر ئەم ڕایەیە، وەك پێشتریش باسمان کرد، و ئەگەر دانەر (خوا لێی خۆش بێت) بینووسیایە: (وأخرن ذا إن سواها صحبا) بێگومان ئیتر هیچ جۆرە گرفت و دوو دڵییەك لەم بارەیەوە نەدەهاتە ئاراوە، و دەستەواژەکە بەم جۆرەی لێ دەهات: (وأخر اللقب إذا صحب سوی الکنیة وهو الإسم)، واتە: لەقەب بخەرە دواوە، ئەگەر لەگەڵ غەیری کونیەدا هات، واتە: لەگەڵ ئیسمدا هات، و دواتر ماناکەی بەم جۆرەی لێ دێت: (وأخر اللقب إذا صحب الأسم: ئەگەر لەقەب لەگەڵ ئیسمدا، ئەوا لەقەبەکە دوا بخە لە ئیسمەکە).

## ﴿توێژینەوە سەبارەت بە پێکەوە هاتنی ناو و نازناو (الاسم واللقب)﴾

ئەگەر ئیسم و لەقەب پێکەوە کۆبوونەوە، یان هەردووکیان موفرەدن، یاخود هەردووکیان مورەکەبن، یاخود ئیسمەکە مورەکەبە، و لەقەبەکە موفرەدە، یان ئیسمەکە موفرەدەو لەقەبەکە مورەکەبە.

جا ئەگەر هاتوو هەردووکیان موفرەد بوون، ئەوەتا بەڕای بەصریەکان ئیضافەکردنیان واجبە، وەك: (هذا سعيد كرز) و (مررت بسعيد كرز)، بەلآم کوفییەکان شوێنکەوتنی لەقەبەکەیان لەڕووی ئیعرابەوە بە ئیسمەکەوە (الاتباع) پەسەند کردووە، ئەمەیان بەدرووست زانیوە، واتە ئیسمەکە چ حەرەکەیەکی وەرگرتبوو، ئەوا لەقەبەکەش هەر ئەو حەرەکەیە وەردەگرێت، وەك: (هذا سعيد كرز)، و (رأيت سعيدا كرزا) و (مررت بسعيد كرز) و دانەر (بەڕەحمەت بێت) لە کتێبەکانی تریدا ئەم ڕایەی کوفییەکانی پەسەند کردووە.

جا ئەگەر هاتوو موفرەد نەبوون، بەڵکو مورەکەب بوون، وەك: (عبدالله أنف الناقه) یاخود مورەککەب و موفرەد بوون، وەك: (عبدالله كرز) و (سعيد أنف الناقه) ئەوا لەم کاتەدا وەك ئەو بوون لە حەرەکە وەرگرتندا (الاتباع) واجبە، و دووەمینیان ئیعرابی یەکەمینەکەیان وەردەگرێت، وە هەروەها درووستە دابڕاندنی لەقەبەکە، لە تابیعییەت، و شوێنکەوتە بوون، واتە بەو مانایەی کە بەشێوەی مەرفوع یان مەنصوب دەربکەوێت، وەك: (مررت بزيد هو أنف الناقه) بووە، بەلآم لە نموونەی: (مررت بزيد أنف الناقه) کە مەنصوب بووە، و فەتحە کەوتووەتە سەر (أنف) ئەم مەنصوب بوونە بە گریمانەی ئەوە کراوە، کە لە پێشییەوە فیعلێك بە تەقدیری هەیە، کە (أعني)یە، واتە ڕستەکە بەم جۆرە بووە، (مررت بزيد أعني أنف الناقه)، لەم سۆنگەیەوە لەکاتێکدا کە ئیسمەکە مەرفوع بێت، دەتوانرێت لەقەبەکە بە تەقدیری فیعلێکی شاراوە مەنصوبی بکەین، وەك: (هذا زيد أنف الناقه) وە ئەگەر ئیسمەکە مەنصوب بێت، دەتوانرێت لەقەبەکە بە تەقدیری موبتەدایەکی شاراوە مەرفوع بکرێت، وەك: (رأيت زيدا أنف الناقة) وە هەرکات ئیسمەکە مەجروور بێت دەتوانرێت لەقەبەکە لە (تابع) بوون لە ئیعرابدا دابڕدرێت، و بەشێوەی مەنصوب بە گریمانەی تەقدیری فیعل، یاخود بەشێوەی مەرفوع

بە گریمانەی تەقدیری موبتەدا بهێنرێت، وەك: (مررت بزيد أنف الناقة)، یان (مررت بزيد أنف الناقة).

وَمِنْهُ مَنْقُولٌ كَفَضْلٍ وَأَسَدْ    وَ ذُو ارْتِجَالٍ كَسُعَادَ وَأُدَدْ

وَجُمْلَةٌ وَمَا بِمَزْجٍ رُكِّبَا    ذَا إِنْ بِغَيْرِ وَيْهِ تَمَّ أُعْرِبَا

وَشَاعَ فِي الأَعْلَامِ ذُو الإِضَافَةْ    كَعَبْدِ شَمْسٍ وَأَبِي قُحَافَةْ

**﴿توێژینەوەیەك سەبارەت بە بەشەكانی عەلەم﴾**

عەلەم دەبێتە دوو بەشەوە (مرتجل) و (منقول) مورتەجەل: ئەوەیە كە پێشتر و پێش بوون بە عەلەم، نە بۆ عەلەمیەت و نە بۆ هیچ شتێكی تر بە كارنەهێنرابێت، ئەمەش بزانە كە مورتەجەل لە (إرتجل الخطبة) هاتووە. واتە كەسێك بەبێ بیركردنەوەو خۆ ئامادەكردن دەست بكات بە ووتاردان، نموونەیش بۆ مورتەجەل وەك: (سعاد: كە ناوی ژنێكە) و (أدد: كە ناوی پیاوێكە).

مەنقول: ئەوەیە كە لە غەیری عەلەمبووندا بەكارهێنرابێت، و لەوێوە نەقڵ كرابێت و گواسترابێتەوە. ئیتر ئەو گواستنەوەیەش یان لە صیفەتێكەوەیە، (واتە ئیسمی فاعیل و ئیسم مەفعول و صیفاتەكانی تر)، وەك: (حارث – حاتم – محمد – حسن)، یاخود نەقڵ كرانە كە لە مەصدەرەوە وەك: (فضل) كە پێش عەلەمییەت، لە ئەسڵدا مەصدەر بووە، و دواتر بووەتە عەلەم.

یاخود نەقڵ كرانەكە لە ئیسم جینسێكی وەك: (أسد)ەوەیە، وە بزانە كە عەلەمی وەرگیراو (منضول) لە صیفەت و مەصدەر و ئیسم جینس موعرەبە.

٤. عەلەمی نەقڵكراوەو وەرگیراو لە ڕستە، ئیتر ڕستەكە فیعلی بێت، یان ئیسمی، وەك: (قام زيد) و (زيد قائم) بەدەستەواژەیەكی تر یەكێك لە بەشەكانی (منقول) بریتیە لە مەنقول لە ڕستە واتە وەرگیراو لەڕستە، ئیتر ڕستەكەی فیعلی بێت یان ئیسمی چوونییەكە، و ئەم جۆرە ڕستانە دوای ئەوەی كە بوونە عەلەم بۆ كەسێك یان شتێك، بە هەمان شێوەی ئەسڵەكەی خۆیان دەردەبڕدرێن، و هیچ گۆڕانێك تیایاندا ڕوو نادات، وەك: (جائني زيد قائم) (رأيت زيد قائم) و (مررت بزيد قائم).

لەڕاستیدا ئەم بەشەی (منقول عن الجملە: وەرگیراو لەڕستە) سەر بە عەلەمە موڕەکەبەکانە.

## ﴿باسی عەلەمی موڕەککەب﴾

یەکێك لە بەشەکانی عەلەم، موڕەککەبی مەزجییە، وەك: (بعلبك) و (معدی کرب) و (سیبویه).

تەرکیبی مەزجی: ئەوەیە کە دوو ئیسم پێکەوە کۆکرابنەوە و درابن لە یەك، و بووبنە عەلەم بۆ یەك شت، و ئیسمی دووەم دەرهەق بە ئیسمی یەکەم وەك (تاو تأنیث)ی کەلیمە وابێت، واتە چۆن حەرفی پێش (تاء تأنیث) مەفتوحە، و هەروەها ئەو تائەیش لەکاتی نیسبەت لێداندا حەزف دەبێت، لە تەرکیبی مەزجیشدا ئیسمی دووەم وەك ئەو تائە تەئنیثەی کەلیمە وایە، واتە بەشی دووەمی ووشەکە لەکاتی نیسبەت لێداندا، حەزف دەبێت، بۆ نموونە کە دەتەوێت کەسێك خەڵکی (بعلبك) بێت، نیسبەتی ئەوەی لێ بدەیت، کە خەڵکی ئەوێیە، دەڵێیت: (بعلي)، و بەشی دووەمەکەی بەهۆی (یاء)ی نیسبەتەوە حەزف دەبێت، و هەروەها ما قەبلی ئەو بەشی دووەمە لە تەرکیبی مەزجیدا مەفتوحە وەك: (بعلبك).

ئینجا دانەر باسی ئەوەی کردووە کە لە موڕەککەبی مەزجیدا، ئەگەر بە لەفزی (ویه)ی کۆتایی هاتبوو، ئەوە موعرەب نییە، بەڵکو مەبنییە، کەواتە ئەگەر بە ((ویه) کۆتایی نەهاتبوو، ئەوە موعرەبە، وەك: (جاءني بعلبك) و (رأیت بعلبك) و (مررت بعلبك) کە دەبینین ئیعرابی (غیر منصوب)ی وەرگرتووە، و موعرەب دەبن.

– لە موڕەککەبی مەزجیدا دوو ئیعرابی تر لە ئارادا هەن:

١. لە سەرجەم حاڵەتەکاندا مەبنین لەسەر فەتحە، وەك: (جاءني بعلبك) و (رأیت بعلبك) و (مررت بعلبك).

٢. بەشی یەکەم ئیضافە دەکرێت، بۆ لای بەشی دووەم، و ئیعراب لە بەشی یەکەمدا جێ بەجێ دەکرێت، وەك: (جاءني حضرموت) و (رأیت حضرموت) و (مررت بحضر موت).

وە هەروەها مورەككەبی مەزجی بە لەفزەی (ویە) كۆتایی بێت، ئەوا لەم حاڵەتەدا مەبنی دەبێت لەسەر كەسرە، وەك: (جاءني سيبويه) و (رأيت سيبويه) و (مررت بسيويه).

وە لەم بەشەی مورەككەبی مەزجی كۆتایی هاتوو بە (ویە)دا هەندێ لە زانایان لەم حاڵەتەدا ئیعرابی غەیرە مونصەریفیان بەدرووست زانیوە، واتە كە بەشی دووەم لە حاڵەتی رەفعدا بە ضەممە، و لە حاڵەتی نەصب و جەرِدا فەتحەیان لەسەر دابنێین، وەك: (جاوني سيبويه) و (رأيت سيبويه) و (مررت بسيوبيه).

تێبینی: هۆكاری مەبنی بوونی بەشی دووەم لە (ئەوانەی كە بە (ویە)ی كۆتایی هێنان هاتووە وەك وشەكانی (سيبويه – خالويه – حمدويه)، كە مورەككەب كراون لە ئیسمەكانی (سيب – خال – حمد) و پاشگری دەنگی (ويه) بۆیە لەبەر ئەوەی كە ئیسمی صەوت (دەنگ) خاوەنی (شەباهەتی ئیهمالی)یە، لەگەڵ حەرفدا بۆیە مەبنی بووە، بەلاّم مەبنی بوونی مورەككەبی مەزجی لەسەر كەسرە، لەبەر ئەوەیە كە رەچاوی (إلتقاء الساكنين) بكرێت.

﴿باسی مورەككەبی ئیضافی﴾

یەكێكی تر لە بەشەكانی عەلەم، ئەو لەفزەیە كە بە شێوەی تەركیبی ئیضافی مورەككەب كرابێت، وەك (عبد شمس) و (أبو قحافه) و لەم بەشەی مورەككەبی ئیضافیدا، موضافەكە هەروەك موفرەد و بەگوێرەی جێگاكەی خۆی لەرستەكەدا، ئیعراب وەردەگرێت، و بۆیە سەرجەم حاڵەتە جۆر بە جۆرەكانی، وەك (موبتەدا – خەبەر – فاعیل – مەفعول...هتد) بەسەردا دێت، وەك: (عبدالله شاعر، فاز عبدالله، صاحبت عبدالله، سارعت الى عبدالله) و هەروەها وەك: (جاءني عبدشمس و أبو قحافة) و (رأيت عبدشمس و أبا قحافة) و (مررت بعبد شمس و أبي قحافة).

ئینجا دانەر لێرەدا بە هێنانی دوو نموونەی (عبد شمس) و (أبو قحافه) ویستی ئاماژە بەوە بدات كە بەشی یەكەمیان موعرەب بووە بەهۆی حەرەكەوە، وەك (عبد) و یان بەهۆی حەرفەوە، وەك (ابی) و بەلاّم سەبارەت بە بەشی ئەوەیە كە بە مونصەریف

هاتووە، وەك: (شمس) و غەیرە مونصەریف وەك: (قحافة)، چونكە (قحافة) دوو هۆكار لە هۆكارەكانی مەنع صەرفی تیادایە، كە عەلەمییەت و تەئنیشن.

وَوَضَعُوا لِبَعْضِ الأَجْنَاسِ عَلَمْ ... كَعَلَمِ الأَشْخَاصِ لَفْظًا وَهْوَ عَمّْ
مِنْ ذَاكَ أُمُّ عِرْيَطٍ لِلْعَقْرَبِ ... وَهَكَـــذَا ثُعَالَةٌ لِلثَّعْلَبِ
وَ مِثْلُهُ بَـــرَّةُ لِلْمَبَرَّةْ ... كَذَا فَجَارِ عَـلَـمٌ لِلْفَجَرَةْ

## ﴿باسی عەلەمی جینس﴾

لەلایەكی ترەوە عەلەم دوو بەشی تری هەیە (علم شخص) و (علم جنس) جا عەلەمی شەخص (ناوی تاكە كەس)، دوو یاسای لێ دەبێتەوە، بەگوێرەی یاسایەكیان مەعنەوییە، واتە مەبەست پێی خودی تاكە كەسێكە، وەك: (زەید) كە مەبەست پێی مرۆڤێكە كە ناوی زەیدە، و هەروەها وەك (أحمد) و یاساكەی تریان، عەلەمی شەخسی لەفزیە، ئەمیش ئەوەیە كە درووستە لەدوایەوە (حالّ) بێت، وەك: (جائني زيد ضاحكا) كە لەم نموونەیەدا (زەید) عەلەمی شەخصە (ناوی كەسێكە) و لەفزی (ضاحكا) بە (حالّ) ناوزەد دەكرێت، كە لەدوای عەلەمی شەخصەوە هاتووە.

وە یاسایەكی تر ی ئەم عەلەمە لەفزییە، بۆ كاتێكە كە ئەم ئیسمە (واتە ئەم عەلەمی شەخسە) لەگەڵ هۆكارێكی تری سەر بە (ممنوع من الصرف)دا كۆ ببێتەوە، كە دەبێت ئەو هۆكارە (عەلەمییەت) نەبێت و غەیری ئەو بێت، لە هۆكارەكانی مەنع صەرف، لەم كاتەدا ئەم عەلەمە غەیرە مونصەریفە، وەك: (هذا احمد) كە جگە لە عەلەمییەت، هۆكار و سەبەبی (وزن فيعل)ی تیادایە، و بۆیە بەبێ تەنوین دەركەوتووە، وە یاسایەكی تر لەم حوكمە لەفزەیانە سەبارەت بەم عەلەمی شەخسە، ئەوەیە كە ئەلف و لامی تەعریف ناچێتە سەر ئیسم گەلێكی لەم جۆرە، و بۆیە ناتوانرێت بگوترێت: (جاو العمرو). بەلاّم (عەلەمی جینس: ناوی ڕەگەزی) لەڕووی حوكمی لەفزییەوە وەك عەلەمی شەخس وایە، وەك: (هذا أسامة مقبلا: ئەمە شێرە لە هەڵمەت بردندا) وە ئەوەیش بزانە كە بۆیە بۆ (أسامە) لەفزی (هذا)ی بەكارهێناوە نەك (هذە) هەرچەندە (تائی تەئنیث) بەسەر (أسامە) جنسی شێرە، بۆیە بەكارهێنانی (هذا) بۆی هیچ گرفت و لەمپەرێك درووست ناكات.

وە حوکمە لەفزییەکانی عەلەمی شەخس، لە عەلەمی جینسیشدا هەیەو جێ بەجێ دەکرێت، بەهۆی ئەوەوە کە غەیرە مونصەریفە چونکە دوو هۆکاری تیادایە، لە هۆکارەکانی مەنع صەرف، کە بریتین لە: (عەلەمییەت تەئنیث) و هەروەها لە دوای عەلەمی جینس (حاڵ) دێت، وەك لەفزی (مقبلا) لە نموونەکەی ڕابردوودا، و هەروەها چوونە سەری ئەلف و لام بۆ سەر ئیسمی عەلەمی جینس درووست نییە، و بۆیە ناتوانرێت بگوترێت: (هذا الأسامة).

بەڵام سەبارەت بە حوکمی عەلەمی جینس، لەڕووی ماناوە لەگەڵ عەلەمی شەخسدا جیاوازە، چونکە ماناو مەدلوولی عەلەمی جینس تەنها کەسێك بە دیاری کراوی ناگرێتەوە، بەڵکو هەروەك (نەکیرە) خەڵکان و تاکێکی زۆر دەگرێتەوە. بۆیە دەتوانرێت بگوترێت کە عەلەمی جینس لەڕووی حوکمی لەفزییەوە، وەك عەلەمی شەخس وایە، و لەڕووی حوکمی مەعنەوییەوە وەك ئیسمی نەکیرە وایە.!

وە لەم سونگەیەوە (کە مەدلوولی عەلەمی جینس بۆ کەسێکی تایبەت و دیاری کراو نییە) بۆیە بۆ هەموو شێرێك، لەفزی (أسامە) و بۆ هەموو دوو پشکێك لەفزی (عقرب) و بۆ گشت ڕێوییەك لەفزی (ثعالة) بەکارهێنراوە.

## ﴿جیاوازی نێوان عەلەمی جینس، و ئیسمی جینس﴾

عەلەمی جینس بۆ پێوە بەستنەو (مقید) کردنی شتێك بە ئێستاوە هاتووە، تا لە هزری مرۆڤدا بچەسپێنرێت، بەڵام ئیسمی جینس بۆ مانای هەر شتێك هاتووە، کە چۆنە بەو شێوازە دەرببڕدرێت، واتە: (من حیث هو هو) بەبێ ئەوەی کە بەسترابێت بە کاتی ئێستاوە، بۆیە مانای عەلەمی جینس هەروەك نەکیرە خاوەنی فرە ڕەهەندی و گشتی بوونە، و تەنها کەسێك دیاری ناکات و ناگرێتەوە.

تێبینی: ڕاڤیار (گۆڕی پڕ نوور بێت) سەبارەت بە ئەحکامی لەفزی عەلەم تەنها سێ حوکمی باسکرد، و سێ حوکمی تری باس نەکرد، کە هەیەتی و بریتین لە:

١. صیفەتی عەلەمی جینس دەبێت بە مەعریفەیی بێت.

٢. عەلەمی جینس هەروەك عەلەمی شەخس دەتوانێت لە سەرەتا (إبتداء)دا بێت، وەك: (أسامة ملك الوحوش).

٣. لە ئەسڵی داناندا (وضع)دا ئیضافە کردنی عەلەمی جینس درووست نییە، و بۆیە درووست نییە بگوترێت (أسامە منا) یان (محمدنا) ئینجا بزانە کە عەلەمی جینس یان بۆ شەخس (ذات)ە، وەك: (أم عربت) کە عەلەمە بۆ دوو پشك، وە یاخود عەلەمی جینسە بۆ مانا (عین)ی شتێك، هەروەك دانەر (رحمە الله) لەدەستەواژەی (برە، للمبرة، وفجار للفجرة)دا دەری بڕی چونکە (برە) عەلەمە بۆ (مبرە: کردەوە چاکەکان) و هەروەها فجار وەك (حذام: کە مەبنییە لەسەر کەسرە) کە عەلەمە بۆ (فجرە: کردەوە ناپەسەندەکان) هەروەها وەك (سبحان) کە عەلەمە بۆ (تسبیح: بەپاك ڕاگرتنی زاتی پەروەردگار) لە هەموو کەم و کوڕییەك و هەروەها وەك (یسار) لەسەر وەزنی (فجار) کە عەلەمە بۆ (مبسرە: قوماربازی).

روونکردنەوە: لەفزی عەلەم لە دەستەواژەکەی دانەردا، کە ووتی: (ووضعوا لبعض الأجناس علم) چونکە ئەم لەفزە (مەفعول بە)یە، بۆ (وضعوا) و ئیسمی مەنصوب لەحاڵەتی وەقفدا بە ئەلفەوە (علما) دەهێنرێت، بەڵام دانەر بەم شێوەیەی نەکردووە، چونکە لێرەدا بەگوێرەی (زمانی ڕەبیعە) کاری کردووە، و ئەم هۆزی ڕەبیعەیە ئیسمی مەنصوب لەکاتی وەقفدا بە سکونی سەر (علم) دیاری دەکەن، و بۆیە وشەی (علم) لێرەدا بە سکونەوە کۆتایی هات و بینیمان.

## ﴿إسم الأشارة﴾

إِسم الأِشارة: إِسم وضع لمعنى معيّن، بواسطة الأِشارة الحسية.

وألفاظه: (ذا) للمفرد المذكر، و(ذان) لمثناه رفعاً، و(ذين) لمثناه نصباً وجرّا، و(تا)، و(تي) ، و(ته)، و(ذي)، و(ذه) للمفرد المؤنث، و(تان) لمثناها رفعاً، و (تين) له نصباً وجرّاً، ولجمعهما( أولاء) بالمدّ، و(أولى) بالقصر، ويلحقها كاف الخطاب عند بعد المشار أِليه، تقول: (ذاك)، (ذاكما)، (ذاكم)، (ذاك)، (ذاكما)، (ذاكن)، فـ(ذا)للمشارأِليه، والكاف لمعرفة حال المخاطب أِفراداً، وتثنية، وجمعاً، مذكراً، أو مؤنثاً، كما يدخل عليها، هاء للتنبيه، ويجوز زيادة اللام مع الكاف للدلالة على زيادة بعد المشارأِليه، اِلاّ في المثنى و (أولاء)، و ما دخل عليه، (ها)، فلا يقال: (ذانلك)، و لا (أولئلك)، و لا (هذلك)، ويشار بكلمة( هنا)، للمكان القريب، و(هناك) للمكان البعيد.

---

ئیسمی ئیشارە: ئەو ئیسمەیەکە دانراوە، بۆ واتایەکی دیاریکراو، کەبەهۆی ئاماژە هەستی یەکانەوە، دەردەبڕدرێ، و ئەمانەن، "ذا" بۆ موفرەدی موزەککەر "ذان" بۆ موسەننای موزەککەری مەرفوع "ذین" بۆ موسەننای ی موزەککەری مەنصوب و مەجروور "تا" و "تي"، "ته" و" ذي" ،" ذه"، بۆ موفرەدی مۆننەثە، "ثان" بۆموسەننای مۆنثی مەرفوعە، "ثین" بۆ موسەننای مۆنثی مەنصوب و مەجرورە، وە "أولاء" بۆ جەمعە ئیتر موزەککەربێت، یان مۆنث، وەهەروەها "أوی" بە (قەصر:کورت:بیّ مەدد)، واتە "أولاء" و"أولی" بۆ جەمع دەبن، وە "کاف"ی خیطابیان دەچێتە سەر، کاتێ کە ئیشارە بۆکراو دووربوو، وە "کاف" بۆ زانینی ئەوەی کە ئایا موخاطە ب "موفرەدە" یا موسەننا، یان جەمع، وە موزەککەرە، یان مۆنثە، وە هەروەها بۆدەلالەت کردن لەسەر زۆری دوریەکە، لە ئیشارە بۆکراودایە، تەنها لە "مثنی" و" أولاء"دا نەبێت،وە هەروەها لەوەدا نەبێت کە "هاء"ی

چوبێتە سەر، بۆیە ناوترێ "ذانلك"، و"أولاتلك"، و"هذلك"، وە بە (هنا) ئیشارەت بۆ نزیکیی دەکرێ وە( هناك)، بۆ دووری یە!. بۆیە ئیبن مالیك، لە ئەلفیەدا دەڵێت:

| | |
|---|---|
| بذا للمفرد المذكر أشر | بذي وذه تي تا على الأنثى اقتصر |
| وذان تان للمثنى المرتفع | وفي سواه ذين تين اذكرُ تطع. |
| وبأولى أشر لجمع مطلقاً | والمدّ أولى ولدى البعدُ انطقا |
| بالكاف حرفاً دون لام أو معه | واللام أن قدمت ها ممتنعة. |
| وبهنا أو هُهنا أشر أ لي | داني المكان و به الكاف صلا. |
| في البعد أو بثمّ فُه أو هَنّا | أوبهُنالك انطقنّ أو هِنّا. |

﴿ئیسمی ئیشارە﴾

هەر کاتێك کە بتەوێت کەسێك یان شتێك بە ئیشارەیەکی بەرجەستە (حسی)نیشان بدەیت ، ئەوە ئیسمی ئیشارە بەکار دێت بۆی ، وە ئەو کەسە یان ئەو شتە بە (مشار الیه) ناوزەد دەکرێت ،وە لەزمانی عەرەبیدا ئیسمی ئیشارە و (مشارالیه: ئاماژە بۆکراو)ەکە، دەبێت لەڕووی (مذکر)بون و(مؤنث)بوون و (مفرد) بوون و (مثنی )و (جمع) بونەوە هاوڕێکی یەکتر بن وەك: (رایت هذاالکتاب )، (حفظت هذه الکلمة).

* ئیسمی ئیشارە بەگوێرەی نزیکی و دووری (مشار الیه )یەکە سێ بەشە :

١-ئیشارەی نزیك،کە لەفزەکانی بریتین لە (ذە- ذهن- تا – تی – تە – ذە- تان- اولاء-).

٢- ئیشارە بۆ نە دوور و نە نزیك(متوسط)کە لەفزەکانی بریتین لە (ذالك-ذانك-تلك-تانك-اولئك )

هەڵبەتە وشەکانی (ذهنك- تانك-اولئك)دیسانەوە بۆ ئیشارەی (ناوەند –متوسط) بەکار دێن.

وە هەروەها بۆ ئیشارەکردن بۆ جێگای دوور لەفزی تریش بەکاردێن :

١-(ثم) :بە فەتحەی (ثاء)ی سێ نوختە ،وە لەحاڵەتی وەقف دالەگەڵ(هاء) ی (سکت )دادەوترێت (ثمة).

٢-(هنا) بەفەتحەی (هاء) و نونی شەددەدار .

٣- (هنالك) لەم ئیسمەیاندا دروست نی یە، (هاء)ی، (تنبیه )ی، پێوە بلکێنرێت، (ابن مالك)لە (نكت)دا ،كە حاشیەیە كە لەسەر (مقدمة )ی (ابن حاجب)نوسیویەتی ، ڕای وایە كە (هنالك) لە ئیشارە كردن بۆ كاتی دوور بەكار دێت ، وەبەڵگەشی ئەم ئایەتەیە، (هنالك تبلوا كل نفس ماسلفت )ـە.

- لەم بارەیەوە، ئیبن مالیك فەرموویەتی:

بِـذَا لِمُفْـرَدٍ مُذَكَّـرٍ أَشِـرْ
بِذِي وذِهْ تِي تَا عَلَى الأُنْثَى اقْتَصِرْ
وَذَانِ تَـانِ لِلْمُثَنَّى الْمُرْتَفِـعْ
وَفِي سِوَاهُ ذَيْنِ تَيْنِ اذْكُرْ تُطِعْ
وَبِـأُولَى أَشِرْ لِجَمْعٍ مُـــطْلَقَا
وَالْمَدُّ أَوْلَى وَلَدَى الْبُعْدِ انْطِقَا
بِالكَافِ حَرْفاً دُونَ لاَمٍ أَوْ مَعَهْ
وَاللاَّمُ إِنْ قَدَّمْـتَ هَـتا مُمْتَنِعَهْ
وَبِهُـنَا أَوْ هَهُـنَا أَشِـرْ إِلَـــى
دَانِي الْمَكَانِ وَبِهِ الكَافَ صِلاَ
فِي البُعْـدِ أَوْ بِثَمَّ فُهْ أَوْ هَـنَّا
أَوْ هُنَـالِكَ انْطِقَـنْ أَوْ هِـــنَّا

* * *

## ﴿التعريف باللام﴾

المعرف بالّلام، ما دَلَّ على معنى معيّن باللام سواء، كان فرداً خاصاً، نحو: الحديقة ذات أوراد جميلة، اِشارة اِلى حديقة معينة، وتسمى "لام العهد الخارجي"، أو جنساً عاماً، نحو:" الرجل خيرمن المرءة"، و تُسمى لام الجنس، و يتشعب منهما أقسام تذكر في المطولات.

---

## ﴿المعرّف بأداة التعريف﴾

**المعرف باللام:** ئەوە یە کە دەلالەت بکاتە سەر واتایەکی دیاری کراو، بەهۆی لامەکەوە، ئیتر فەردێکی تایبەت بێت وەك "الحديقة ذات أو راد جميلة" کە ئاماژەی کردووە،بۆ باخچەیەکی دیاریکراو، وە بە "لام العهد الخارجى" ناودەبرێت، یاخود بۆ "جنس"ێك بێت، بەگشتی، وەك: (الرجل خير من المرءة)، ، وە بە "لام الجنس " ناودەبرێت ، وە چەندەها بەشی لێ دەبێتەوە، لەکتێبە گەورەکاندا باس دەکرێن. وەك: ئیبن مالیك لە ئەلفیەدا دەڵێت:

**أل حرف تعريف أو اللام فقط     فنمط عرّفت قل فيه النمط.**

### ﴿ئەلف و لام لە (الحمد)دا﴾

ئەلف و لام لە (الحمد)دا ،بۆ جینسە، وەئەو موبتەدا مەعریفەیە،بۆ (حصر)ە ، وەهۆکەیشی (استغراق)کردن و (انحصار) کردنی سەرجەم سوپاس و ستایشەکانە بۆ تەنها زاتی خوایپەروەردگار.

### ﴿ بەشەکانی ئەلف و لام﴾

جا ئەلف و لام،چەند جۆرێکی هەیە ، کە بەشەکانی لێرەدا ڕوون دەکەینەوە:

"استغراق افراد الجنس" : کە ئەمە لە کاتێکدایە، کە لەفزی (کل) لە ڕووی حەقیقەتەوە بەراستی، لە جێگای ئەو ئەلف و لامەدا دابنیشێت، وەکو: (ان الانسان لفی خسر)، واتە: ( کل الانسان لفی خسر ).

"استغراق صفات افراد الجنس" : نیشانەی ئەمەش دروستی دانانی لەفزی (کل)ە، لەجێگای ئەلف ولامەکەیدا بەشێوازێکی مەجازی دابنیشێت .وەك: (زید الرجل) واتە : ( ذي کل صفات الرجل ) لەم نمونەیەدا دانانی لەفزی (کل) لەجێگای (ال) دا بەحەقیقی دروست نیە ، چونکە (زید ) هەموو پیاوی سەرزەوی نیە ، بەڵکو بەشێوەی مەجازی دروستە ، وەمەبەست ئەوەیە کەزەید سەرجەم صیفاتە چاکەکانی پیاو باشانی لە خۆیدا کۆکردوتەوە .

بۆ ڕۆشن کردنەوەیحەقیەت و چیەتی (ماهیە)ی جینسەکە : کەئەمەش لەکاتێدایە کەبەهۆی (الف) و(لام ) و ئەوشتەی کەئەم (الف)و( لام ) ەی چوەتە سەر (مدخول) ەکەوە بگەین بەماهیەتی شتێك لەڕووی (هي هي ) وەئاماژەی بۆبکرێت .واتە : لەو ڕوەوە کەئەوە ماهیەتەکەیەتی ،نەك لەڕووی شتە دەرەکیەکانەوە (الامور الخارجیة ) کە هەڵکەوتنە سەری ،وەك : (الرجل خیر من المرئة ) واتە : ماهیەتی پیاو — لەگەڵ ڕەواندنەوەی تایبەتمەندی (خصوصیت) دا — لەماهیەتی ئافرەت باشترە ، وەئەمەش لەگەڵ بەرزی و بەڕێزی هەندێ ئافرەت بەسەر پیاواندا تێك ناکاتەوە (منافاة) لەنێوانیاندا ڕوونادات .

ئەلف و لامی (عهدی ذهنی ) : وەئەمەش لەکاتێکدایە کەئەو شتەی(ألـ)ی چوەتەسەر لەتێڕوانینی کەسی (مخاطب)دا ڕوون و دیار وئاشکرا بێت،وەك : (اذهما فی الغار)، کە ئەلف و لام لە(الغار) دا ، ئاماژەو ئیشارەتە بۆ ئەوئەشکەوتەی کە پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم)و کەسێکی تر کە ئیمامی ئەبوبەکرە،"رضی الله عنه"، کە لەوێدا خۆیان حەشار دابوو .

ئەلف ولامی عەهدی (ذکر) ی : ئەمەیە کەئیشارەت بۆئیسمێکە کەپێشتر باسکرا بوو ،وەك: (کما ارسلنا الی فرعون رسولا فعصی فرعون الرسول ) کە ئەلف ولام لە (الرسول) دا ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە مەبەست لە (الرسول) هەمان ئەو ڕەسولەیە کە پێش جوملەی (فعصی فرعون ) باسکرابوو .

٧-ئەلف ولامی (زائد)ی لازم : ئەلف ولام لەهەندێ جێگادا بەزیادەیی دێت، بەلاّم لەهەمان کاتیشدا لازمە ، واتە : حەزفکردنی دروست نیە ، وەئەم جۆرە ئەلف ولامە دەچێتە سەر ئیسمێك کەبەبێ ئەلف و لامیش هەر (معرفة)ـەیە، وەك : (اللات — الان).

٨- ئەلف ولامی (زائد)ی غەیرە لازم: ئەم جۆرە ئەلف و لامەیش هەندێ کات زائیدی غەیرە لازمە، و زیاتر لە ضەرورەتی شیعریدا بەکاردێت .وەك: (ولقد نهیتك عن بنات الاوبر )کە شاعیر (بنات الاوبر )ی بە ئەلف ولامەوە گوتووە ، کە بەبێ ئەلف ولامیش هەر مەعریفەیە .

٩- ئەلف ولامی زیادەی (لمحیة) : (لمح) لەزماندا واتە :ئاماژەکردن بەچاو، بەلاّم لێرەدا مەبەست ئاماژە کردنی عەقلّی یە، وە لەم جۆرە ئەلفە دەچێتە سەر هەندێ لە ئیسمە عەلەمە مەنقولە کان (الاعلام المنقولة) تا دەلالەت بکات،کە مانای (المنقولة)یەکە دیسانەوە لە (منقول منه)ەکە، تێیدا هەیە و تێبینی کراوە وەك : (الفضل)کەلەزماندا واتە :کاملّی و تەواوی، وئەم ئیسمەیان کردۆتە ناوی کەسێك ،سا بەلّکو کەسێکی خاوەن فەزلّ دەربچێت .لەسەر ئەمەشەوە ئەلف ولام لە (الفضل) دادەلالەتە ، لەسەرئەوەی کەمانامەصدەری یەکەی (فضل) سەرەڕای بوونە (علم) وناوی کەسێك ، هەرئەومانایەی تێدا مەبەست وئامانجە .

## ﴿الموصـــول﴾

وهو إِسم دلّ على معنى، معين بواسطة جملة خبرية، بعده تسمى صلة، وهو (الذي) للمفرد المذكر، و(اللذان) لمثناه في حالة الرفع، و(اللذَيْن) له في حالتي النصب والجرّ، و(الذين) لجمعه مطلقاً، و(التي) للمفرد المؤنث، و(اللتان) و (اللتين) لمثناها، و(اللآتي) لجمعها، نحو: الذي درسنا أستاذ كبير، والذين درسوا عنده، فازوا بعلم كثير، و(من) و(ما) تستعملان بمعنى الموصولات السابقة، لكن (من) يغلب إِستعماله للعاقل، و(ما) لغيره، نحو: من طاب مقاله طابت حاله، وما قلَّ قدره هان أمره، ومنها (أل)، وتستعمل لجميع ما ذكر، وصلتها مشتق غير الفعل، نحو: الكاتب بدرسه يصعد بنفسه، والحافظون للقرآن، آخذون بزمام العرفان.

---

مەوصول: ئیسمێکە دەلالەت دەکاتە سەر واتایەکی دیاریکراو، بەهۆی جوملەیەکی خەبەریەوە کە ببێتە"صیلە" بۆی، وە "الذي" بۆ موزەککەر "اللذان" بۆ موسەننای موزەککەرە لەحالەتی مەرفوعیداو "الذین" بۆ موزەککەرە لەحالەتی نەصب و جەڕدا و "الذین" بۆ جەمعە بەگشتی وە "التی"، بۆ موفرەدی مؤنث و "اللتان" بۆ موسەننای مەرفوع "اللتین" بۆ موسەننای مؤنثە ، مەنصوب و مەجرورەکەی، "اللاتي" بۆ جەمعە، بەگشتی وەك:( الذي درسنا أستاذ كبير، والذين درسوا عنده، فازوا بعلم كثير)،ئەوەی وانەبێژمانە،مامۆستایەکی پایەبەرزە، وئەوانەی لای ئەو زانست فێربوونە، پشکێکی باشیان پچڕاندوە! وە "من "و "ما"

وەك ئەوان لە "مذكر" و "مؤنث" و "مفرد"،و" تثنيه" و" جمع"دا بەكاردێن، بەڵام بەزۆری "من" بۆعاقڵە و "ما" بۆ غەیرە عاقڵە.

وە بزانە، ئەلف و لامیش وەك ئەوانی تر بەكاردێن، وە صیلەكەیان غەیری فیعل دەبێت، بۆیە لە"الهداية في النحو"دا دەڵێت:

"والألف واللام بمعنى الذي، وصلته أسم الفاعل،أو المفعول" واته "ئەلف و لام" بەواتای "الذي"دێت، وەك ئەوانی تر وایە، وە صیلەكەی هەندێ جار "أسم فاعل" و هەندێ جار "أسم مفعول"ە. وەك:( الكاتب بدرسه يصعد بنفسه، والحافظون للقرآن آخذون بزمام العرفان).

**مەوصولی ئیسمی دوو بەشە :**

**مەوصولی (تایبەت:خاص)، مەوصولی گشتی وهاوبەش (عام – مشترك ) :**

**مەوصولی (خاص) : ئەوەیە كەبەگوێرەیجێگاكەی گۆڕانی بەسەردا دێت ،وەلەفزەكانی بریتین لە :**

**(الذی): بۆ موفرەدی موزەككەر. (اللذان): بۆ موسەننای موزەككەر. (اللذین): بۆ جەمعی موزەككەر. (التی): بۆ موفرەدی مۆنەس . جا ( الف) لە ( اللذان) و (اللتان) دا لە حاڵەتی نەصب و جەڕ دا دەگۆڕێن بە (یاء) .**

**مەوصولی (عام) یاخود (مشترك) : ئەوەیە كە هەموو كات بەتەنها یەك لەفز دەهێنرێت وە بریتین لە :**

**(من) : كەزیاتر بۆ(ذوی العقل :خاوەن عەقڵ ) دێت ، وەك: (و منهم من یؤمن به ).**

(ما) : کەزیاتر بۆ (غیر ذوی العقول : بێ عەقڵ) بەکار دێت، وەك: (و الله خلقكم وما تعلمون).

٣-( ال) : وەك : (لا تضارب — المضروب) .

٤- (ذو) لە لوغەی (بنی طی) دا ،وەك:

**فان الماء ماء ابی وجدی وبئری ذو حفرت و ذو طویت.**

**ئەو ئاوە ئاوی باوك و باو باپیرانمە وە ئەو بیرەی من ئەو بیرەیە کە بە دەوریدابەردم لێ چنیوە .**

**(ذا): لە دوای (من) یان( ماء) ی ئیستیفهام بێت ، وە (زائد) یش نەبێت، وەك: ( من ذا رایت ؟ ) .( ماذا صنعت؟ ).**

**(ای) :وەك: (یسرنی ابهم هو قادم) . وە پێویستە ئەوە بزانرێت کە ( من و ما و ابی ) بۆ ئیستفهامیش بەکار دەهێنرێن ، کە لەم کاتەدا ئیسم مەوصول نین ، بەڵکو بە ( اسم استفهام ) ناو دەبرێن ،وەك: ( من ضربت)، (ماهذا)، (ای صدیق لقیت) .**

**وە بزانە (أن، إن) بە فیعلی دێن وەك: (إن زید) زەید ناڵە ناڵیەتی. (أن یا زید) ناڵە ناڵ بکە ئەی زەید.**

**وە (إن) بە مەکسوری دێت وەك (سمعت إن زید) واتە ناڵە ناڵی زەیدم بیست.**

**وە (إن) بە حروفی إیجاب دێت، وەك: (إن هذان لساحران)، (إن)، واتە: (نعم).**

* * *

## ﴿المعرّف بالأضافة﴾

**المعرّف بالأضافة، وهو إسم دلّ على معنى معيّن بسبب الإضافة إلى إحدى المعارف السابقة، نحو: لسان العاقل، وقلمه ، علمه وعمله.**

---

**المعرف بالأضافة:** ئەو ئیسمەیە، کە دەلالەت دەکاتە سەر مانایەکی دیاری کراو، بەهۆی ئیضافەکردنیەوە، بۆلای یەکێك لەو مەعریفانەی پێشوو، کە باسکران، وەك : (لسان العاقل، وقلمه ، علمه وعمله).

ئیبن مالیك دەڵێت:

**وَغَيْرُهُ مَعْرِفَةٌ كَهُمْ وَذِي ... وَهِنْدَ وابْنِي وَالغُلاَمِ وَالَّذِي**

**واته: هەرچی غەیری ئیسمی نەکیرە بێت، بە مەعریفە ناوزەد ئەکرێت، وەك:**

(هم، ذي، هند، أبنى، الغلام، الذي).

**هەروەك باسکرا، هەرچی غەیری ئیسمی نەکیرە بێت، ئیتر ئەوە مەعریفەیـە، جا بە شێوەیەکی گشتی مەعریفەکان شەش بەشن:**

**١. ضەمیر، وەك: (هم).**

**٢. ئیسمی ئیشارە، وەك: (ذي).**

**٣. عەلـەم، وەك: (هند).**

**٤. موضاف بۆ لای مەعریفە، وەك: (أبنـی). کە باسی ئێستامانە!**

**٥. ئەلف و لامدار، وەك: (الغلام).**

**٦. ئیسمی مەوصول، وەك: (الذي).**

* * *

المعرّف بالنداء: إِسم دلَّ على معنى معين بسبب النداء، فإِن كان مفرداً معرفة، نحو: يا زيد، أو نكرة مقصودة، نحو: يا رجل لشخص معين، فَبُنِـيَ على الضمّ كما ذكرنا، وعلى الألف في المثنى، نحو: يا زيدان، و على الواو، في الجمع السالم، نحو: يازيدون، و إِن كان مضافاً، نحو: يا غلام الأمير، أو مشبهاً بالمضاف، نحو: يا ساعيا في الخير، كان معرباً، منصوبا بالفتحة، أو بالياء، وكذا إِذا كان مفرداً نكرة غير مقصودة، نحو: يا رجلا، و يا رجلين، وليعلم أن المراد بالمفرد هنا ما ليس مضافاً، و لا مشبهاً به، وحروف النداء: الهمزة، و اَي، للقريب، و يا للبعيد، و أيا، و هيا، للأبعد.

---

**المعرّف بالنداء:** ئەو ئیسمەیە کەواتایەکی دیاریکراو دەگەیەنێت، بەهۆی حەرفەکانی "نداء"ەوە، ئەگەر موفرەدی مەعریفە بوو، وەك "یازید" یان نەکیرەی مەبەست دار بوو، وەك "یارجل" کە بۆ کەسێکی دیایکراوە، ئەوا مەبنی لەسەر "ضمە"یە. وەك باسکرا، وە لەسەر ئەلفە، لە "مثنی"دا وەك (یازیدان) وەلەسەر "واو"ە، لەجەمعی موزەککەری سالمدا، وەك "یازیدون.. وە ئەگەر هاتوو موضاف بوو، وەك "یاغلام الأمیر" یان "شبه مضاف" بوو، وەك "یاساعیاً فی الخیر" ئەوە موعرەبەو مەنصوبە، بە فەتحە یان "یاء". وە هەروەها ئەگەر موفرەدی نەکیرەی (غەیر مەقصود: بێ مەبەست)، بوو، وەك "یارجلاً، یارجلین" هەر مەنصوبە، وە مەبەست لە "مفرد" ئەوەیە کە موضاف وشیبهـ موضاف نەبێت. وە حەرفەکانی نیدا، ئەمانەن "همزه"و" أی" بۆ نزیك ، و "یا" بۆ دوور، و"أیا"، و"هیا" بۆ یەکجار دوور دە بێت.

## ﴿درێـــژە باسێــك لــەبارەی حەرفەکانی نیدا﴾

ئەمانە چەند حەرفێکن، کە تەنها ئیسمێك مەنصوب دەکەن، و حەوت دانەن:

(يا، أيا، هيا، أي ، الهمزة المفتوحة، واو، إلا)

پێنج دانەیان، واتە: (يا،أيا، هيا، أي، أ) حەرفی (نداء)ن.

وە ئەوەی کە ئەمانەی دەچێتە سەر بە (مونادا) ناو دەبرێ، وەك:

(يا عبدالله) کە (يا): نیدایە، و (عبد): مونادایە، و مونادا بە هۆی حەرفی نیدائەکەوە، مەنصوبە بە سێ مەرج:

١–ئەگەر ئیسمە موناداکە نەکیرە بێت: ئەوا موناداکە مەنصوب دەبێت، وەك: (يا رجلا خذ بيدی)، کە (رجلا): مونادایە، و نەکیرەیەو بە هۆی (يا)وە مەنصوب بووە.

٢–یاخود موضاف بێت: وەك (يا عبدالله): کە (عبد): موضافە بۆ لای (الله)، وە موناداکە بە هۆی یائەوە مەنصوب بووە.

٣–یاخود (شەبیهـ بە موضاف) بێت: وەك:(يا گالعا رجلا) کە (گالعا)، (شەبیهـ بە موضاف)ـە، بۆیە مەنصوب بووە.

تێبینی: موضاریع: واتە: (موشابیهـ: هاوشێوە).

وە بزانە بۆیە بە (طالعا) (شەبیهـ موضاف) دەووترێ، چونکە (طالعا) عەمەلی کردووەتە سەر، (جبلا) و کردوویەتییە (مفعول) بۆ خۆی، و دووەمیان واتە: (جبلا) یەکەمیانی، واتە: (طالعا)ـی، (تەخصیص :تایبەت) کردووە، وەك چۆن نموونەی یەکەم، واتە:(عبدالله)کە (الله) کەلیمەی (عبد)ی تەخصیص کردووە، وە (عبد) عەمەلی کردووەتە سەر (الله)، و بووەتە (موضاف، و موضاف إليه) و مەجروری کردووە.

بزانە: هەر کاتێك کە مونادا، موفرەدی مەعریفە بوو، وەك:

١– یا زید: (زید) جاران مەضموم بوو، ئێستاش مەضمومە.

٢– یا زیدان: (زیدان): نیشانەی ڕەفعی (ألف و نون) بوو، ئێستاش هەر وایە.

٣-یا زیدون: (زیدون) نیشانەی ڕەفعەکەی (واو نون) بووە، ئێستاش هەر وایە.

بە هەر حاڵ: لەسەر (مەرفوع)یەتی پێشوو (بناء) دەکرێت.

وە مونادا بە هۆی (الفي إستغاثة)وە، مەفتوح دەبێت، وەك: (یا زیداه).

وە مونادا بە هۆی (لامی تعجب)، مەکسور دەبێت، وەك: (یا للماء)

وە مونادا، بە هۆی (لامی تهدید)ـەوە، مەکسور دەبێت، وەك: (یا لعمرِو لأقتلنك).

وە شوێن و چۆنیەتی بەکارهێنانی (حەرفەکانی نیداء) بەم جۆرەیە:

١-(الهمزة): للقريب، واتە: مونادا نزیك بێت لێتەوە.

٢-(أیا، هیا) للبعید، واتە: مونادا دوور بێت لێتەوە.

٣-(أي) للمتوسط، واتە: مونادا نە نزیك بێت، و نە دوور بێت لێتەوە.

یان بۆ (نداءعام: گشتی)، واتە مونادا دوور، یان نزیك، یان (مامناوەند) بێت، هەر دەتوانیت بە (یا) هاواری لـێ بکەیت.

٥- یان دیاری بکەیت، وەك بۆ ناوی خوای گەورە، وەك (یا فاطر السموات، یا ألله).

٦- یان لە هاوارکردندا، کە بۆ (إستغاثة- پشت پێ بەستن) بێت، کە (یا) بۆ ئەم جۆرە دیاری کراوە، وەك (یا ویلنا).

تێبینی: (الندبة): واتە گرییە، و زاری و ناڵە ناڵ!

وە بزانە: هەندێ جار حەرفی (نداء) حەزف دەکرێت، وەك: (اللهم) کە ئەصڵەکەی (یا ألله) بووە، کە (یاء) حەذف بووە، و (میم) لە کۆتایی (الله)ـەوە، زیادکراوە.

**﴿حەرفی نیداء، لەسەرەتای (منادی: مونادا)وە، حەزف دەبێت﴾**

*بزانە کە: هەندێ جار جێگای حەرفی نیدا، لەسەرەتای (منادی)کەوە بەبێ جێگا گرتنەوەیەکی تریش حەزف دەبێت، وەك: (يوسف أعرض عن هذا)، کە لە ئەصڵدا: ( يا يوسف أعرض عن هذا) بووە.

*وە بزانە کە: نیدا، بەکەسرەی نون و ئەلفی مەمدودە، مەصدەری بابی (مفاعلة)ـەیە، کە لە زماندا بەمانای خوێندن و لەزاراوەدا بریتی یە لە داوا کردنی کەسی (مخاطب)، تا بە دەستەوەبێت، بە هۆی چەند لەفزێکی تایبەتییەوە، کە کەسی (موخاطەب)، ڕوو لە کەسی (متكلم) بکات.

*وە ئەوەش بزانە، کە: ووشەی (منادی) دەبێت، (مفرد، معرفة) بێت.

(مفرد) لە بابی (منادی)دا، ئەو لەفزەیە کە (مضاف) و (شبهـ مضاف) نەبێت، وە مەبەست لە (معرفة) ئەو ئیسمەیە کە لە پێش (منادی) بووندا (معرفة) بووبێت.

دوو سوود:

یەکەمیان: بزانە کە حەرفی (نداء) ناچێتە سەر موناداپەك کە ئەلف ولامی پێوە بێت، تەنها لە (يا الله)دا نەبێت، کە (يا):نیدایە، و (الله): مونادایە، و (الـ)ی پێوەیە.

دووەمیان: بۆ (يا الرجل) ناوترێت، و دروست نی یە، بەڵکو پێویستە نێوانی (نداء) و (منادی) بە: (أي) جیا بکرێتەوە، وەك:

(يا أيها الرجل):

کە (يا): (نداء)ـە.

(أي) مونادای مەعریفەیە، وهو مضاف.

(هـ): موضاف إليه.

(رجل): صیفەتە بۆ (أي).

### ﴿كورتەیەك دەربارەی مونادای مورەخخەم﴾

كورتەیەك دەربارەی مونادای مورەخخەم، ئەوەیە كە (ترخیم) لە زمانەوانیدا،بە (ترقیق الصوت: ناسك كردنی دەنگ) دێت. وە لەزاراوەدا بریتییە لە حەزف كردنی هەندێك لە حەرفەكانی كەلیمە.

وە مونادای مورەخخەم ،واتە: ئەو مونادایەی كە لەبەر خاتری تەخفیف و ئاسانكاری حەرفی كۆتایی حەزف كراوە، هەركات ئیسمی مونادا، ئیتر گشتی تر لەوەی كە مونادا كە عەلەم بێت یان غەیرە عەلەم، بە (تاء تأنیث) كۆتایی بێت، ئەوە تەرخیم كردنی دروستە، وەك: (یا فاطمة-یا جاریة) كە مورەخخەمەكەی دەبێتە (یافاطمُ-یا جاری)، وە ئەگەرچی مونادا بە (تاء تأنیث) كۆتایی نەهاتبێت، لەكاتێكدا تەرخیم كردنی دروستە كە (اسم علم) بێت و لەسیّ حەرف زیاتر بێت، وە هەروەها ئیضافە نەكرابێت بۆ لای ئیسمێكی تر، وەك: (یا سعاد-یا طارق-یا جعفر) كە لەحاڵەتی تەرخیم دا دەبنە (یا سعا – یا طار – یا جعف).

هەروەها (ابن هشام) لە (مغنی)دا وا دەڵێ.

(الواو): بمعنی مع: ئیسمێك مەنصوب دەكات، وەك:

(استوی): فعل ماضي.

(الماء): فاعل.

(و): بمعنی مع.

(الخشبة): مفعول معه، منصوب.

* * *

## ﴿البـــاب الأول: في العمدة﴾

### ﴿الـمُـبـتــدا﴾

منها المبتدأ: وهو أِسم مجرّد عن العوامل اللفظية، مسنداً أِليه، كزيدٍ، في (زيد قائم)، أو وصف معتمد على أِستفهام، او نفي رافع لظاهر يكتفى به عن الخبر، فيكون مسندا، وما بعده مسنداً أِليه، كقائم، فى (أقائم زيد)، و(ما قائم زيد).

### ﴿الخـبـــر﴾

ومنها الخبر: وهو أِسم صريح، أو ما في تأويله مجرّد عن العوامل اللفظية، مسنداً كقائم في (زيد قائم)، وقام في (زيد قام)، فقد يكون مفرداً جامداً، كأسد، في (هذا أسد)، فلا يتحمَّل الضمير، أو مشتقاً كقائم، فيتحمَّله، و قد يكون جملة أِسمية، نحو: زيد أبوه عالـم، أو فعلية، نحو: زيد قام أبوه.

---

موبتەدا: ئە ئیسمەیە کە، عەوامیلی لەفزی ئەچێتە سەر وەك، "كان زيدٌ قائماً" کە "كان"ـەی، چوەتە سەر، وە "مسند أليه"یە، واتە: شتێکی درابێتە پاڵ.

وەك "زيد" لە ڕستە ی "زيد قائم"دا، کە "قائم"ی دراوەتە پاڵ، وە یاخود وەصفێك بێت، کە ئیعتمادی خستبێتە سەر ئەداتی ئیستیفهام،وپشتی بەو بەستبێت! وەك "قائم" لە "أقائم زيد" دا، یاخود لە "نەفی"یەکدا، کە شتێکی وامەڕفوع بکات، بە جۆرێك کە ئیتر لە بوونی خەبەر بێ نیازی بکات، وە مەبەست لە "مكتفى بە" ئەو ئیسمەیە، کە دوای وەصف دێت، وە دەبێتە "فاعل و سدّ مسدّ الخبر"ی وەصف کراو.

خەبەر: ناوێکی ڕاستەوخۆیە،یان لە سەر شێوەی ڕاستەوخۆدایە، وهیچ عوامیلێکی لە فزی لەسەر نی یە، وەك:(قائم)لە "زید قائم" دا، کە "قائم" خەبەرە، و صەریحە، وعەوامیلی لەفزیەی بەسەرەوە نی یە، وە "مسند"ە، وەك (قائم): لە ڕستەی "زید قائم"دا، وە "قام" لە ڕستە ی "زیدٌ قام"ەدا،وە جارجار بە موفرەدی جامید دێت، وەك "أسد" لە ڕستە ی "هذا أسد"دا،کە ضە میر وەرناگرێت، بەلاّم ئەگەر موشتەق بێت وەك "قائم" ضە میر وەردە گرێت، وە بە ڕستەی ئیسمی دێت، وەك "زید أبوه عالم" وە بە فیعلیی دێت، وەك "زید قام أبوه".

## ﴿یاسای گشتی لە موبتەداوخەبەر دا﴾

یاسای گشتی "قاعدة کلی"، لە موبتەداوخەبەر دا بەو جۆرەیە کە دەبێت موبتەدا لە پێش خەبەرەوە بێت وە خودی خەبەرەکە لە دواوە بێت،چونکە خەبەر لە حەقیقەتدا بۆ موبتەدا لەجێگەی وەصفدایە ، بۆیە لەبەر ئەمە لە خەبەردا هەق وایە کە دوابکەوێت ،هەروەك چۆن وەصف لە دوای مەوصوفەوە دێت ،وەك(زید العالم)کە"عالم" خەبەرە، بۆ(زید)وە لە واقیعدا دەتوانرێ بگوترێ کە وەصفە بۆی هەروەك دەگوترێ (زیدالعلم) .
بەلاّم جاری وا هەیە کە خەبەر پێش موبتەدا دەکەوێت وەجاری وا هەیە کە واجبە موبتەدا پێش خەبەر بخرێت.
ئەو جێگایانەی کە دەبێت خەبەر پێش موبتەدا بکەوێت .

ا.هەرکات موبتەدا نەکیرەو خەبەر (شبه جملە)بێت ،لە م کاتەدا واجبە کە خەبەرەکەی پێش موبتەدا بێت،وەك :(عندی درهم) لەلای من درهەمێك هەیە .

ب.وە هەروەها پێشخستنی خەبەر واجبە لە کاتێکدا کە موبتەدا کە (محصور فیه)بێت ،وەك : (ماخالق الا الله).

ج.لە کاتێکا کە خەبەر لەو ئیسمانە بێت کە دەبێت هەر لە سەرەتای ڕستەوە بێت وەك: (اين من علمته نصيرا).

د.هەرکات کە موبتەدا کە ضەمیرێك بێت کە بۆ خەبەر بگەڕێتەوە،کە لەم کاتەشدا دیسانەوە خەبەر پێش موبتەدا دەکەوێت ،وەك : (في الدار صاحبها ) کە:

(في الدار)خەبەری موقەددەمە، وە (صاحب ) موبتەدایە ودواکەوتوە، و ضەمیری (هاء)، موضاف اليه، يه.

وللسببية، نحو: ضربت بسوء أدبه، وللبدل، نحو:

**فليت لي بهم قوما إذا ركبوا شنوا الإغارة فرسانا و ركبانا**

وە بۆ "سەبەبیەت"هۆکار، بە کار دێت ،وەك"ضربت بسوء أدبه"لەبەر بێ ئەدەبی لێیم دا.

"ضربت"فیعل و فاعیلە.

"بسوء"جارومەجرورە ، و موتەعەللیقە بە (ضربت)وهو مضاف.

"أدب"مضاف أليه.، وهو مضاف.

"الهاء" مضاف أليه.

**فيجب أن يكون فيها ضمير رابطٌ له بالمبتدأ كما ذكرنا، إلاّ إذا كان متحداً، مع المبتدأ في المعنى، نحو: كلامي الله حسبي، وقد يكون ظرفاً، نحو: زيد أمامك، أو جاراً ومجروراً، نحو: الأمام في المحراب، والعامل فيهما فعل عام عند بعض النحاة، ووصف عام عند آخرين، فهو حصل، أو حاصل، و يجوز الأخبار بظرف المكان عن إسم المعنى، نحو: العلم في الصدور، و عن إسم العين، نحو: العلم فوق القصور، وبظرف الزمان عن الثاني دون الأول، إلاّ إذا أفاد بأن يحصل وقتاً دون وقت، فلا يقال زيد في الربيع، ويقال الورد في الربيع.**

---

بۆيه پێویسته ضه میرێك هەبێت كه خەبەر ببەستێتەوە بە موبتەداوە، چونكه (لأن الجملة مستقلة بنفسها فلو لم يكن فيها ضمير يربطها ألى المبتدأ، لكانت أجنبية عنه: چونكه ڕستەكە خۆی له خۆیدا سەربەخۆیە، وئەگەر ڕاناوێك نەبێت كەبە موبتەداكەیەوە ببەستێتەوە، ئەوا نامۆیی لیّ دەنیشێت!)، وەك له "شرح أنموذج"دا وادەڵێت. تەنها لەكاتێك دا نەبێت، كه خەبەر و موبتەدا، له واتادا وەك یەك بن، لەوێدا، پێویستی به ضه میر نی یه، وەك "كلامی الله حسبی".یاخود وەك "نطقی الله حسبی وكفی" كه "منطوقی الله حسبی وكفی " بووە. وە هەندێ جار "ظرف" دەبێته "خەبەر" وەك "زید أمامك" كه "زید" : موبتەدایه و "أمامك": ظه رفه و خەبەرە. وە هەندێ جار "جارو مەجرور" خەبەر دەبێت، وەك "الأمام في المحراب" كه "الأمام": موبتەدایه. "في المحراب": خەبەرە. وە عامیلی سەر موبتەداو خەبەر لەلای هەندێ له زانایانی نەحو: ئەفعالی عامە، و لەلای هەندێكی تر، "وصف عام"ە، كه ئەویش "حصل و حاصل"ە. وە دروسته "ظرف مكان" لەسەر "أسم معنی" بێت،و ببێته خەبەر وەك :"العلم فی الصدور" وە یاخود، ئیسمیی عەین بێت، وەك" العلم فوق القصور"، وە دروسته ظه رفی زەمان خەبەر بێت، له "ئیسمیی عەین" دا، نەك له "ئیسمی مەعنا"دا، و ەك "الورد فی الربیع" كه بۆ "أسم عین"ە، وە "زید فی الربیع" دروست نی یە، تەنها لەكاتێكدا نەبێت، كه سودی هەبێت. وەك ئیبن مالیكیش له ئەلفیەكەیدا دەڵێت.

**ولا يكون أسم زمان خبرا عن جُثة، وأن يفد فأخبرا.**

**والأصل في المبتدأ أن يكون معرفة، وفي الخبر أن يكون نكرة، وقد يأتيان معرفتين، نحو: القلب مرآة القلب، و نكرتين، نحو: كوكب ظهر في الجوّ، والأصل في المبتدأ التقديم، و في الخبر التأخير، كما ذكرنا، وقد يجب تقديم المبتدأ، نحو: من أبوك؟ وقد يجب تأخيره، نحو: أين هو؟ و يجوز حذف كلّ منهما للقرينة. فتقول: في المدرسة... إِذا قيل: أين الأستاذ؟ والأستاذ، إِذا قيل: مَن في المدرسة؟**

**و يجب حذف الخبر بعد (لولا) الأِمتناعية غالباً، نحو: لولا الإِسلام لهلك الأنام، أي: لولا الإِسلام موجودٌ، وبعد واو عينت معنى المصاحبة، نحو: كلّ رجل وشأنه، وبعد خبر نص في القسم، نحو: في ذِمَّتي لأجتهدن في الخدمة، وقبل حال، لا يجوز أن يكون خبراً، نحو: جهدي في تعليم التلميذ طالباً.**

---

ئەصلّ لەموبتەدا، دا ئەوەیە، کە مەعریفە بێت و لە خەبەردا ئەوەیە کە نەکیرە بێت، وە هەردوکیان بە "معرفة"یش دێن، وەك "القلب مرآة القلب: دلّ ئاوێنەی دلّە!" وە هەردوکیان بەنەکیرە یی دێن، وەك "کوکب ظهر في الجوّ" وە ئەصلّ لە موبتەدا، دا پێش کەوتنە، و لە خەبەر دا دواکەوتنیەتی، وەك باسکرا، وە هەندێ جار: پێش کەوتنی موبتەدا واجبە وەك "من أبوك" وە هەندێ جار:دواکەوتنی واجبە؟ وەك "أين هو" ، وە هەندێ جار: حەزفی هەردوکیان دەبێت، بەهۆی بوونی نیشانەوە، بۆ نموونە: کە دەڵێیت: "في المدرسة" ئەمە بۆکاتێکە پێت بووترێ :"أين الأستاذ" وە یاخود دەڵێیت: "الأستاذ" کە بوترێ :"من في المدرسة؟". وە دوای "لولا"ی "أمتناعية" حەزفی خەبەر واجبە، وەك: "لولا الأسلام لهلك الأنام" کە خۆی "لولا الأسلام موجود" بووە، وە دوای "واو" کەواتای "مصاحبە"ی هەبێت، وەك: "کلّ رجل وشأنه" کە "واو" بەمانای موصاحەبەیە، وە لەکاتی دەقی "قسم: سوێند"دا، کە نیشانەیەك هەبێت ، کە ئەو قەسەمە حەزف بووە، وەك "في ذمتی لأجتهدن في الخدمة" کە "قسمی" حەزف بووە. وە پێش "حال" دروست نی یە، خەبەر هەبێت، وەك "جهدی في تعليم التلميذ طالباً".

و يجب حذف المبتدأ ، إذا أُخبر عنه بقسم، نحو: في ذِمَّتي لأفعلن، أو بمصدر ناب عن فعله، نحو: سمع وطاعة، أي حالي سمع، أو بما بعد نِعْمَ، و بِئسَ، نحو: نعم الرجل زيد، أي: هو زيد، على قول، أو بنعت قطع عن منعوته، نحو: الحمد لله أهل الحمد، أي: هو أهل الحمد، و يجوز تعدد الخبر مع العطف وبدونه، وكذلك المبتدأ مع العطف فقط، وَ أِمّا، نحو: زيد أِبنه عالـم، فليس مما نحن فيه، وقد يدخل عليهما الناسخ.

---

## ﴿ئەو شوێنانەی کە حەزفی موبتەدایان، تیاداپێویستە﴾

یەکەم: ئەوەی کە لەزانا "الفارسی"یەوە، وەرگیراوە، ئەوەیە کە لە"في ذمتي لأفعلن"دا، لە "في ذمتي"دا ئەوە هەیە، کە خەبەرە، بۆ موبتەدایەکی مەحزوفی (واجب الحذف) وە لەتەقدیردا، "في ذمتي يمينٌ"ە، یان ئەوەی لەمە دەچێت، بۆیە ئەو شوێنەی بەهۆی قەسەمەوە، خەبەردرابوو، موبتەدا حەزف دەکرێت.

دووەم: ئەوەیە، کە مەصدەر لەجێی فیعل دانیشتبیّ، وەك "سمع و طاعة" واتە "حالي سميعٌ" یاخود "صبرٌ جميلٌ" کەلەتەقدیردا "صبر صبرٌ جميلٌ"ە، کە "صبری" موبتەدایە، وە "صبر جميل "خەبەرە، بۆیە" صبری " موبتەدایە ویە واجبی حەزف کراوە.

سێیەم: یان خەبەر تایبەت کرابێت، بە "نعم و بئس"ەوە، وەك "نعم الرجل زيد" کە "هو زيد" بووە، وە "بئس الرجل عمرو" کەلێرەدا "زید، عمرو" خەبەرن بۆ موبتەدای مەحزوف، بەواجبی و لە تەقدیردا، "هو زيد"ە، واتە: مەدح کراوەکە، و "هو عمرو"ە: واتە زەم وسەرزەنشت کراوەکە.

چوارەم: یان صیفە یەك کە لە مەوصوفەکەی دا بڕابێت، وەك "ألحمدلله أهل الحمد، کە "هو أهل الحمد" بووە، یان "مررتُ بزيد الكريم" و" مررتُ بزيد الخبيث" وە "مررتُ بزيد المسكين"، کە لەم نمونانەدا موبتەدا مەحزوفە، بە واجبی، وەلەتەقدیردا. "هوالكريم، وهو الخبيپ، وهو المسكين"ە. وە دروستە چەند خەبەرێك بەشوێن یەکدا بێن، ئیتر حەرفی عە

طفیان لەگەڵ دا هاتبێت، یان نا........وە موبتەدا دروستە چەند دانەیەك بێن، بەڵام دەبێت، عە طفیان لەبەیندا بێت: وەك "زیدٌ أبنه عالمٌ فلیس مما نحن فیه" وە موبتەداو خەبەر ناسیخیان دەچێتە سەر، وەك باسیان دەکەین، "أن شاءالله تعالی".

## ﴿باسی موبتەدا،و خەبەر﴾:

قاعیدەی ئەصڵی لەسەر ئەوەیە کە موبتەدا (معرفة)،وە خەبەر (نكرة) بێت ، چونکە تاشتێك زانراوو ناسراو نەبێت ئەوا هەواڵ و خەبەردان لەێی شتێکی دروست و ساغ نیە . لەو جێگایانەدا کە خەبەردان لە (نكرة) سودی هەبێت ، ئەوە (نكرة) بوونی موبتەدا کە یە، بەبێ کێشەو گیرو گرفت وە سودەکەیشی بەچەند شتێك دێتە دی بەم شێوەیە :

١.خەبەرەکەپێش بکەوێت (خبر مقدم ) : لە کاتێکدا کە ظەرف یان جارومەجرور (مختص: تایبەت کراو )بێت ، وە ظەرف لەکاتێکدا (مختص) ی پێ دەڵێن کە ئیضافەکرابێت بۆلای (معرفة) وەك : (عند زید نمرة: لەلای زەید پڵنگێك هەیە ) وە هەر بەم شێوازەش جارو مەجروریش لە کاتێکدا (مختص)ی پێ دەوترێت کە (مجهول)بێت، وەك : (فی الدار رجل : لەماڵەکەدا پیاوێك هەیە ) .

٢.لەفزی ئیستیفهام پێش بخرێت بەسەر ئیسمی (نكرة ) دا: وەك :( هل فتی فیکم : ئایا لاوێك لای ئێوە هەیە ).

٣. لەفزی"نەفی" پێش ئیسمی (نكرة) بکەوێت: وەك : ( ان لم تکن خلیلنا فماخلیل لنا : ئەگەر ئێوە خۆشەویستمان نەبن، ئیتر ئێمە خۆشەویستمان نیە .

٤.(نكرة)ەکە، مەوصوف بێت: واتە : ئەگەر بۆ ئیسمە نەکیرەکە سیفەتێك بهێنین ئالەم کاتەدا ئەو ئیسمە نەکیرەیە دەبێتە موبتەدا، وەك: (ولعبد مؤمن خیر من مشرك ) لێرەدا ئاگات لێ بێت کەلە هەندێك جێگادا هەرچەندە نەکیرە یش وەصف کراوە بەڵام

دەست پێکردن (ابتداء)پیّ ی دروست نیە ، چونکە وەصف کردن سودی نیە بۆیە هەر سیفەتێك کە سودی نەبوو، وەك : ( رجل من الناس جائنی ) کە (رجل) هەرچەندە بە ( من الناس) وەصف کراوە، بەلاّم ئەم صیفەتە سودی نیە، چونکە هەموو کەس دەزانێت (رجل) لە (الناس )ە، بۆیە سیفەتی (من الناس )لەبەرئەوەی کەبیّ سودە و رێگا نادات، کە سەرەتا (ابتداء) بە نەکیرە بکرێت .وەهەربەم شێوازەش دروست نیە کە (ابتداء) بەنەکیرە بکرێت . ئەمە ئەگەر لە نەکیرە کەدا مانای وەسف هەبێت وەك: (رُجَیْلٌ عندنا ) واتە:" رجل حقیر عندنا".

**٥.نەکیرە یەك کە(عامل) لەدوایەوە بێت:** وەك: (رغبة فی الخیر خیر ) کە لەم نمونەیەدا (رغبة) مەصدەرە، وە لە (فی الخیر)دا عەمەلی کردووە ،چونکە ( فی الخیر ) لە مەحەلدا مەنصوبە ، لەبەر ئەوەی کە مەفعول بە ، بێت بۆ (رغبة) .

**٦.ئیمسە نەکیرەکە موضاف بێت** : واتە : بۆ ئیسمێکی تر ئیضافە کرابێت .لەم کاتەدا بونە (مبتداء ) ی، دروستە . وەك:(عدل ساعةخیر من عبادة ستین سنة)

**٧.نەکیرەکە خاوەنی مانای( تعجب)بوون بێت:** وەك:( مااحسن زید ).

**٨.نەکیرەکە لەپلەی (دوعا ) دابێت:** ئەمە لەوەش زیاترە کە تەنها لەخەیر و چاکەدابەکاربێت وەك: (سلام علی ال یاسین ) وەیان لە شەڕو خراپەدا بەکاربێت وەك: ( ویل للمطففین).

**٩.نەکیرەکە (اسم شرط) بێت:** وەك: (من یقم اقم ) .

**١٠.نەکیرەکە وەلاّمی پرسیارێك بێت:** وەك: (من عندك ): کێت لایە ؟ لە وەلاّمدا بلّێت : (رجل ) واتە : (رجل عندی) .

**١١.نەکیرەکە لەفۆرێکی گشتی (عام ) بێت:** واتە: ئەگەر لە ئیسمیی نەکیرەکەوە مانای گرتنەوەی سەرجەم ئەو ئەفرادانە بفامرێتەوە ، ئەوەتا لەم کاتەدا بوونە موبتەدای نەکیرە کە دروستە .وەك: (انسان خیر من بهیمة).

**١٢.ئەمەیان ئیسمە نەکیرەکە دوای (اذا )ی (فجائیة: کتوپڕی ) بێت: وەك:** (خرجت فاذا رجل بالباب ) .

**١٣.وەیان دوای (واو) ی حالیە بێت: وەك:**" سرینا، و النجم قد اضاء ": **تەواوی شەو دەڕۆیشتین ، لەحاڵێکدا کەئەستێرەیەك ڕووناکی دەدا .**

**١٤.جێگیر** (ثابت)**بونی خەبەر بۆموبتەدایەك بێت:ئەمەلەکارەناعادەتیەکاندا ، وەك :** "شجرة سجدت وبقرة تکلمت" **چونکە سوجدەبردنی درەخت و قسەکردنی مانگا شتێکی ناباوە ، بۆیە لەم دوو نمونەیەدا** (ابتداء ) **بە نەکیرە دروستە .**

**﴿مەڕفوع بوونی موبتەدا، بە هۆی ئیبتیدائیەتەوەیە؟﴾**

**هەندێك لە زانایانی زانستی نەحو، ڕایان وایە کە مەڕفوع بوونی موبتەدا، بە هۆی ئیبتیدائیەتەوەیە، وهەندێکی تریش وتویانە، "أبتداء":بریتی یە لە دانانی ئیسم لە سەرەتای ڕستەوە، تابەم هۆیەوە خەبەری بۆ دابنرێت و خەبەری لەسەر بدرێت، وەهەندێکی تر ڕایان وایە کە مەڕفوع بوونی، خەبەریش دیسانەوە بە هۆی ئیبتیدائیەتەوەیە، چونکە ئیبتیدا،پێویستی وداواکاری بۆ موبتەدا وخەبەر هەیە، وبۆیە لە هەردوکیاندا عەمەلی کردووە، هەڵبەتە ئەگەر کەمێك سەرنج بدەین، ئەم قسەیە،ڕاست نی یە، چونکە بە هێزترین عامیلیی سەر فیعلیش ناتوانێت، دوو ئیسم مەڕفوع بکات، ئیتر چۆن ئیبتیدا،کە عامیلێکی مەعنەوی ولاوازو زەعیفە ئەتوانێت، دوو ئیسم مەڕفوع بکات؟!وەزانا"مبرد"یش،ئەڵێت:کە ئیبتیدائیەت وموبتەدا، هەردوکیان پێکەوە مەڕفوع کەری خەبەرن.**

**وە کوفیەکانیش وتویانە:موبتەداوخەبەر،وەك ژن بە ژن، ڕەفع بە ڕەفعیان کردووە، واتە، موبتەدا خەبەری مەڕفوع کردووە، وخەبەریش موبتەدای مەڕفوع کردووە.**

*** موبتەدا دوو جۆرە:**

**یەکەم**:موبتەدایەك کە ناوی شتێکە "أسم ذات"،وهیچ عامیلێکی لەفزی کاری لە سەر نەکردووە، وئیسنادیشی بۆ پاڵ دراوە، وەك:"زید قائم"،وکەمەرجی ئیسنادبوون"مسندألیه"، لە گەڵ گیراوە، وئیتر فاعیل وفیعلی موضاریع دەچنە دەرەوە،چونکە فاعیل"مسندألیه"یە،بەلاّم عەوامیلی لەفزی کاری لەسەر کردووە، وە فیعلی موضاریع عەوامیلی لەفزی لەسەرە، بەلاّم"مسندألیه"نی یە، بەلّکو"مسندبه"یە.

**دووەم**:موبتەدای وەصفی یە، کەلەدوای نەفی وئیستیفهامەوە دێت، وەئەم بەشە دووەمەی موبتەدا کاتێك عەمەل دەکات،کە صیفەتەکە دەبێت حەتمەن ڕەفع کەری ناوێکی ئاشکرا"أسم ظاهر"بێت، وەك:"ماقائم الزیدان"،"أقائم الزیدان". "هەمزە": هەمزە ی ئیستیفهامیە یە."قائم":ئیسم فاعیلە وموبتەدایە. "زیدان": فاعیلە و، سد مسد الخبر.

وەئەو صیفەتەی کەلەدوای نەفی یان ئیستیفهام بێت، ودەبێت ڕەفع کەری ئیسمێکی ئاشکرا بێت، دەبێت خاوەنی چوار شێوازو خەسڵەت بێت، کە سیّ شێوازیان دروست ویەك شێوازیان نادروستە،بەم جۆرە:

١.صیفەت وئیسمەکەی دوای،هەردوکیان موفرەد بن، کەلەم حاڵەتەشدا دوو شێواز دروستە، وەك: "أقائم زید"، لەم نمونەیەدا ئەتوانین بلّێین : "قائم" : موبتەدایە . "زید":فاعیلە،وسدمسدالخبر.وەهەروەها دروستیشە بلّێین" "قائم": خەبەرە و، پێشکەوتوە.و"زید":موبتەدایەو دواکەوتوە.

٢.صیفەتەکەموفرەد بێت،و ئیسمەکەی دوای، ئەو صیفەتە موسەننا یاخود جەمع بێت، کەلەم حاڵەتەدا تەنهایەك شێوازلە ئارادا هەیە، وەك: "أقائم

الزيدان". "أقائم الزيدون"،كە"قائم":موبتەدايە. "الزيدان"،" الزيدون": فاعيلە، و سد مسدالخبر.

٣.صيفەت و ئيسمەكەی دوای هەردوكيان هاوشان وموتابيق بن، كەلەم شێوازەدا تەنهايەك حاڵەت دروستە، ، وەك: "أقائمان الزيدان"."أقائمون الزيدون"،(قائمان)،(قائمون): خەبەرن،و پێشكەوتون. (الزيدان)، ( الزيدون): موبتەدان،و دواكەوتون.

٤.يەك شێواز هەيە، كەلەسەرجەمی ئەوچوار شێوازەدا دروست نی يە،ئەمەش لە حاڵەتێكدايە كەصيفەتەكە موسەننا ياخود جەمع بێت، ئيسمەكەی دوای موفرەد بێت، وەك: "أقائمان زيد"،يان"أقائمون زيد"،وەهۆكاری نا دروست بوونی ئەم حاڵەتەی كۆتايی ئەوەيە كە صيفەتەكە ڕەفع كەری ئيسمە زاهيرەكە نی يە، بەڵكو ڕەفع كەری ضە ميرە، وە ئەگەر بڵێين، صيفەتەكەخەبەری موقەددەمە،وئيسمەكەی دوای موبتەدای پاشكەوتەيە،لەم كاتەداموبتەداو خەبەرەكە پێكەوە، هاوڕێكی وموتابيق بوونيان نەنواندوە.

**خەبەر سێ بەشە:**

١-خەبەری ئيبتيدائی: كە ئەمەيان لە كاتێكدايە كە موخاتەب سەبارەت بە خەبەرەكە بێ ئاگابێت، لەم كاتەدا خەبەرەكە بەبێ ئەداتی تەئكيد دەهێنرێت، وەك: (أبوك صادقٌ) (قدمُ الحاجُّ).

٢-خەبەری (طلـبي): كە ئەمەشيان لەكاتێكدايە كە موخاتەب ئاگاداربێت، بەڵام دوودڵی و ڕاڕايی سەبارەت بە خەبەرەكە هەبێت، جا لەم كاتەدا باشتر وايە كە خەبەرەكە لەگەڵ ئەداتی تەئكيد ،دا بهێنرێت، وەك: (إنّ أخاك ناجحٌ في الإمتحانِ).

٣-خەبەری ئینکاری: کە ئەمەشیان لەکاتێکدایە کە کابرای موخاتەب سەبارت بە خەبەرەکە ئینکاری بکات، لەم کاتەدا خەبەرەکە بە گوێرەی پلەی ئینکارییەکەی کابرا پێویستە موخاتەب بەیەك یان چەند ئەداتێکی تەئکید جەختی لەسەربکاتەوە، وەك: (والعصر إنّ الإنسان لفي خُسْرٌ).

پاشان (إنشاء) لە زمانەوانیدا بە مانای (أيجاد: بەدیهێنان) دێت و لە زاراوەدا، (أنشاء) ئەو کەلامەیە کە ئاشکراکەری شتێکی خاریجی نییە بەڵکو موتەککەللیم وا دەنوێنێت، کە ناوەڕۆکیگوتەکەی بە لەفزی خۆی دەربڕیوە، بۆیە هەر لەمەشەوە، جوملەی ئینشائی، ڕاست و درۆی بۆ نییە، جا هەرکات مەبەستی موتەککەللیم لە جوملەی ئینشائی بەدی هاتنی مەبەستێك بوو، ە بە گومانی موتەکەللیم لەکاتی قسەکردنەکەدا بوونی نەبووە، ئەوە بە (أنشاء طلبي) ناوزەد کراوە، وە (أنشاء طلبي)یش بۆ پێنج جۆر دابەش کراوە:

١-ئەمر: کە داوای کردنی کارێك لەکابرایەکی ژێر دەستە دەکرێت، لە ڕووی (أستعلاء: بەرزێتی)یەوە دەلالەت بکات، وەك خوای گەورە بە (سیدنایحیی)،"علیه السلام"، دەفەرموێت:(خُذِ الكِتابَ بقوّة).

جا هەرکات موخاتەب لەگەڵ موتەکەللیم دا لە پلە و شان و شکۆدا وەك یەك بوون، ئەوە داواکردنی کارەکە لێی بە (ألتماس) ناوزەد دەکرێت، وە ئەگەر موخاتەب لە موتەکەللیم ڕێزدارتر بوو، ئەوە بە (سؤال) ناودەبێت، جا (فالأمر من الأعْلى و الدّعاء من الأدنى والألتماس من التساوى).

٢-نەهی: کە بەڵگە دەبێت لەسەر نەکردنی کارێك، وەك: (ولا تقربوا الصلوة وأنتم سكارى).

٣-ئیستیفهام: کە دەلالەت دەکات لەسەر داواکردنی زانینی شتێك، و لە عەرەبیدا دوو حەرفی ئیستیفهامی (هل و همزة "ان") و چەند ئیسمێکی ئیستیفهامی تر بونیان هەیە.

بەڵام هەمزەی ئیستیفهام بۆ (تصوّر) و (تصدیق)یش هێنراوە، وەك: (أزيدٌ قائمٌ أم عمر، أهذا أخوك؟).

بەڵام (هل)ی ئیستیفهامیە تایبەتە بە (تصدیق)ەوە، وەك. (هل الرّجل قادمٌ).

٤-"تمنّي": کەبریتی یە لە خواستنی شتێك کە خۆشەو جێگای ئارەزوومەندی بێت ، وەك: (ليت زيدٌ حاضِرٌ).

٥-"نداء": کە داواکردنی شتێکە، و بانگخوازکردنیەتی، وەك: (وناديناهُ أن يا إبراهيم قد صدّقت الرّؤيا).

هەڵبەتە (إنشاء غير طلبي) جۆری زیاتری هەیە، لەوانە (مدح و ذم و تعجّب)ـە، بەڵام باسکردنی سەرجەم جۆرەکانی، درێژ برِی یەو لە چوار چێوەی باسەکەمان دەردەچین و خوێنەریش نارِەحەت دەبێت، و بیریشی ماندوودەبێت، بۆیە لە کورتیدا برِیمانەوە.

## ﴿نـــواسِخُ الـمُـبـتـدأ، والـخَـبَـر﴾

## ﴿الـحُروف الـمُـشبَّه بالفِعْلِ﴾

فمن النواسخ: الحروف المشبهة بالفعل: وهي: إنّ، وأنّ، وكأنَّ، ولكنّ، وليت، ولَعلّ، تنصب المبتدأ إسماً لها، و ترفع الخبر خبراً لها، فإنَّ، وأنَّ للتَأكيدِ، نحو: إنَّ العلم أساس العمل، وعلمتُ أنَّ العمل يحتاج إلى القُوة، وأن لا تغير الجملة بعدها، وأَنَّ بالفتح تغيرها، فتؤولها بالمصدر، فيكون معنى قولك، (علمتُ أنّكَ قائمٌ)، (علمتُ قيامك ثابتاً)، فتقرأ بكسر الهمزة في إبتداء الكلام، نحو: إنّ النَّجاة في الصدق، وبعد ألاّ لِلْإستفتاح، نحو: ألا إنَّ الإنصاف من أحسن الأوصاف، وفي ماكانت مقول القول، نحو: (قال إني عبدالله)مريم: ٣٠

---

﴿حەرفەکانی موشەبیهـ بیلفیعل﴾

بە "نواسخ" ناسراون و ئەمانەن: (أن ، أن ، كأن، لكن، وليت ولعلّ)، موبتەدا مەنصوب دەکەن وە دە یکەنە ئیسم بۆ خۆیان و خەبەر مەرفوع دەکەن و دەیکەنە خەبەر بۆ خۆیان، (أن وأنّ) بۆ تەئکیدە، وەك، "أن العلم أساس العمل" بێگومان زانست بنەمایە بۆ کردەوە، وە "علمت أن العمل يحتاج ألى القوه" بێگومانە کە کردەوە پێویستی بەهێز هەیە، وە ڕستەی دوایان گۆڕانی بەسەردا نایەت، وە (أن)ی، مەفتوحە، ڕستە دەباتەوە سەر تەئویلی مەصدەر وەك" علمتُ أنك قائمٌ" کە لە تەئویلی مەصدەردا "علمتُ قيامك ثابتاً" بووە. وە "أن" بە کەسرەی هەمزە دەخوێنرێتەوە، کە لەسەرەتای کەلامدا، وەك: "أن النجاة في الصدق" وە دوای "ألا" کە بۆ دەست پێ کردن بێت، وەك: "ألا أن الانصاف من أحسن الاوصاف" وە لەدوای لەفزی "قال"ە وە، وەك "قال أني عبدالله". وە ئیبن مالیك لە ئەلفیەکەیدا دەڵێت:

**لأن أنّ ليت لكن لـــعلّ   كأنّ عكس مالكان من عمل**

**كأنّ زيداً عـــالمٌ بأني   كفؤٌ ولكن أبنه ذوضغن.**

وراع ذالترتيب ألا في الذي كليت فيها أو هنا غير البذى.

وە دەڵێت:

فاكسر في الأبتداء وفي بدء صله وحيث أن ليمين مكملة.

أو حكيت بالقول أو حلت محل حال كزرته، وأنى ذو أمل

وكسروا من بعد فعل علقّا... باللام كاعلم أنه لذ وتقى.

* * *

**كما تقرأ بفتحها إذا وقعت الجملة معها في موضع المفرد، كما إذا كانت في موضع الفاعل، نحو: بلغني أنّكَ مسافر، أو المفعول، نحو: إعتقدتُ أنّكَ صالح، أو المبتدأ، نحو، عندي أنّكَ عالِم.**

**وكأنَّ للتشبيه، نحو: كأنَّ المال يد العامل، و لكِنَّ للإستدراك، أي: دفع التوهم الناشئ من الكلام السابق، نحو: القول سهل، ولكن العمل صعب.**

**و لَيت للتمنى، أي طلب المحال، أو ما في حكمه، نحو: ليت الشباب يعود، ولعل للترجي، أي طلب ما يمكن، و يقرب حصوله، نحو: لعل المنهج يتبدل بالأحسن.**

---

وە (أنّ) بە مەفتوحی دەخوێنرێتەوە، ئەگەر ئەو ڕستەی کەلەگەڵیدایە، کەوتە جێگای "مفرد"ێك وەك ئەوەی بکەوێتە جێگای فاعیل، وەك (بلغنی أنك مسافر)، یاخود جێگای مەفعول، وەك (أعتقدت أنك صالح) یاخود جێگای موبتەدایەك: وەك (عندی أنك عالم).

(كأن) بۆ "تشبیە: چواندن" بەکاردێت، وەك (كأن المال يد العامل)،(لكن) بۆ "أستدرك"ە، واتە لابردنی وەهمێك کەلەڕستەی پێشوودا هەبووە، وەك "القول سهلٌ، لكن العمل صعبٌ".

(ليت) بۆ "تمنی: خۆزگە خواستنی شتێك کە هاتنی مەحاڵە"دەبێت، یاخود لەحوکمی دا خوازی دایە، وەك:

ليت الشباب يعود يوما فأخبره بما فعل المشيب.

**وەشڵەی گەنجیەکەم گێڵێوە دماوە شکات و پیریم کەردێ جە لاوە.**

"لعل" بۆ: ئومێدەواری یە، بۆ ئومێدکردنی شتێك کە نزیکە بێتە دی، وەك "لعل المنهج يتبدل بالاحسن".

**﴿"دەربارەی هەمزەی"أن"﴾**

**هەمزەی (أن) لە هەندێ کاتداواجبەکە مەفتوح بێت ، وەلە هەندێ کاتیشدا واجبەکە مەکسور بێت ، وەلە غەیری ئەو دوو کاتەدا (جائز الوجهين)ـە،واتە مەفتوح کردن و مەکسور کردنی چونیەکە ، بەم شێوازە :**

## ﴿دەربارەی هەمزەی(أن)﴾:

هەمزەی (أن) لە هەندێ کاتدا، واجبە کە مەفتوح بێت، و لە هەندێ کاتیشدا واجبە کە مەکسور بێت، و لە غەیری ئەو دوو کاتەدا (جائز الوجهین)ـە، واتە: مەفتوح کردن، و مەکسورکردنی چونیەکە، بەم شێوازە:

### ﴿هەمزەی (أن) لە حەوت جێگادا مەفتوح دەبێت﴾

١- (ان) و ئەوەی لە دوایەوە دێت، ئیسم و خەبەرەکەی، فاعیل دێت، وەك: (اولم یکفهم انا انزلناه)، لە کاتێکدا کە مەعمولی (أن) تەئویل بۆ مەصدەر دەکرێتەوە، و دەبێت بە: (اولهم یکفهم انزلنا ایاه).

٢- (ان) لەگەڵ ئیسم و خەبەرەکەیدا ببنە نائیب فاعیل، وەك: (قل اوحی الی انه استمع نفر من الجن)، کە (انه استمع نفر)، دەبێتە نائیب فاعیلی (أوحی) کە لە کاتێکدا کە ببرێتەوە سەر تەئویلی مەصدر دەبێتە:(أوحی استماع نفر)

٣- (أن) لەگەڵ ئیسم و خەبەرەکەیدا ببنە مەفعول، وەك : ( و لا تخافون انکم اشرکتم)، کە (انکم اشرکتم)، دەبێتە مەفعول بِهِ، بۆ (لا تخافون)، کە لە کاتێکدا ببرێتەوە، سەر تەئویلی مەصدر دەبێتە: (لا تخافون اشراککم ) .

٤- (أن)، و ئەوەی لەدوایەوە دێت، ببێتە موبتەدا، وەك: ( و من ایاته أنَّكَ تری الارض خاشعة) .

٥- (أن)، و ئەوەی کە لە دوایەوە دێت، ببێتە خەبەر، بۆ شتێك کە لە ڕووی ماناوە ئیسم بێت، و ئەو شتە لە ماددەی (قَوْلْ) نەبێت، وەك:(أعتقادی انك عالم)،کاتێك کە دەبرێتەوە سەر تەئویلی مەصدر دەبێتە :(أعتقادی علمك حاصل).

٦-(أن)، و ئەوەی لە دوایەوە هاتووە، مەجرور بن،کە دەبێتە دوو بەشەوە:

أ: مەجرور بە هۆی حەرفەوە، وەك ئەم دێڕە شیعرە:

وَاعْلَمْ وَأَيْقَنْ أنَّ مِلْكَكَ زائِلٌ      وَاعْلَمْ بِأَنَّ كَما تُدينُ تُدانُ.

وە هەروەها وەك: (عجبت من أنك قائم)،کە ببرێتەوە، سەر تەئویلی مەصدەر دەبێتە: (عجبت من قیامك)، و هەروەها وەك ئەم ئایەتە:﴿ ذَلِكَ

بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ هُوَ الْبَاطِلُ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ(٦٢)﴾.

ب: مەجرور بالاضافة، وەك: (أنه لحق مثل ما أنكم تنطقون).

٧-(أن): و ئەوەی کەلە دوایەوە دێت، تابیعی یەکێك لەمانە: (فاعیل، نائیب فاعیل، مەفعول، موبتەدا، خەبەر، مەجرور) بێت، وە تابیع لەم کاتەدا، یان مەعطوفە، وەك:( يَابَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُوا نِعْمَتِي الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ)، مەعطوفە لە سەر (نعمتی)، و (نعمتی):مەفعول بِهِ، دەبێت بۆ (اذکروا)، لە کاتێکدا کە ببرێتەوە سەر تەئویلی مەصدەر، دەبێتە (اذکروا نعمتی وتفضیلی أیاکم).

**﴿لە سێزدە جێگادا هەمزەی (أنَّ) مەکسور دەبێت﴾**

١-ئەگەر لە سەرەتای کەلامەوە بێت، وەك:(أنا أنزلناه فی لیلة القدر).

٢-لە دوای مەوصولەوە بێت، وەك: (جائنی الذی أن أباه عالم).

٣-لەدوای جینسی(قول)ـەوە،بێت، وەك: (قال أنی عبدالله).

٤-لە دوای (قسم:سوێند)ـەوەوبێت، وەك:(والعصر،أِن الانسان لفی خسر).

٥-(لام) بچێتە سەر خەبەری (أن)ـە، وەك: (قالوا نشهد أنك لرسول الله).

٦-لە دوای(ثم)ـەوە، وەك:(ثم أن علینا بیانه).

٧-دوای(کلا)، وەك: (کلا أنهم عن ربهم).

٨-دوای ئەمر کردن، وەك:(ذُق أنك أنت العزیز الحکیم).

٩-لە دوای نەهی کردن، وەك: ( لا تحزن أِن الله معنا).

١٠-لەدوای دۆعاکردن ونزا، و پاڕانەوە، وەك: (ربّنا إننا آمنا).

١١-دوای (نداء: هاوارکردن)، وەك: ( یا لوط إنا رسل ربك).

١٢-لەدوای (حیث) وەك: (إجلس حیث أن زیداً جالس).

١٣-ئەگەر (أن)، لە پێش ڕستەی (حالیة)ـەوە بێت، وەك:(زرته إني ذو أمل).

**﴿لەچوار جێگادا (جائز الوجهين)ـە، و فەتح و کەسر دروستە﴾**

١– لە دوای (أذا)ی، (فجائیە)، وەك: (خرجت فإذا أن زيداً واقفٌ).

٢– لە دوای (قسم:سوێند)ێك، کە بە دوایدا (لام) نەهێنرێت، وەك: (حلفتُ انكّ كريمٌ).

٣– لە دوای (فائی جەزائیة)، وەك: (من جائني فإني أكرمهُ).

٤–هەرکات (أن) ببێتە خەبەر، بۆ (قَوْلْ)، وە خەبەری (أن)یش، هەر (قَوْلْ) بێت: وەك: (خير القول، أنى أحمد الله).

**﴿حاڵەتەکانی "كأن"﴾**

وە (كأن) بۆ (تشبيه – چواندن) بەکاردێت، وەك: "كأن زيدا الاسد".

وە هەندێ جار تەخفیف دەبێت و ئیتر عەمەل ناکات، وەك:

ونحر مشرق اللون كان ثدياه حقان.

(واو): بمعنى (رب). (نحر): أسم مجرور

(مشرق): اسم فاعل. (اللون):

(كأن): موخەففەفەیە ، و عەمەل ناکات.

(ثدياه): ئەگەر (كأن) عەمەلی بکردایە، دەبوایە (ثدييه) بهاتایە بە مەنصوبی.

چوارەم: حەرف لە حەرفەکانی "مشبە بالفعل" "لكن"ەیە، کە بۆ هەست پێ کردن بە کار دەهێنرێت.وەك" " زەید هات بەڵام عەمر نەهات. (جاء) فیعلی ماضی یە (نون) نون الوقایە (یاء) لە مەحەللی نەصبدا مەفعول بە غەیرە صەریحە (زید)فاعیلە (لكن) حەرفی موشەبیە بالفعلە (عمروا)ئیسمەکەیەتی (لم)جازمە (يجیء) فیعلی موضاریعە ،وفاعیلەکەی ضەمیری شاراوەی "هو"ەیە ، کە بۆ "عەمر" دەگەڕێتەوە. وە ڕستەی "يجیء" لە مەحەللی ڕەفعدا خەبەری "لكن"ەیە.

مەبەستی ئێمە: "لكن"ەیە، کە ئیسمی مەنصوب و خەبەری مەرفوع کردوە.

**﴿حاڵەتەکانی "لکن"﴾**

(لکن) بۆ (إستدراك: هەست پێکردن )بەکاردێت، وە دەکەوێتە نێوان دوو بڕگەی جیاواز لە یەکترەوە، وەك:" جاءني زيد لكن عمروا لم يجيئ".

وە (لکن) مخفف دەکرێت وە بە (مخفف)ی عەمەل ناکات.

وە بزانە لەو کاتەدا کە (لکن)ە (مخفف)ـە دروستە (واو)ی عاطفە یان (إعتراضیە)یەی لەگەڵدا بێت، وە لەم (واو)ەدا ئیختیلاف هەیە هەندێکیان بە (عاطفە)ی دادەنێن، وە هەندێك بە (إعتراضیە).

(إعتراضیە): ئەو (واو)ەیە کە لە نێوان دوو جوملەدا بێت و جوملەی دوای (واو)ەکە لابەری شك و گومان بێت لەسەر جوملەی پێش (واو)ەکە.وەك :

"وما كفر سليمان ولكن الشياطين كفروا".

(ما): نافية. (كفر): فعل ماضي. (سليمان): فاعل.

(و): عطف یان إعتراضیە. (لكن): حرف مشبه بالفعل.

(الشياطين): اسم لكن. (كفروا): فعل و فاعل.

مەبەست ئەوەیە لێرەدا کە پێش (لکن) (واو)ي عطف یان إعتراضیە هاتووە.

[باسی لیت]

لیت الشباب یعود یوما فأخبره بما فعل المشیب.

وشڵەی کەنجیەکەم کێڵێوە دماوە شکات و پیریم کەردێ جە لاوە.

(لیت): حەرفی موشەبیە بالفعلە

(الشباب): ئیسمی (لیت)ەیە.

(يعود): فيعلى موضاريعه وفاعيلەکەی (هو)ەيە.وبۆ"شباب"دەگەڕێتەوە. وە ڕستەی "يعود" لە مەحەللی ڕەفعدا خەبەری "ليت"ەيە. (يوما) ظەرفە و مەفعول فيه يە. (ف): عاطفە،و بۆ جەوابی (ليت)ە، هاتووە

(أخبر): فيعلى موضاريعی"متكلم وحده"يە،لە لەفزدا مەنصوبە بە هۆی "أن"ێکی "مقدر"ەوە، و فاعيلەکەی ضەميری شاراوەی (أنا)يە.

(هـ):مەفعول بە.وە"أخبره"لە تەئويلی مەصدەردا و لە مەحەللی نەصبدا عەطفە بۆ ئيسمی "ليت"ە، لە بە تەقدير گرتنی ڕستەی "فأخبارى أياه ثابت"دا. (بما): جار ومجرور، متعلق بـ(أخبره).

(فعل): فيعلى ماضي يە. (المشيب): فاعيلە.وە مەفعول بە حەذف كراوە. وە ئەصڵەکەی "فعله"بووە. وە جوملەی(فعل المشيب): صيلەيە بۆ (ما)ی مەوصولە.

مەبەستی ئێمە: "ليت"ەيە، کە ئيسمی مەنصوب کردووەو خەبەری لە مەحەلدا مەرفوع کردووە.

## ﴿ باسی (لعل)﴾

(لعل) دووشێوازی هەيە: شێوازی يەکەم (لعل) بە مانای (ئومێدەواری)يە، هەروەك خوای گەورە لە سورەتی (طه)دا دەفەرموێت: (لعلّه يتذكرُ أو يخشى: ئەی موسى و هارون لەگەڵ فيرعەون دا بەنەرم و نيانی قسە بکەن، ئومێد هەيە کە بێدار بوبێتەوە، يان لە خوا بترسێت). وە شێوازيی دووەم: (لعل) بەمانای (گوايا) دێت، وەك خوای گەورە لە سورەتی (شعراء)دا دەفەرموێت: (وتتخذون مصانع لعلكم تخلدون) هود بەگەلەکەی خۆی وت: ئێوە بە جۆرێك کارگەو جێگاکان بەهێز دروست دەکەن، کە گوايا وا دادەنێن کە بەهەتا هەتايەو جاويدانی دەمێننەوە.

## ﴿حاڵەتەکانی "لعل"﴾

(لعل) بۆ (ترجی: رجا کردن)ە، وەك:" لعل زيدا فاضل"

وە (لعل) زۆر لوغەی هەیە، (ئیمامی سیوطی) ١٣ لوغەی بۆ داناوە.

یەکێك لە لوغەتەکانی (لعل) (علّ)یە، وەك ئەم ئایەتە:

"علك تارك بعض ما يوحى"

(علّ): موخەففەفی (لعل)یە: حرف مشبه بالفعل. (ك): اسم (لعل).

(تارك): خبر (علّ). (بعض): مفعول به بۆ (تارك) وهو مضاف

(ما): موصوله، مضاف إليه. (يوحى): فعل وضميره (نائب فاعل).

**ئیعرابی شیعرەکە:**

(لا): ناهيه. (تهين): فعل وفاعله (أنت). (الفقير): مفعول.

(علّ): مخفف (لعل). (ك): اسم (علّ).

(أن): ناصبه. (تركع): فعل وفاعل محلا مرفوع، خبر (علّ).

جوملە ی (أن تركع) لە" تأويلي مصدر"دا دەبێتە (علك ركوعك يوما).

(يوما): مفعول به (تركع). (و): حاليه. (الدهر): مبتدأ.

(قد): تحقيقيه. (رفع): فعل وفاعله (هو). (ه): مفعول.

ئەم جوملەیە (محلا مرفوع) خەبەرە بۆ (الدهر).

## ﴿هۆی لێکچوونی پیتەکانی موشەببیە بیلفیعل بە ئیسمەوە﴾

هۆی (مشابهە، لێکچوون)ی ئەم پیتانە، بە ئیسمەوە لە دوو ڕووەوەیە:

١-لەفظي: چونکە (ثلاثي:سێ پیتی)،( رباعي:چوار پیتی)، (خماسي:پێنج پیتی)ن،وەك: (أن): کە سێ پیتی یە و (كأن):چوار پیتی یە و، (لكن):، بە (مەددی لام و تەشدیدی نون):پێنج پیتی یە .

وە (مبنی علی الفتح)ن، زۆر جار وەك (بأن) کە (باء)ەکە مجروری ناکات، چونکە (مبنی علی الفتح)ـە.

وە لە ڕووی (ادغام)ەوە وەك فیعلەکان وەهان، وەك (أن) لەسەر وەزنی (برّ)، وە (أن) لەسەر وەزنی (مدّ).

٢-معنی: چونکە بە مەعنای:

١-حققت: سابتم کرد.

٢-شبهت: تەشبیهم کرد.

٣-استدرکت: هەستم پیّ کرد.

٤-تمنیت: خواستم.

٥-ترجیت: ئومێدم کرد.

بـــــەم مانایـــــانە دێـــــت.

﴿ئەو باسی لێکچوونە بە درێژ تر﴾

هۆی ناونان و هەروەها لێك چوونی ئەم حەرفانە بە فیعل ئەوەیە کە ئەم حەرفانە لە چەند ڕویەکەوە لە فیعل دەچن:

١-شەباهەت لە ژمارەدا، لێکچوونی ئەم حەرفانە بە فیعل لە ژمارەی حەرفەکاندایە، واتە: هەروەك چۆن فیعل خاوەنی سیّ حەرف و چوار حەرف و پێنج حەرفە، ئەم حەرفانەیش هەر هەمان تایبەتمەندیان هەیە.

٢-شەباهەت و لێکچوون لە فیعل لەڕووی ئەوەوە کە (مبنی علی الفتح)ن.

٣-لەڕوی (وزن)ەوە، دیسانەوە ئەم حەرفانە لێك چونیان لەگەڵ فیعلدا هەیە.

٤-لێك چوونی ئەم حەرفانە بە فیعلەکان، لەڕووی ماناوە چونکە (أن) و (أنّ) بەمانای (حَقَّقْتُ) وە (کأن) بەمانای (شبهتُ) و (لکنّ) بەمانای (أستد رکتُ) و (لعل)

بەمانای (ترجیتُ) وە (لیت) بەمانای (تمنیت) دێت، وە لەهەندێ کتێبی تردا دوولێکچوونی تریش با سەرکراون:

١-(أختصاصا) بونی ئەم حەرفانە بە ئیسمەکانەوە، وەك: (أفعال الناقصة) و (أفعال المقاربة) و (أفعال القلوب).

٢-لە چوونە سەری ئەم حەرفانە بۆ سەر موبتەداوخەبەر،وەك: (أفعال الناقصة والمقاربة والقلوب). هەر لەمەشەوە دەتوانرێ بگوترێ، کە لێکچوونی ئەم حەرفانە بە فیعلەوە بەم شێوازەیە:

أ-(عملية).

ب-(بنائية).

ج-(عددية).

د-(معنوية).

هـ-(إختصاصية).

و-(دُخولية).

## ﴿ما، و لا المشبهتان بِلَيْسَ، و إِنْ، وَ لاتَ﴾

ومنه (ما)، و (لا) المشبهتان بليس، فإِنَّهُما ترفعان المبتدأ إِسماً لهما، و تنصبان الخبر خبراً لهما، بشرط أن لا ينتقض النفى بألاّ، نحو: ما زيدٌ إِلا قائم، وأن لا يتقدم الخبر على الإِسم، نحو: ما قائم خالد، وأن لا يُزاد بينهما، و بين المعمولين، (إِن) أو (ما)، نحو، ما إِن زيدٌ عالم، و لا ما عمرو كريم، نحو: ما الفاضل كاذباً، و لا كاذبٌ فاضلاً.

ومنه إِنْ، نحو: إِنْ زيد قائماً، و لات بشرط دخولها على الأوقات، وحذف أحد جزئى معمولها، نحو: (ولات حين مناص)ص:٣، أى: و لاتَ الحين حين مَناص، و يشترط في عملهما ما مرّ من شروط (ما)، و (لا).

---

## ﴿باسی"ما"، و"لا"ی موشەبیهـ بە"لیس"ـە، و باسی "أن" و"لات"﴾

(ماولا)ی موشەبیه بە(لیس)ە، سەربە نەواسیخن کە موبتەدا مەرفوع دەکەن و دەیکەنە ئیسم و خەبەر مەنصوب دەکەن و دەیکەنە خەبەر بۆ خۆیان، بەمەرجێك بەهۆی "ألا"وە، نەفی یە کە نەسڕدرێتەوە، وەك "مازید ألا قائم" وخەبەر پێش ئیسم نەکەوێت، وەك "ما قائم خالد" و "ما و أن" نەکەوێتە نێوان (ما و لا) و مەعمولەکانیان، وەك (ما أن زید عالم و لا عمرو کریم). وە نمونەی (ماولا) وەك (ما الفاضل کاذباً، ولا کاذب فاضلاً).

### ﴿ باسی (ما) و (لا) المشبهتان ب، (لیس)﴾

(ما) و (لا) المشبهتان ب، (لیس):

هۆی لێکچوونی (ما و لا) بە (لیس)لە بەر سێ شتە:

١–چونکە (ما و لا) وەك (لیس) بە مانای نەفی دێن.

٢–چونکە (ما و لا) وەك (لیس) سەر (مبتدأ) و( خبر) دەچن.

٣-چونکە (ما و لا) وەك (لیس) ئیسم مەرفوع و خەبەر مەنصوب دەکەن.

* بـــــزانـــــە: (ما) زیاتر (مشبه) بە (لیس)یە لە (لا)، چونکە (ما) بۆ (نفی حال) دێت، بە پێچەوانەی (لا) وە، (ما) بە موتلەقی عەمەل دەکات، کەچی (لا) تایبەتە بە نەکیرەوە، بەڵام (ما) عەمەل دەکاتە سەر نەکیرەو مەعریفەیش.

﴿عەمەلکردنی (ما)ی موشەبیە بە (لیس)ە﴾

(ما)ی موشەبیە بە (لیس)ە، کاتێك عەمەل دەکات کە، ئەم مەرجانەی خوارەوەی تیادا هاتبێتە دی:

١-نەفی کردنی ئەو خەبەرە بەهۆی (ألا)ەوە، نەکسەی بەسەردا نەهێنێت، وەببێتە هۆی ئەوەی کە نەفی بونەکەی لە دەست بدات، چونکە لەکاتی هێنانی (ألا)دا عەمەلەکەی ئیلغا دەبێتەوە: وەك: (ما هذا إلا بشرٌ مثلنا).

٢-لەکاتێکدا (ما) عەمەل دەکات، کە خەبەرەکە پێش (أسم)ەکە، کە وتبێت، چونکە ئەگەر خەبەر پێش بکەوێت.

ئەوا لەعەمەل کردن دەکەوێت، وە خەبەرەکە لەسەر حاڵەتەکەی خۆی بە مەرفوعی دەمێنێتەوە، وەك: (لا قائمٌ رجلٌ).

٣-لەدوای حەرفی (ما) حەرفی (أن)ی، زائیدە نەهاتبێت، چونکە ئەگەر (أن)ی زیادە بلکێت بە (ما)وە، ئەوا لە عەمەل کردنی دەخات، وەك: (ما إن زيدٌ قائمٌ).

وە هەروەها عەمەل کردنی حەرفی (لا)، لە چەند جێگایەکدایە بەم جۆرە:

١-نەفی کردنی خەبەرەکەی بەهۆی (ألا)ەوە تێك نەدرێت، وەك: (لا أحدٌ أفضل منك).

٢-خەبەرەکە پێش ئیسمەکە نەکەوتبێت: وەك: (لا شئ على الارض باقياً).

٣-ئیسم و خەبەرەکە هەردوکیان نەکیرە بن، وەك: (لا رجلٌ حاضرٌ)، بۆیە ئەگەر یەکێك لەو دوو مەعمولانە، مەعریفە بن، ئەوا ئەوەی تریان نابێتە (عامل: کارکەر)، وەك: (لا زيدٌ قائمٌ ولا زيدٌ الافْضلُ).

نمونه،وەك: (ما زيد قائما):

(ما): نافيه. (زيد): معرفه واسم (ما).

(قائما): خبر (ما).

(ما): نافيه. (أحد): نكره، اسم (ما). (خيرا): خبر (ما).

نموونه بۆ (لا):" لا رجل أفضل منك"

(لا): نافيه. (رجل): نكرة و اسم (لا). (أفضل): خبر (لا).

لێرەدا دروست نی یە، بلێیت (لا زيد أفضل منك)، بەڵكو تايبەته بە نەكيرەوە.

## ﴿لا لنفي الجنس﴾

ومنه لا النافية للحكم عن الجنس، فوجب دخولها على النكرات، وتنصب المبتدا إسماً، وترفع الخبر خبراً لها، فإن كان الإسم مضافاً، أو شبيهاً به، فهو منصوب، نحو: لا غلام نفس ناجح، ولا صاحب خسة راجح، و إن كان مفرداً بني على الفتح، لتضمن معنى من، نحو: لا مخلص ممقوتٌ، و لا محق مبهوت، وشاع حذف الخبرعند القرينة.

---

## ﴿باسی(لا) بۆنەفی جینس﴾

یەکێکی تر لەنەواسیخ (لا)یە، کە لەحوکمدا بۆ نەفی جینسە، وە سەر نەکیرە دەچێت و موبتەدا مەنصوب دەکات و دە یکاتە ئیسم و خەبەر مەرفوع دەکات و دەیکاتە خەبەر بۆخۆی، ئەگەر ئیسم موضاف یان شیبهـ موضاف بوو مەنصوبی بکە، وەك: (لا غلام نفس ناجح)، (ولا صاحب خسة راجح)، وە ئەگەر موفرەد بوو ئەوە مەبنی یە لەسەر فەتحە، چونکە مانای (من)لەخۆی دەگرێ، وەك (لا مخلص ممقوت، ولا محق مبهوت).

## ﴿الأفعال الناقصة﴾

ومنه الأفعال الناقصة، وتوصف بها لكونها لا يتم بمرفوعها، وتبقى ناقصة، حتى يضم إليها منصوبها، وترفع المبتدأ إسماً لها، وتنصب الخبر خبراً لها، وهي: كان:، و تَدُلُّ على ثبوت خبرها لإسمها في الزمان الماضي، نحو: كان الكهل صبيا، و صار: و تَدُلُّ على إنتقال إسمها من شخصية إلى شخصية أخرى، نحو: صار الماء هواء، أو من صفة إلى أخرى، نحو: صار المتكبرّ هباء، وأمسى: وتدلّ على ثبوت خبرها لإسمها في المساء، نحو: أمسى الصائم مسروراً عند الأفطار، وأصبح: و تَدُلُّ على ثبوت خبرها لإسمها في الصباح، نحو: أصبح القانع واسع القلب، وأضحى: و تَدُلُّ على ثبوت خبرها لإسمها في الضحى، نحو: أضحى المبكر قريباً من المنزل.

---

## ﴿باسی ئەفعالی ناقیصە﴾

یەکێکی تر لەنەواسیخ، ئەفعالی ناقیصە یە، وە بۆیە بەناقیصە ناسراون، چونکە بەمەرفوع تەواو نابن و پێویستیان بە مەنصوب هەیە، وە موبتەدا مەرفوع دەکەن و دەیکەنە ئیسم و خەبەر مەنصوب دەکەن و دەیکەنە خەبەر بۆخۆیان، و ئەمانەن، (کان): بۆ جێگیرکردنی خەبەرەکەیە، بۆ ئیسمەکەی لە زەمانی ڕابردودا،وەك: (کان الکهل صبیا). وە (صار): بۆ دەلالەت کردنە لەسەر گواستنەوەی ئیسمەکە لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر،وەك:( صار الماء هواء). یان وەصفەکە لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر،وەك: (صار المتكبرّ هباء)، (أمسى): بۆ جێگیرکردنی خەبەرە لەئێوارە،دا.وەك: (أمسى الصائم مسروراً عند الأفطار). (أصبح): بۆ جێگیرکردنی خەبەرە لە بەیانیدا،وەك: (أصبح القانع واسع القلب). (أضحى): بۆ جێگیرکردنی خەبەرە لەچێشتنگادا.وەك:( أضحى المبكر قريباً من المنزل).

**وظلّ: و تَدُلُّ على ثبوت خبرها لإسمها في النهار، نحو: ظلَّ الكاسب مستغنياً عن الناس، وبات: و تَدُلُّ على ثبوت خبرها لإسمها في الليل، تقول: بات زيدٌ نائماً، ومادام: لتوقيت مدلول جملة بمدة ثبوت خبرها لإسمها، نحو: الإنسان خائف مادام خائنا، وما زال: وما فتيء: وما برح: وما إنفكّ: وكلها تَدُلُّ على إستمرار ثبوت خبرها لإسمها، ويجب تقدم نفي، أو شبهه عليها، نحو: مازال العاقل ناطقاً بالخير، وما فتِيء المحسن محبوباً للغير، ومابرح المؤمن منشرح الصدر، ومإنفك الأمين جليل القدر، وليس: لنفي الخبر عن الإسم في الحال، نحو: ليس العمر، إلاّ وسيلة للتعمير.**

---

(ظلّ): بۆ جێگیرکردنی خەبەرە لەڕۆژدا، وەك: (ظل الكاسب مستغنياً عن الناس). (بات): بۆ جێگیرکردنی خەبەرە لەشەودا.وەك: (بات زيدٌ نائماً). (مادام): بۆدیاری کردنی دەلالەتێکە لەسەر ئەوەی کە ئەو خەبەرە لەسەر ئیسمەکە دەمێنێتەوە، بۆ ماوەیەك،وەك:( الأنسان خائف مادام خائنا). وە (مازال، مابرح ، مافتىء، ماأنفك) بەبێ (ما)ی نەفی نابن،وە بۆ بەردەوامی ئەو خەبەرە دەبن لەسەر ئیسمەکە،وەك:(مازال العاقل ناطقاً بالخير)،( وما فتىء المحسن محبوباً للغير)، و(مابرح المؤمن منشرح الصدر)، و(ماأنفك الأمين جليل القدر)، (ليس): بۆنەفی خەبەرە لەسەر ئیسمەکە لەئێستادا.وەك: (ليس العمر ألا وسيلة للتعمير).

**﴿ باسی (الافعال الناقصه) ﴾**

*** (ألافعال الناقصة) : موبتەدە مەرفوع دەکەن و ئەمە لە ڕووی تەشبیه بە فاعیلە وەیە، کە لە حەقیقەتدا ئیسمەو لە ڕوی مەجازی یەوە بە فاعیل ناوزەد دەکرێت، وە خەبەرەکەش مەنصوب دەکات، ئەمە لەڕووی تەشبیه بە مەفعولەوەیە، کە لەڕووی حەقیقەتەوە خەبەرە، و لە ڕووی مەجازی یەوە بە (مفعول) ناوزەد کراوە.**

(كان): بۆ ثابت کردن و جێگیر کردنی خەبەر بەکاردێت، وەك: (كان زيد قائما) کە (قائما:وەستان) بۆ زەید ثابت دەکات.

– ڕوودانی خەبەر بۆ فاعیل یان بە شێوەیەکی هەمیشەیی یە،وەك: (كان الله عليماً حكيماً) چونکە نیشانەی (حالية)و عەقڵی شایەتن، کە عەلـەم و حیکمەتی خوا تایبەت نین، بەکاتێکەوە وەك: (علم) و (حکیم) بوون بۆ خوای پەروەردگار هەمیشەیی یە، و لێی نابنەوە و بەکاتەوە نەبەستراون، وە یاخود جێگیربوونی خەبەر بۆ فاعیل بەشێوەیەکی کاتی و ناهەمیشەیی یە، وەك: (كان زيدٌ شاباً) کە لـەم نمونەیەدا جێگیربوونی ئەو هەواڵە بۆ فاعیلەکە کە (زيدُ)ە کاتی و (مؤقت)ە، چونکە گەنجێتی هەمیشەیی نی یە، بەڵکو بەڕۆشتنی کاتەکەی ئەویش دەڕوات و قۆناغێکی تر دێتە پێشەوە کە پیری یە.

وە (كان) بە مانای (صار) دێت، وەك ئەم شیعرە:

**بتيهاء قفر والمطي كأنها فطا الحزن قد كانت فراخا بيوضها**

(بتيهاء): جار ومجرور. وهو مضاف (قفر): مضاف إليه.

(واو): عاطفة. (المطي): متبدأ. (كأن): حرف مشبه بالفعل.

(ها): اسم كأن. (قطا): خبر كأن وهو مضاف.

(كأنها قطا): خبر لمبتدأ. (الحزن): مضاف إليه. (قد): تحقيقية

(كانت): بە مانای (صارت) هاتووە.

(فراخا): خبر (كان). (بيوضها): اسم كان.

وە لە (كان)ەدا (ضمير الشأن) دێت، وەك:

**إذا مت كان الناس صقان شامت وآخر مثن بالذي كنت أصنع**

(مت): فعل ماضي. (كان): ناقصة. (الناس): مبتدأ

(صقان): خبر لمتبدأ. (الناس صقان): خبر (كان).

(شامت): خبر لمبتدأ محذوف. (آخر): متبدأ. (مثن): خبر لـ (آخر).

(بالذي): جار ومجرور، متعلق بـ(مثن). (كنت): فعل ناقص.

(تاء): اسم (كان). (اصنع): فعل متكلم وحده..

﴿ کەی (کان) زیادەیە؟ ﴾

(کان) کاتێك زیادەیەکە لەنێوان دوو شتی دانراو (موضوع) و (متلازم: پێویست بەیەك)، لەوێنەی (صیفەت و مەوصوف – موبتەداو خەبەر– صیلەو مەوصول– فیعل و فاعیل–فیعلی مەجهول و نائیب فاعیل) دابێت.

١–صیفە و مەوصوف. وەك: (مررتُ برجل کان قائمٌ).

٢– موبتەداو خەبەر. وەك: (زیدٌ کان قائمٌ).

٣– صیلەو مەوصول :وەك: (جاء الڑی کان أکرمتهُ).

٤–فیعل و فاعیل: وەك: (یکتب کان زیدٌ).

٥– فیعلی مەجهول و نائیب فاعیل: وەك: (لم یوجد کان مثلكَ)

یاخود هەندێ جار (کان) بە یەکێك لە مەعمولەکانیەوە (ئیسم و خەبەر) حەزف دەبێت.

کە ئەصڵی حەدیسەکە ئەمەیە: (کان الناس مجزیون بأعمالهم أن خیرا فخیرا، وإن شر فشرا)،

(الناس): مبتدأ. (مجزیون): خبر.

چوار شێواز لە (إن خیرا فخیرا، وإن شرا فشرا)دا دروستە:

١–نەصبـی (خیر وشر) ،(إن کان خیرًا فخیرًا وأن کان شرًا فشرًا).

تەقدیری (إن کان عملهم خیرا فیکون جزاؤهم خیرا، وإن کان عملهم شرا فیکون جزاؤهم شرا) کە کان و ئیسمەکەی حەزف بوون.

٢–هەردووك مەرفوع بن، (إن خیرٌ فخیرٌ، وإن شرٌ فشرٌ).

تەقدیری (إن کان خیر عملهم فیکون خیرا جزاؤهم وإن کان شر عملهم فیکون شر جزاؤهم).

واتە: (جزاؤهم، عملهم) لەم دوو نمونەیەدا خەبەرن بۆ (کان و یکون).

**٣-نەصبی یەکەم** (خيرًا وشرًا) **وە ڕەفعی دووەم** (خيرٌ و شرٌ).

**تەقديرى** (إن كان عملهم خيرا فيكون خير جزاؤهم، وإن كان عملهم شرا فيكون شر جزاؤهم). **دواى** (أن)ى شرطيه، **(كان)ە و ئيسمەكەی حەزف بوون، وە دواى** (فاء) **،"كان"ـە، وخەبەرەكەی حەزف بوون.**

**٤-عەكسی سێیەم: ڕەفعی یەكەم و نەصبی دووەم:** (إن خيرٌ فخيرًا وإن شرٌ فشرًا).

**تەقديرى** (إن كان خير عملهم فخيرا جزاؤهم و إن كان شر عملهم فيكون شرا **جزاؤهم**) **دواى** (أن)ى شرطيه **(كان)ـە، و خەبەرەكەی حەزف بوون و دواى** (فاء) **(كان)ـە، و ئيسمەكەی حەزف بوون.**

***مختلفين:* مەبەست (سێیەم و چوارەمە) كە باس كرا.**

**وە هەندێ جار (كان) لەگەڵ ئيسم و خەبەرەكەیدا حەزف دەبێت، وەك:** (إفعل هذا وإما لا) **ئەصڵی ئەم نمونەیە:** (إن كنت لا تفعل غيره) **كە** (تاء) اسم كان (لا تفعل): في محل نصب خبر كان.

**و (ما) بەسەر (إن)دا زیاد كرا، لە جیاتی مەحزوفەكە.**

**وە هەندێ جار نونی (يكون) مەحزوف دەبێت، ئەگەر كۆتاییەكەی** (ضمير)**ى پێوە نەبوو، وە دواى** (نون) **ساكن نەبوو، وەك** (لم أك بغيا)**، كە ئەصڵەكەی (أكون) بووە، و نونەكە** ضە **میری پێوە نییەو بە ساكن كۆتایی نەهاتووە، وەك** (لم يكنه)**،" بسكون النون".**

**وە (صار) بۆ گواستنەوەیە، وەك: (صار زيد غنيا) وە هەندێ جار بە (تام)ی دێت، وەك (صار زيد إلى عمرو).**

(صار) فعل ماضي ناقص. (زيد): فاعل. (إلى عمرو): جار ومجرور، متعلق بـ(صار).

***(گواستنەوە: أنتقال) دوو جۆرە:**

**١-أنتقال بالعوارض: وەك: (صار البشر أميراً)**

**٢-أنتقال بالحائق: وەك: (صار الماءُ هواءً).**

وە بزانە (أمسى، أصبح، أضحى) ڕستەکە بە کاتەوە دەبەستن، وەك: (أضحى زید أمیرا) زەید چێشتەنگاوی بە پاشایی کردەوە. وە بە مانای (صار) دێن، وەك: (أضحى زید غنیا): واتە: زەید بوویە دەوڵەمەند، وە بە (تام)ی دێت، وەك: (أصبح زید)، (زید): فاعلە، کە بە (تام)ی هات، واتە چوونە ناوەوە لەو کاتەدا.

وە (ظل) و (بات) ڕستەکە بە گشتی بە کاتەوە دەبەستن، وەك:

ظل زید قائما: زەید هەموو ڕۆژ وەستاو بوو.

یان هەموو شەوەکە.

وە بە واتای (صار) دێت، وەك:

(ظل زید قائما)، واتە: "صار زید قائما".

(ظل و بات) بە کەمی بە (تام)ی دێت،

وە بزانە: (ما زال و مابرح وما فتیء ما أنفك) بۆ بەردەوامی مانەوەی خەبەر دێن بۆ ئیسمەکە، وەك:

(ما زال زید کریما)، واتە: زەید هەمیشە (کریما) بەخشندەیە، کە خەبەر بۆ زەید جێگیر کراوە.

وە ئەم چوارە پێویستە (نفي، لا، ما) یان لەگەڵ بێت، ئەگەر تەقدیریش بێت وەك: (تفتؤ تذکر یوسف) کە ئەصڵەکەی (لا تفتؤ) بووە.

(مادام) بۆ دیاری کردنی کاتە (توقیت)ە، وە ڕستەی دوایی خۆی دەباتەوە سەر تەئویلی مەصدەر، وە پێش (مادام) هەمیشە کەلام هەیە، وەك: (إجلس مادام زید جالسا) کە لە تەئویلی مەصدەردا (إجلس دوام جلوس زید) بووە.

* (ظه رف) دوو بەشە:(متصرف، غیر متصرّف).

ئەوانەی لە ئیسمەکانی زەمان و مەکان کە دەبنە ظه رفیش و غەیرە ظه رفیش، لە ئیصتیلاحی زانایانی نەحودا، بە (ظرف متصرّف) ناوزەد کراون، وەك: (ضربتُ زیداً یوم

الخميس) وە دیسان دەشبێتە غەیری مەفعول فیە، وەك موبتەداو خەبەر، فاعیل،مەفعول بە، موضاف ألیە..

بۆ وێنە: (یوم الجمعة یوم مبارك)، (وجاء یوم الجمعة)، (سرتُ بعض الیوم جاء شهرُ رمضان).

وە ظە رفی غەیرە موتەصەڕیفیش ئەوەیە کە هەمیشە (ملازم)ی ظە رفیەت بونە، واتە بە تەنها دەبێتە مەفعول فیە: وەك: (فعلُ) کە ظە رف و بە مانای گشت کاتی ڕابردوو دێت، وەك: (ما ضربتُ زیداً فعلُ:لەهیچ کاتێك لە کاتەکانی ڕابردوودا لە زەیدم نەداوە). وە وەك (عوضُ) کە بەمانای گشت کاتی داهاتوودێت، بۆ نمونە: (لا أفعل هذا الشئ عوضُ: لە سەرجەم کاتەکانی داهاتوودا ئەم کارە لە منەوە ئەنجام نادرێت).

(لیس) مانای ڕستە لە زەمانی (ئێستا، حال)دا نەفی دەکات، وەك: (لیس زید بخیلا) واتە لە ئێستادا.

دروستە پێشکەوتنی خەبەر بەسەرئیسمی ئەم ئەفعالانەدا. وەك:

(کان قائما زید) کە (قائما) خەبەری موقەددەمە بۆ (کان).

### ﴿ خەبەری ئەفعالی ناقیصە ﴾

لەهەندێ جێگادا بەهۆی ترس لە هەوڵی تێکچون، دروست نییە، کە خەبەری ئەفعالی ناقیصە، پێش بکەوێت بە سەر ئیسمەکەیاندا، ئەو جێگایانەی کە خەبەر تیایاندا ناتوانێت پێش ئیسم بکەوێت ئەمانەن:

١-لەکاتێك دا کە ئیسم و خەبەری ئەفعالی ناقیصە، ئیضافە کرابن بۆ لای (یاء)ی موتەککەللیم، وەك: (کان صدیقي عدوّي) وە ئەگەر خەبەر (عَوي)ی بەسەر ئیسمەدا پێش بکەوێت، کابرای موخاطە ب، واگومان دەبات کە ئیسمی (کان)ەیە.

٢-لەکاتێکدا کە خەبەرەکە (محصور بألاّ)بێت، واتە: بە (إلاّ) حەصر کرابێت، وەك: (ما کان زیدٌ ألاّ شاعراً).

٣-وەیان خەبەر بۆ لای ضە میرێك ئیضافە بکرێت، کە ئەو ضە میرە بۆلای (ملابس)ی ئیسمی ئەفعالی ناقیصە بگێڕێتەوە، وەك: (کان غلامُ هندٍ چاربها) کە لەم نمونەیەدا (هاء) بۆ (ملابس)ی ئیسمی (کان) کە (هند)ە گەڕاوەتەوە.

*(ملابس): لە زمانەوانیدا بەمانای (مشابە)و لە زاراوەی زانستی نەحودا، بەو کەلیمەیە دەوترێت، کە لەگەڵ لەفزێکیتردا پەیوەندی و (أرتباط)ی هەبێت، وە لە هەندێ جێگادا واجبەکە خەبەری ئەفعالی ناقیصە پێش ئیسمەکانیان بکەون، وە ئەمەش لەکاتێکدایە کە ئیسمی ئەفعالی ناقیصە بۆ لای ضەمیرێك ئیضافە بکرێت، کە ئەو ضە میرە بۆ لای (مُلابس)ی خەبەرەکە بگێڕێتەوە وەك: (یعجبُني أنْ یکون في الدّار صاحبُها) لەم نمونەیەدا (في الدّار) خەبەرەو بەسەر ئیسمەکەدا (صاحبُها) پێش کەوتووە، چونکە ئەگەردوا بکەوێت، ئەوا پێویستە کە ضە میر لە (صاحبُها)دا بۆ مەرجەعە دواییەکەی بگەڕێتەوە، وە ئەمەش دروست و ساغ نییە و نابێت.

بەڵام لە (مادام)دا پێشکەوتنی خەبەر بەسەر نەفسی فیعلەکاندا دروست نیە، وە لە (لیس)دا ئیختیلاف هەیە.

## ﴿ (لیس) وەك (عسی) وایە ﴾

ئبن مالیك، لە کتێبی (شرح کافیة)دا دەڵێت: (لیس) وەك (عسی) وایە، لەو ڕووەوە کە جامیدە، و هەر بەم شێوازەش نەحوی یەکان لە فیعل بونیدا ڕاجیاییان هەیە، وە سەرجەم زانایانی نەحو هاوڕان، کە خەبەر بەسەر خودی (عسی)دا پێش ناکەوێت، لەبەر ئەمەشە (لیسَ) وەك (عسی) وایە: دەبێت خەبەرەکەی پێش نەکەوێت بەسەر (لیس)دا، بەڵام هەندێك لە زانایانی نەحو پێش کەوتنی خەبەرەکە بەسەر (لیس) دا بەدروست دەزانن، بەبەڵگەی ئەم ئایەتە: (ألا یوم یأتیهم لیس مصرو فاعنهم).

کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا مەعمولی خەبەرەکە (یوم) بەسەر خودی (لیس)دا پێش کەوتوە، وە ئەم پێش کەوتنە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە پێش کەوتنی خەبەری (لیس) ئەولاترە بەوەی کە دروستە، چونکە مەعمولی خەبەر، بە فەرعی خەبەرەکە حیسابە، وە هەرکات کە فەرع پێش

کەوت ئەوا دەردەکەوێت، کە (أصل)یش دەتوانێت پێش بکەوێت، هەڵبەتە ئەم قسەیەش ڕەد دراوەتەوە بەوەی کە (یوم) ظە رفەو ظە رفیش خاوەنی (توسع: فراوانی)یەو هەر لەبەر ئەمەشە کە پێش کەوتووە، و لە ئەوانەدا کە (ما) لە پێشیانەوەیە، وەك (ما زال) ئیختیلاف هەیە ،کە خەبەر بەسەریاندا پێشکەوێت، وە لە فیعلەکانی تردا پێشخستنی خەبەر دروستە.

**ئاگاداری:** ئەفعالی ناقیصە دەگۆڕێن بۆ" موضاریع، أمر، اسم فاعل.".

بەلاّم (لیس) جامیدەو ناگۆڕێ.

***سوودێك:***

* ئەم ئەفعالانە بە (ناقصة) ناو دەبرێن، چونکە بە مەرفوعی (فاعل) تەواو نابن، بەڵکو مەنصوبی خەبەریشیان پێویستە.

*** ئەفعالی ناقیصە سێ بەشن:**

١-ئەو فیعلانەی کە خاوەنی موضاریع و وەصفن، وەك: (زال، فتی، أنفك، برح).

٢-تەنها ماضی یان هەیە، کە فیعلەکانی (لیس وما دام)ـەن.

٣-ئەو فیعلانەی تر کە ماون.

## ﴿أفعال المقاربة﴾

**ومن الأفعال الناقصة، أفعال تسمى أفعال المقاربة، وتعمل كباب (كان)، و هي أصناف ثلاثة:**

**الأول: ما يَدُلُّ على قرب حصول الخبر للإسم، نحو: كاد وكرب، وخبرهما فعل مضارع مجرد عن أن الناصبة، نحو:﴿ ويكاد زيتها يضييء﴾النور.٣٥، وكرب المسافر يرجع.**

---

### (باسی ئەفعالی موقارەبە)

ئەفعالی موقارەبە، لەسەر ئەفعالی ناقیصەن، بەئەفعالی موقارەبە ناسراون، وەك (كان) عەمەل دەكەن و سیّ بەشن: بەشی یەكەم: ئەوانەن، كە خەبەرەكە لە ئیسمیّكەوە نزیك دەكەنەوە، وەك: "كاد ، كرب" وە خەبەرەكەیان فیعلی موضاریعەو ڕووتە لە (أن)ی ناصیبە، وەك:پەروەردگار دەفەرمویّت: **﴿ و یكاد زیتها یضیء﴾**، كە (یضیء) فیعلی موضاریعە، و ڕووتە لە (أن)ی ناصیبە، ومانای نزیكی دەگەیەنیّت، وە هەروەها: وەك:(كرب المسافر یرجع).

الثاني: لِرجاء حصوله له، نحو: عسى، و أَوشك، و إِخلَوْلَق، وحَرى، وخبرها فعل مضارع غالباً في الأولين، ودائماً في الأخيرين، نحو: عسى الطالب أن ينجح، وأوشك التاجر أن يربح.

الثالث: لشروع إِسمه في الإِتصاف بخبره، كطفق، وأنشأ، وأخذ، وجعل، وعلق، وهلهل، وخبرها فعل مضارع مجرد عن (أن) وجوباً، نحو: أخذ زيد يكتب، وشرع الخطيب يخطب.

وهذه الأفعال غير مُتصرّفة، إِلاّ (كاد)، فقد جاء منه، (يكادُ)، و (أَوشك)، حيث أستعمل (يوشك)، و (موشك).

---

بەشی دووەم: بۆ ئومێدی هاتنەدی شتێك بەكاردێن، وەك (عسی، أوشك، أخلولق،حری) وە لە (عسی و أوشك) دا بە زۆری خەبەركەیان فیعلی موضاریعە، وە خەبەری (أخلو لق و حری) فیعلی موضاریعە، وەك (عسی الطالب أن ینجح)، و(أوشك التاجر أن یربح).

بەشی سێیەم: بۆ دەست پێكردنی ئیسمەكەی بەكاردێن، لەكاتی وەصف كردندا، بەهۆی خەبەرەكەوە، وەك (طفق، أنشأ، أخذ، جعل، علق، هلهل) و خەبەرەكەیان فیعلی موضاریعی ڕووتە لە (أنْ) بەواجبی، وەك (أخذ زید یكتب) و (شرع الخطیب یخطب) كە ئیسمەكەی كە (خطیب)ە، وەصفی كابرایە، و بەهۆی (یخطب) كە فیعلەكەیە، ئەو ئیسمە جێگیر دەكرێت.

وە ئەم فیعلانە، غەیرە موتەصەڕیفن، واتە: (مضارع) و (أمر) و(أسم فاعل)و....... یان لێ دروست ناكرێن، جگە لە (كاد) كە دەبێتە (یكاد) وە (أوشك) دەبێتە (یوشك). وە ئیسم فاعیلەكەی (موشك)یە!

* * *

﴿ باسی "أفعال المقاربة"﴾

أفعال المقاربة: چەند فیعلێکن کە بە" أفعال المقاربة" ناودەبرێن،و وەك ئەفعالی ناقیصە وان، بەڵام خەبەری ئەمان فیعلی موضاریع دەبێت،وئەمانە چوار دانەن:

(١) " عسی" یە،وەك:" عسی زید أن يخرج"ئومێد هەیە کەزەید بچێتەدەرەوە. "عسی" فیعلێکە لە ئەفعالی موقارەبە،" زید": ئیسمەکەیەتی"أن":ناصیبە ومەصدەریەیە.

"يخرج": فیعلی موضاریعە، و فاعیلەکەی ضە میری شاراوەی "هو"یە،کە بۆ زەید دەگەڕێتەوە، ئەم ڕستەیە لە تەئویلی مەصدەرداو لە مەحەڵلی نەصبدا خەبەری "عسی"دەبێت.

مەبەستی ئێمە: " عسی " یە، کە ئیسم مەرفوع و خەبەر مەنصوب دەکات، بەڵام خەبەرەکەی فیعلی موضاریعە.

وە لە هەندێ کاتدا (عسی)"تامة":تەواو"دەبێت، وپێویستی بە خەبەر نابێت، وەك: "عسی أن يخرج زید"، چونەدەرەوەی زەید نزیکە.

" عسی" فیعلێکە لە ئەفعالی موقارەبە،وبە"تام"ی هاتووە. "أن":ناصیبە ومەصدەریەیە.

﴿عسی وحری واخلولق وکاد وکرب وأوشك وأنشأ وطفق وجعل وأخذ وعلق﴾

ئەمانەش: چەند فیعلێکن بە (أفعال المقاربة) ناو دەبرێن، وە ئەمانیش وەك ئەفعالی ناقیصە وان، ئیسم مەرفوع و خەبەر مەنصوب دەکەن، وە جیاوازی (أفعال المقاربة) لە (أفعال الناقصة) ئەوەیە کە ئەم (أفعال المقاربة)انە خەبەرەکەیان دەبێت (فعل المضارع) بێت، وە ئیسم نەبێت، ئەمەش بە (شاز)ی هەیە، کەوا نەبێت، وە لەمەولا باسی لێوە دەکەین.

وە (أفعال المقاربة) ئەمانەن: (عسی.. ... ... علق).

وە ئەم فیعلانە خەبەرەکانیان لە ئیسمەکانیان نزیك دەکەنەوە، هەندێکیان (رجاء) بە ئومێدەواری، وە هەندێکیان (حصولا) بە حاصڵ کردنی و هەندێکیان (أخذا فیه) واتە:

بە دەست پێکردن لە خەبەرداندا، کە لە شوێنی هەریەکەیاندا، ئەم سیانە دیاری دەکەین. إن شاء الله تعالی.

یەکەم: (عسی، حری، اخلولق) خەبەرەکەیان (أن)ی پێوەیە، وەك: (عسی زید أن یقوم) وە دروستە ئەو (أن)ە لابىرێت لە خەبەرەکەدا، وەك (عسی زید یخرج) کە ئەصڵەکەی (عسیٰ زید خارجا)ەنە، واتە ببرێتەوە سەرئیسم فاعیل تا بزانین کە (أن)ێك حەزف کراوە.

## ﴿هەرکات لەپێش (عسی)دا، ئیسمێك هات؟﴾

هەرکات لەپێش (عسی)دا، ئیسمێك بهێنرێت، لەم کاتەدا لە فیعلەکەدا دو شێواز (تام–ناقص) دروستە، وەك: (زیدٌ عسی أن یقوم) بۆیە لەسەر شێوازی یەکەم واتە: ئەگەر (عسی) لە ضە میرەکەدا عەمەل بکات، لەسەرەنجامدا (عسی) لەگەڵ ئیسمەکەی پێش خۆیدا هاورێکی و موتابیق بوون دەنوێنێت.

وەك: (هِنْدٌ عستْ أن تقومَ)، (ازّیدان عسیا أن یقوما)، (الزّیدونَ عسرا أن یقوموا).

بەڵام بەگوێرەی شێوازی دووەم کە (عسی) لە ضە میرەکەدا عەمەل نەکات وە بێ نیاز بێت لە خەبەر و پێویستی پێی نەبێت، ئەوا لە سەرجەم شێوازەکاندا (عسی) موفرەدە، واتە: لە ڕوی (مثنی)و (جمع) و (مذکّر) و (مؤنث) بونەوە، لەگەڵ ئیسمەکەی پێش خۆیدا هاورێك و موتابیق دەبێت.

وە ئەگەر فیعل پێشی ئیسم کەوت، ئەوا ئیحتیمالی دوو شت هەیە:

یان (تام)ە، واتە (أن یقوم) لە تەئویلی مەصدەردا فاعیلە.

یان (نقص)ە، واتە: (خبر مقدم)ە، وەك: (عسی أن یقوم زید) (حری زید أن یقوم)، (اخلولق السماو أن تمطر)، ئەم سیانە بۆ (رجاء) ئومێدەواری بەکاردێن.

دووەم: (کاد وکرب و اوشك) ئەمەیان بۆ (حصولا: بەدی هاتن) بەکاردێن، واتە بەدی هاتنی خەبەرەکە، بۆ ئیسمەکە نزیك دەکەنەوە، وەك:

(أوشك زيد أن يقوم)، لە خەبەری (أوشك)ەدا ،(أن) زۆر بەكاردێت، بەڵام لە (كادو كرب)دا بۆ نەفی (أن) لەگەڵ خەبەرەكەیدا زۆر كەمە.

سێیەم: (طفق، أنشأ، جعل، أخذ، علق)ەكە بۆ (أخذا فيه) واتە :دەست پێكردنی خەبەر بەكاردێن، وەك: (طفقا يخصفان عليهما من ورق الجنة).

(طفقا): أفعال المقاربة. (ألف): اسم (طفق).

(يخصفان): خبر (طفق).

واتە: ئادەم و حەوا دەستیان كرد بە لەبەركردنی پۆشاكی ئەو شوێنە.

٢-جعل السائق يحدوا، وشترەوانەكە دەستی كرد بە لاواندنەوە.

٣-أخذ السائق يحدوا. ٤- علق السائق يحدوا.

هەموو ئەم فیعلانە بۆ دەست پێكردن بەكاردێن.

وە ئەم فیعلانە (أن)ی ناصیبەیان لەگەڵ نایەت، چونكە بۆ زەمانی (حال) ئێستا بەكاردێن، وە (أن) بۆ (استقبال: داهاتوو) بەكاردێت.

وە ئەم فیعلانە هەموو ماضی دەبن جگە لە (كاد، اوشك) كە موضاریعەكەیان (يكاد، يوشك)یە، و ئیسم فاعیلەكەی (موشك)یە.

## ﴿أفعال القلوب﴾

ومن الناسخ، أَفعالٌ تسمى أفعال القلوب، لِدلالتها على معان توجد فيها، وتنصب المبتدأ مفعولا أول، و الخبر مفعولاً ثانيا لها، فمنها ما هو لليقين، كعلم، و وجد، و درى، نحو: علمت الألهَ واحداً، و وجدت أوصافَهُ الذاتية سبعاً، و دريت أفعاله حسنة عقلاً وسمعاً، ومنها ما هو للظن، كزعم، و جعل، و عدَّ، نحو: زعمت العيال سبب الملال، و جعلت النساء تغلب الرجال، و عددت الكمال أعلى من الجمال، و منها ما يستعمَل لهما، كظن، و رأى، و خال، و حسب، نحو: حسبت الحذرحصناً عن شرّ الفاسقين، وخلت الجسارة خسارة للطالبين، و يمتنع حذف مفعوليها، أَو أَحدهما بدون قرينة، و يجوز ذلك معها.

---

## ﴿باسی ئەفعالی قولوب﴾

یەکێکی تر لەنەواسیخ،ئەفعالی قولوبە، وە بۆیە بە (قلوب) ناسراون، بەهۆی ئەو واتایانەی کە تیایاندا هەیە! وە موبتەدا مەنصوب دەکەن و دەیکەنە مەفعولی یەکەم و خەبەر دەکەنە مەفعولی دووەم، لەوانە (علم، وجد، دری) وەك ئەو سێ نمونەیە: (علمت الا لە واحداً)، و(وجدت أو صافە الذاتیة سبعاً)، و(دریت أفعالە حسنة عقلاً وسمعاً)،کە (ألە) مەفعولی یەکەمە (واحداً) مەفعولی دووەمە، کە ئەو سیانە بۆ (یقین: دڵنیایی وبێگومانی) دەبن.

وە لەوانە (زعم ، جعل، عدّ)، کە بۆ (ظن: گومان) دەبن، وەك ئەوسێ نمونەیە:(زعمت العیال سبب الملال)، و(جعلت النساء تغلب الرجال)، و(عددت الکمال أعلی من الجمال). وە (ظن ، رأی ، خال، حسب) بۆ (یقین و ظن) یش بەکاردێن، وەك :(حسبت الحذرحصناً عن شرّ الفاسقین)، و(خلت الجسارة خسارة للطالبین)، وە مەفعولەکانیان، یان یەکێکیان حەزف ناکرێت، بەبێ بوونی نیشانە وناماژە،و قەرینەیەك، بەڵکو بەقەرینەوە حەزف دەکرێن.

## ﴿ ڕوونکردنەوە: باسی أفعال القلوب﴾:

### چەند فیعلێکن بە (أفعال القلوب) ناو دەبرێن:

*هۆی ناونانی ئەم فیعلانە بە (أفعال القلوب)ی، ئەوەیە کە ئەم فیعلانە لە کاتی کردنیاندا، و ئەنجامدانیاندا، پێویستیان بە پەل و پۆو ئەندامە ظاهری یەکانی مرۆڤ نی یە، بەڵکو فیعل گەلێکن کە بە هۆی هێزی ناوەکی و زیهنی یەوە دەکرێن، و دێنە ئەنجامدان، کە بەم جۆرە فیعلانە (گومانی)ییشی دەگۆرێت.

یاخود ئەفعالی (شەك، و یەقین) دەچنە سەر موبتەدا وخەبەر، و دەیانکەنە مەفعول بۆ خۆیان، و مەنصوبیان دەکەن، (بناء) لەسەر ئەوەی کە مەفعولن، وە ئەم فیعلانە ئەمانەن: (علمت، رأیت، وجدت) کە بۆ یەقینن، وە (حسبت، خلت، ظننت) بۆ (شك)ـن، وە (زعمت) :(لهذا تارة) واتە: بۆ (شك) بە کار دێت، وە (لذاك تارة أخرى)، وە بۆ یەقینیش بەکاردێت، وەك:

١-علمت زیدا فاضلا.

* لەبەر ئەوەی کە دوو مەعمولەکەی (أفعال القلوب) لە ئەصڵدا موبتەدا و خەبەر بوون، و پەیوەستن بە یەکترەوە، بۆیە هێنانی یەکێکیان بە بێ ئەوی تریان دروست نی یە.

٢-حسبت بکرا کریما. ٣- زعمت بشرا أخاك.

### (أفعال القلوب) سێ بەشن:

١-لازم: وەك: (تفکّر).

٢-موتەعەددی بە یەك مەفعول، وەك: (حَفظَ) و (أدركَ).

٣- موتەعەددی بە دوو مەفعول: وە: (علمتُ زیداً فاضلاً) و (ظننتُ بکراً قائماً)، وە مەبەستی زانایانی نەحو، لە فیعلەکانی (قلوب) بەشی کۆتایی موتەعەددی، بە دوو مەفعولە.

لە نێوان (أفعال القلوب)دا، هەردوو فیعلی (حسبتُ)، (ظِلْتُ) بە بێ بوونی هیچ مەرجێك دەچنە سەر موبتەدا و خەبەر، بەڵام پێنج فیعلەکەی تر، (ظننتُ، علمُ، زعمتُ، وجدتُ، رأیتُ) مەرجیان لەسەرە، و (مقیّد)ن.

چونکە: هەر یەکە لەم پێنج فیعلە مانای تریشیان هەیە، کە ئەگەر لەو مانا یەدا بەکار بهێنرێن، تەنها یەك مەفعول وەردەگرن.

– ئەمانەی لای خوارەوە بە (أفعال القلوب) حیساب ناکرێن؟

١–(ظنّ): ئەگەر بە مانای (أتّهام: تۆمەتبارکردن) هاتبێ، ئەوا لە (أفعال القلوب) لەڕووی ئیصتیلاحەوە حساب نییە، وە: (ظننته، أیّ، إتّهمته، تۆمەتبارم کرد).

٢–(زعم): ئەگەر بەمانای (گوتن)بێت، لەم کاتەدا تەنها یەك مەفعول وەردەگرێت، وەك: (زعمتة: أیّ: قلتهُ: پێم گوت).

٣–(علم): ئەگەر بەمانای (عرف)بێت، ئەوا یەك مەفعولی دەبێت، وەك: (علمته: أیّ: عرفته: ئەوم ناسی).

٤–(رأی): لە کاتێکدا کە بۆ یەکێك لەم سێ مانایە بەکار بهێنرێت، ئەوە لە (أفعال القلوب) حیساب نی یە.

أ–(رأی): ئەگەر بەمانای (أصاب الرّية: ژەنگ لێدان) هاتبوو، هەروەك دەگوترێت، (رأی السّکینُ: چەقۆکە ژەنگ لێی داوە).

ب–(رأی): ئەگەر لە (رُؤية العين)ـەوە وەرگیرابوو، وەك: (رأیتُ الهلال: مانگم بینی)، کە بێگومان مەبەست بینینی چاوە.

د–(رأی): کە ئەگەر لە ڕاوبۆچوون و بیروباوەڕەوە وەرگیرابێت، وەك (رأی زیدٌ حرمةَ فعلهِ: زەید باوەڕی بە حەرامی کارەکەی خۆی پەیدا کردووە).

٥–(وجد): ئەگەر بە مانای (أصاب) هاتبوو، ئەوا لە (أفعال القلوب) حیساب نی یە، وەك: (وجدتُ الضّالة: أي: صادفتها: شتە وون بووەکەم دۆزیەوە).

(تصاریف: گۆڕانکاری)یەکانی تری ئەم فیعلانە هەر دوو مەفعولیان پێویستە.

وە دروست نی یە، حەزفکردنی یەکێك لەو دوو مەفعولەی فیعلەکانی (قلوب)، بەڵکو هەردووکیان حەزف دەکرێن، وە:
(من یسمع یخل) ئەوەی کە دەبیستێ خەیاڵ دەکات، کە ئەوەی بیستوویەتی ڕاستە، واتە (یخل مسموعە صادق) کە (مسموعە) مەفعولی یەکەم، و (صادقا) مەفعولی دووەمە، و حەزف بوون.

## ﴿ تایبەتمەندییەکانی (أفعال القلوب) ﴾

بزانە، کە بۆ فیعلەکانی (قلوب) چەند هەیە، بەم شێوازە:
١- حەزفی یەکێك لە دوو مەعمولی (أفعال القلوب) و هێشتنەوەی مەعمولەکەی تر دروست نی یە، بەپێچەوانەی فیعلەکانی تری غەیری (أفعال القلوب)ـەوە، کە خاوەنی دوو مەفعولن، وەك: (أعطیتُ زیداً درْهماً)، کە لە بابی (أعْطی)دا دەتوانرێت، یەکێك لە دوو مەعمولەکان بە تەنهایی حەزف بکرێت، وە مەعمولەکەی تر بهێنرێت، بەڵام لە (أفعال القلوب)دا ناتوانرێت بگوترێت، (علمتُ زیداً)، بەڵکوو دوو مەفعولەکەی دەبێت، لە گەڵ یەکتردا بهێنرێت، واتە: پێویستە بگوترێت: (علمْتُ زیداً فاضلاً)، وە لەکاتێکدا کە نیشانەیەك هەبێت.
لەسەر شتە حەزفکراوەکە، ئەوا دەتوانرێت هەردوو مەفعولەکەی حەزف بکرێت.
وەك: (منْ یسمع یخَلْ: کەسێك کەشت دەبیستێت، وا گومان دەبات ئەوەی کە بیستویەتی دروست و صەحیحە).
ئەم نموونەیەی سەرەوە لە ئەصڵدا (منْ یسمَعْ یخل مسْموعهُ صادقاً) بووە، لەم نمونەیەدا هەر دوو مەفعولەکەی فیعلی (قلوب)ی، (یخل) حەزف کراوون.
وە سودی حەزفی دوو مەعمولەکە لەم نمونەیەدا ئەوەیە کە موتەکەللیم ئەم مانایە بدات بە دەست کابرای گوێ گرەوە، کە خەڵکی دەربارەی ئەو شتەی

کە بیستوویانە، دەربارەی ئەو شتە کۆمەڵە خەیاڵ و بیرکردنەوەیەکی جیا جیایان هەیە، بۆ نمونە: هەندێك لەوانە ئەو شتەی کە بیستویانە بە دروست و هەندێکی تریشیان بە هەڵە، و هەندێکیان بە خەیر و چاکە و هەندێکی تریان بەشەڕ، و خراپە لە قەڵەمی دەدەن، وە ئەم فائیدەیەش کابرای موتەکەللیم تەنها بە هۆی حەزفی دوو مەفعولەکە دەتوانێت.

(تثبیت: جێگیرکردن)ی بۆ بکات و (تقریر)ی لێ بدات، چونکە ئەگەر دوو مەفعولەکە حەزف نەکات، و بڵێت، (من یسمع یخل مسموعه صادقاً): نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە بۆ ئەو گوێگرانە کۆمەڵێك خەیاڵ و بیرکردنەوەی جیاجیایان هەبووە، بەڵکو بەڵگە دەبێت لەسەر تەنها یەك خەیاڵ و بیرکردنەوە.

وە لە کاتێکدا کە حەزفی دوو مەعمولەکە، یان یەك مەعمول بێ سود بێت، ئەوا هێنانیان پێویستە، وەك ئەوەی کە ئیکتیفا بکات و بڵێت، (أظُنّ) و دوو مەفعولەکە حەزف بکات، هێنانی (أظُنّ) بەتەنها خۆی هیچ سودێکی نییە، چونکە (مُخاطب: قسە لە گەڵ داواکراو)، پێش بیستنی (أظُنّ) دەزانێت کە (موتەکەللیم: قسەکەر) بەشێوەیەکی گشتی گومان (ظنّ)ێکی هەیە، چونکە ناتوانێت هیچ مرۆڤێك بێنیت کەوا خاڵی بێت لە خەیاڵ و گومان.

لەبەر ئەمەش هەرکات نیشانەیەك بوویە بەڵگە لەسە ر شتێکی حەزف کراو، ئەوا حەزف کردنی دوو مەفعولەکەی (أفعال القلوب) زۆر بێ کێشەیە، وەك ئەم ئایەتە: (ویوم یقول نادوا شرکائي الذین زعمتُمْ) کە لە ئەصڵدا (زعمتموهُم مثلي) بووە.

٢–یەکێکی تر لە تایبەتمەندی یەکانی (أفعال القلوب) ئەوەیە کە دەتوانرێت، (أفعال القلوب) ئیلغا بکرێتەوە، بەو مانایەی کە ئەگەر (أفعال القلوب) لە ناوەڕاستی جوملەی ئیسمی (زیدٌ ظننتُ قائمٌ)، وە یان لە کۆتایی ڕستەی ئیسمی (زیدٌ عالمٌ علمتُ) دا هات، تەرککردنی عەمەلی لەفزی و مەعنەوی، ئەم فیعلانە بەدروست زانراوە کە لە ڕووی زاراوەیشەوە بە (ألغاء) نازەد کراون، چونکە دوو مەعمولەکەی (أفعال القلوب)کەلامێکی سەربەخۆ، و

تەواون، لە بەر ئەمەیش ئەگەر ئیسمێکی عەطف بکرێتە سەر (زَیْد قائِم) دەبێت مەرفوع بێت، چۆن لەم کاتەدا مەعطوف علیە،یەکە لە ڕوی لەفزیش و لە مەحەلیشدا مەرفوعە، وەك: (زَیْدُ ظَنَنْتُ قائِمُ وَ عَمْرُ مُنْطَلِقُ).

٣- وە هەر بەم شێوازەش یەکێکی تر لە تایبەتمەندی و خەسڵەتەکانی (أفعال القلوب) ئەوەیە کە بە( تعلیق) ناو دەبرێت، کە (تعلیق): بریتی یە لە بەتاڵبوونەوەی عەمەلی: (أفعال القلوب)، لە ڕوی لەفزەوە، واتە: ئەو فیعلانەی کە ناویان هێنرا، لە لەفزدا کار ناکەن، لە سەر دوای خۆیان، بەڵکو لە ڕووی ماناوە مەنصوبی دەکەن!

**ئاگاداری: پاشکۆی ئەفعالی (قلوب) ئەمانەن:**

١-(أعطی)، وەك: (أعطیت زیدا درهما)، (زیدا) مەفعولی یەکەم. (درهما) مەفعولی دووەم.

٢-(کسی)، وەك: (کسوتە جبة). ٣-(سمی): وەك: (سمیتە خلیلا).

وە جگە لەمانە ئەفعالی (تصییر: واتە: گۆڕان) لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر، پاشکۆن!

وەك: (صیَّر، ردَّ، ترك، اتخذ)، وە ئەوەی لەمانەوە دروست دەکرێت.

وەك: (واتخذ الله إبراهیم خلیلا) کە لێرەدا:

(اتخذ) بە مانای (صیَّر) هاتووە.

(الله) فاعیلە، و (إبراهیم) مەفعولی یەکەمە، و (خلیلا) مەفعولی دووەمە.

وە ئەفعالی (تصیِّر) ئەوانی تریشیان هەر بەم شێوازەن، وەك: (فجعناه هباء منثورا).

***تێبینی:ئەم پاشکۆیانە، (أفعال القلوب)نین، بەلام موبتەداو خەبەرمەنصوب دەکەن وە ئەمانەن:**

١- أعطی: أعْطَیْتُ زَیْداً دِرْهَماً.

٢- كَسى: كَسَوْتهُ جُبَّةً.
٣- سَمّى: سَمَّيْتُهُ خَليلاً.
٤- صَبَّرَ: صَبَّرْتهُ ذاهباً.
٥- جَعَلَ: جَعَلَ النَّهارَ متعاشا.
٦- رَدَّ: رِدَدْتهُ سالماً.
٧- تَرِكَ: تَرَكتُهُ فَرْداً.
٨- اتَّخَذَ: ﴿ وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً: خودا ئیبراهیمی کردوّته دۆستو خۆشەویستی خۆی و هەرکەس دوای ئایینی ئەو بکەوێ هەرگیز زیان ناکات، چونکه رِێگەی دۆستانی خودای گرتوەتەبەر، سورة النساء(١٢٥)﴾
وه لەم چوارچێوەیەشدا ئەوانەی کە لەم فیعلانە وەردەگیرێت، هەر وەك خودی (أفعال القلوب)، کار دەکەن.

## ﴿الـــفــــاعــــل﴾

و منها الفاعل: وهو ما أسند إليه، فعل أو شبهه على جهة قيامه به أظطِراراً، نحو: مرض زيد، أو إختياراً كسبا، نحو: كتب بكر، أو أيجاداً ، نحو: خلق الله العالم، ويجب ذكره، وتأخيره عنه، فإن لم يذكر فهو مضمر مستتر، وقد يجر بالباء، أو من الزائدتين، نحو: قوله تعالى: ﴿وكفى بالله شهيدا﴾النساء:١٦٦، وما جائني من أحد، و إذا أسند الفعل إلى فاعل مثنى، أو جمع جُرِّدَ عن ألف الضمير،و واوه، نحو: جاء الطالبان، وجاء الطالبون، و إذا أسند إلى ظاهر مُتَّصِل مُؤَنَّث حَقيقي، كهند، أو إلى ضمير مؤنث مطلقاً، لحقته التاء وجوباً، ك:(قامت هند)، و(الشمس طلعت)، ويترجح لحوقها إذا أسند إلى مؤنث حقيقي مفصول بغير إلاّ، أو مؤنث مجازى، نحو: جاءت القاضي مطلقة، وقد طلعت الشمس، و يترجح عدمها، في ما إذا فُصِّل بإلاّ، نحو: ما جائتني إلا بنتي.

---

## ﴿باسی فاعیل﴾

فاعیل: ئەوەیە کە شتێ بدرێتە پالّی،ئیتر فعلێك بێت، یان (شبه فعل)ێك، لەسەرئەوبنەمایەی کە ئەوە بەوکارە هەستاوە، ئیتر بە(أظطراری: ناچاری) بێت، وەك: (مرض زید). (أضطراری) واتە: هۆی ئەو کارە کەلێرەدا (نەخۆشی)یە فیعلەکە بێت، نەك بکەرەکەی، یاخود (أختیاری: خۆویستانە) بێت، وەك (کتب بکر) یان لەوجودا نە بێت، و ئەو فیعلەکەی هێنابێتە وجودەوە، وەك :(خلق الله العالم)، وە واجبە فاعیل لە ڕستەدا هەبێت، وباس بکرێت. وە دوای فیعل بکەوێت،

ئەگەر باس نەکرا (مضمر، شاراوە) یە، وەبەهۆی حەرفە جەرەکانی ( باء)و(من)ی زائیدە وە،بە مەجروری دێت، کاتێ کە لەگەڵ فاعیلی (مثنى و جمع)دا هات، وە ك (جاء الطالبان، جاء الطالبون)، وە ئەگەر ئیسناد درایە لای ئیسمێکی ظاهیری مؤنثی حەقیقی، وەك (هند) یان بۆلای ضە میری مؤنث بەگشتی، (تاء) بە فیعلەکەوە دەلکێت، وەك :(قامت هند، الشمس طلعت) کە (هند) مؤنثە و (قدم) (تاء)ی پێوەیە، وە هەروەها لەنمونەی دووەمیشدا وایە، وە ئەگەر فیعل و فاعیلەکە درابوونە پاڵ یەکتری، بەڵام فاعیلەکە مؤنثی حەقیقی بوو، بەغەیری (ألاّ) بەینیان کەوتبوو، یان بۆلای مؤنث ێکی مەجازی، ئەوە (تاء)ی پێوە بێت باشترە، وەك (جاءت القاضي، و طلعت الشمس) وە نەبوونی (تاء) چاکترە، ئەگەر بە (ألاّ) بەینیان کەوتبوو، وەك (ماجائنی ألا بنتی) وەما (جائتنی) بە (تاء)ەوە، هەردروستە.

و يتساوى الامران، في ما إِذا أسند إِلى جمع مكسر، أو إِسم جمعٍ، أو إِسم جنس المؤنث، أو الجمع بالألف والتاء، للمذكر، نحو: ﴿قالت الأعراب﴾الحجرات:١٤، ﴿وقال نسوة في المدينة﴾يوسف:٣٠.، ونعم الفتاة هند، وجاء الطلحات، وأمّا تذكير الفعل في قوله تعالى:﴿أذا جاءك المؤمنات﴾الممتحنة:١٢، فللفصل، والأصل تقديمه على المفعول به، نحو: كتب فلان المكتوب، وقد يجب ذلك، نحو: ما ضرب زيد، إِلاّ عمراً، و قد يمتنع، نحو: ضربك زيد، وما أكل الطعام، إِلاّ فلان.

---

وە دروستە، فيعل بە (تاء) يان بەبێ (تاء) بێت. ئەگەر ئیسناد درابوویە لای جەمعی تەکسیر ، یان ئیسمی جەمع یان ئیسمی جینسی مؤنث، یان جەمعی ئەلف و تائی موزەککەر، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿قالت الأعراب﴾، ﴿وقال نسوه في المدينة﴾،( نعم الفتاة هند)، و(جاء الطلحات). وە لەم ئایەتەپیرۆزەدا،﴿أذا جاءك المؤمنات﴾ کە (جاء) بەبێ (تاء) هاتووە، بۆ فەصلە، کە (منفصل) کەوتووەتە نێوانیان بە غەیری (ألاّ). وە لەئەصڵدا فاعیل پێش مەفعول دەکەوێت، وەك ئەم نمونەیە: (كتبت فلان المكتوب) ، وە هەندێك جار واجبە، فاعیل پێش بکەوێت، وەك (ما ضرب زيدٌ ألا عمراً) وە هەندێ جار، نابێت، فاعیل پێش بکەوێت، وەك (ضربك زيد)، و(ما أكل الطعام ألاّ فلان). بۆیە دەربارەی فاعیل، ئیبن مالیك دەڵێت:

**الفاعل الذي كمرفوعي أتى زيد منيراً، وجهه نعم الفتى**

**وبعد فعل فاعل فان ظهر فهو وألاّ ضمير استتر**

**﴿کەی فاعیل ضەمیری شاراوە (مستتر) دەبێت؟﴾**

**<u>لە شەش جێگادا واجبە ، کە فاعیل ضەمیری شاراوە (مستتر) بێت:</u>**

*لە فیعلی ئەمری موفرەدی موزەککەری موخاطەب دا: وەك : (اضرب ) کە (انت)ی تیادا موستەتیرە .

*ئەو موضاریعەی کە (تاء)ی خیطابی پێوەبێت ، ئەمەیان لە موفرە دی موزەککەردا، وەك : (تضرب ).

*ئەو موضاریعەی کە سەرەتاکەی هەمزەی موتەکەللیم بێت . وەك :( اضرب ) .

*ئەوفیعلە موضاریعەی کە نونی موتەکەللیمی پێوەبێت . وەك :( نضرب ).

*فیعلەکانی (استثناء)، وەك : (حاشا - خلا - عدا - لیس - لایکون ) کە لەم فیعلانەدا واجبە کە ضەمیر شاراوە بێت .

*فیعلی تەعەججوب : وەك (ما احسن زیدا ) کە لە (احسن) دا، ضەمیرەکە موستەتیرە بە واجبی .

هەندێ لە زانایانی زانستی نەحو لە ( افعل التفضیل) یشدا دیسانەوە وا بڕیاریانداوە کە فاعیل تیایاندا بە واجبی موستە تیرەو شاراوەیە . وەك : (علی اعلم من یوسف ).

﴿حەزفی فاعیل ئەگەر نائیب فاعیلی بۆ بهێنرێت، دروستە﴾

حەزفی فاعیل دروست نییە، بەڵام ئەگەر جێگری (نائب)ی،بۆ بهێنرێت،حەزف کردنی دروستە، چونکە نائیب فاعیل لە جێی فاعیل دائەنیشێت،وەلەبەرئەوەی کە نائیب بورن، بەستراوەتەوە بە حەزف کردنی فاعیلەوە واتە تێکهەڵکێشی یەکتر کراون . لەبەرئەوەیە کە ئەگەر فاعیل حەزف نەکرێت ئەوا نائیب بوونەکە بێ مانا و بێ نرخ دەبێت، وەحەزف کردنی فاعیلیش لەبەرچەند هۆکارێکە کە لە زانستی (بلاغة : ڕەوانبێژی)دا باس کراوە بۆ نموونە کاتێك فاعیلە لەبەرئەوە حەزف دەکرێت، کە ئەو کەسە فاعیلە نەزانراوە،و نازانین کێیە؟ وەك : (قُتِلَ من في المعسكر) :هەر چ کەسێك لەناو سەربازگەکەدا بووە کوژراوە، وەهەندێ جار لەبەرڕەچاوکردنی (کێش: سجع) دەبێت، وەك: (من طابت مسيرته، حمدت سريرته): یەکێك لە زاناکانی زانستی نەحو کە (سيد عليخان)ـە، خاوەنی کتێبی ( حدائق الندية في شرح الفوائد الصمدية) یە .

هەندێك لەو هۆکارانەی لە دێڕی هۆنراوەدا هۆنیوەتەوە، بەم شێوازە :

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| وحذفه | للخوف | والأبهام | والوزن | والتحقير | والأعظام |
| والعلم | والجهل | والأختصار | والســجع | والوقاروالأيثار | |

**وەكاتێ ( مَفْعُولٌ بِهِ) دەبێتە نائیب فاعیل کە خاوەنی ئەم پێنج تایبەتمەندی یە، بێت:**

١.موسنەد ألیه.

٢.لە ( فضلة: زیادەبون) بێتەدەر و عومدە بێت .

٣.بەشێك لە فیعلەکە وەك فیعلی مەعلوم ، ( ضربت، ضربت).

٤.پێشخستنی بەسەر فیعلدا قەدەغەیە .

٥.لە بەموزەککەرکردن و بە مؤنث کردندا لەگەڵ فیعلەکەی خۆیدا هاوڕێك بێت، وە صیغەی فیعلیی مەجهول لە ماضی دا (فُعِلَ) و لە موضاریعدا (يُفْعَلُ) دەبێت .

لە ماضی مەجهولدا پیتی پێش کۆتایی مەکسورە . و ئەو حەرفە موتەحەڕیکانەی کە لە پێشیەوە بوون . مەضموم دەبن . وەك ( شرب : خورایەوە) ، ( تعلم : فێراکرا)، ( أستخرج : دەرهێنرا) .

وەلە ماضی مەجهولدا ئەلف ئەگەر حەرفی ئەصڵی بێت، دەکرێتە (یاء)، ماضی مەعلوم، وەك : ( قال : وتی ) ماضی مەجهول وەك ( قیل: وترا) .

وە ئەگەر چی ئەلف زیادە بێت دەکرێتە ( واو) ، ماضی مەعلوم وەك : ( عاهد : پەیمانی بەست)، ماضی مەجهول وەك : ( عوهد : پەیمان بەسترا) .

لە موضاریعی مەجهولدا حەرفی موضاریعەکە مەضموم دەبێت، و حەرفی پێش کۆتایی مەفتوح دەبێت، موضاریعی مەعلوم وەك :

( تستخرج)، موضاریعی مەجهول وەك (يستخرج) .

لە موضاریعی مەجهولدا (واو) و ( یاء) ی ئەصڵی دەکرێن بە (ئەلف)، موضاریعی مەعلوم وەك : (یقول : دەڵێت)، موضاریعی مەجهول وەك "یقال: دەوترێت".

موضاریعی مەعلوم، وەك( یبیع: دەفرۆشێت).

موضاریعی مەجهول، وەك : (یباع: دەفرۆشرێت).

موضاریعی مەعلوم، وەك (یدعو:داوا دەكات)وە موضاریعی مەجهول وەك، (یدعی، داوا دەكرێت)، موضاریعی مەعلوم، وەك: (یحكی: چیرۆك دەگێڕێتەوە)،موضاریعی مەجهول، وەك (یُحْكی: گێڕدراوەتەوە و حیكایەت كراوە).

__ئەو ئاشكرایەتیە (ظاهر) بوونە، بە فاعیل حیسابە، و دێتە ئەژمار، شاراوە "مستتر" بوون، ضەمیر دووبەشە:__

*موستەتیر بوون بە واجبی.

*موستەتیر بون بە جائیزی.

لـەم جێگایانەدا دەبێت ضەمیر موستەتیر بێت:

**١.موفرەدی موزەككەری موخاطەبی موضاریع:** وەك: (تضْربُ: كە ضەمیری (أنت)ی تیادا شاراوەیە.

**٢.موتەككەلیم "وحده" لـە موضاریعدا:** وەك: (أضرِبُ) كە ضەمیری (أنا)ی تیادا شاراوەیە.

**٣.موتەكەللیمی "مع الغیر"ی موضاریع:**وەك: (نضْرب) كە ضەمیری (نحنُ)ی تیادا شاراوەیە.

**٤.موفرەدی موزەككەری ئەمری حازر:**وەك: (أضرِبْ) كە ضەمیری (أنت)ی تیادا شاراوەیە.

**٥.فیعلیی تەعەججوب:**وەك:(ما أحسن زیداً) كە لـە (أحسن)دا، ضەمیر بەواجبی شاردراوەتەوە، و هەندێ لـە زانایانی زانستی نەحو لـە فیعلەكانی تەفضیل (افعل التفضیل)دا، پێیان وایە كە دەبێت، فاعیل بەواجبی مستتر بكرێت، وەك: (علیّ أعلم من یوسف).

**٦.فیعلیی ئیستیثناء:** وەك: (حاشا،خلا،عدا،لیس،لایكون) كە لـەم فیعلانەدا پێویستە ضەمیر تیایاندا شاراوە بێت.

**٧.لە ئەسمائولئە فعال دا:**هەڵبەت ئەمەش لە حاڵەتێکدا دەبێت کە بۆ غەیری ماضی هاتبن، وەك: (روید زیداً، أي: أمهلْهُ).

**﴿دووجێگا هەن، کە ضەمیر تیایاندا بەواجبی دەشاردرێتەوە﴾**

دووجێگای تریش هەن، کە ضەمیر تیایاندا بەواجبی دەشاردرێتەوە، (وجوب الاستتار)، کە بریتین لە، (قام و یقوم) ئەمەش لەکاتێکدا کە فاعیل لە پێشیانەوە هاتبێت، وەك: (زیدٌ قام و زیدٌ یقومُ).

ئیتر لە غەیری ئەم جێگایانەدا شاردنەوەی ضەمیر جائیزە نەك واجیب.

موفرەدی موزەککەرو مؤنثی غائیبی فیعلی ماضی و موضاریع، وەك: (ضَرَبَ، ضَرَبَتْ، یَضْرِبُ، تَضْرِبُ) کە لەم چوار صیغەیەدا جائیزە فاعیل چهمیرێکی شاراوەبێت.

وە هەروەها مەفعول بە،یش، دیسانەوە وەك فاعیل یان ناوێکی ئاشکرایە وەك: (ضربتُ زیداً) کە لەم نمونەیەدا (زیداً) مەفعول بە، یەو ئاشکراو ظاهیرە، یاخود ضە میرەکە دەرکەوتە (بارز)ە، وەك: (ضَرَبْتُهُ) وە هیچ کات مەفعول بە،بە ضەمیری شاراوە (مستتر)ی نایەت.

ئەگەر چی (فاعیلیش ضە میر) بێت، ئەوا لەم کاتەدا فیعل بۆ فاعیلی یەك کەسە، بە موفرەدی و بۆ فاعیلی (مثنی) بە شێوەی (مثنی) و بۆ فاعیلی جەمع بە شێوەی (جمع) دێت، وەك:

(زیدٌ ضربَ)، (الزّیدان ضربا)، (الزّیدون ضربوا). وە ئەگەر فاعیل مؤنثی حەقیقی بێت، لەم کاتەدا فیعلەکە هەمووکات بە مؤنثی دەهێنرێت، بەو مەرجەی کە هیچ شتێك نەکەوتبێتە نێوان فیعل و فاعیل، وەك: (ضربتْ هِنْدٌ).

وە لەکاتێکدا کە لەنێوان فیعل و فاعیلدا وشەیەك هەبێت، و بکەوێتە نێوانیانەوە.

لەم کاتەدا (مذکّر) بوون و (مؤنث) بوونی فیعل ،وەك یەکەو موتابیقن، وەك: (ضربَ الیوْمَ هِنْدٌ) لەم نمونەیەدا لە نێوان فیعل و فاعیلدا وشەی (الیوم) کەوتوەتە نێوانیانەوە، وە فیعلەکەیشی بە شێوەی (مذکر) هێنراوە.

وە ئەگەر بمانەوێت، ئەوا دەتوانین کە فیعلەکە بە مؤنثی بهێنین، وەك: (ضَرَبَتِ الْيَوْم هندٌ) هەڵبەتە ئەو یاسا باسکراوە، دەربارەی (مؤنثی مجازی)یش هەر دەبێت، بەڵام لە مؤنثی مەجازی،دا پێویست نی یە، کە فاصیلەیەك بکەوێتە نێوان فیعل و فاعیلەکەوە، وەك: (طلعَتِ الشّمسُ)، کە لەم نمونەیەدا فیعلی (طَلَعَتْ) بە (تأنیث)ی هاتووە، چونکە فاعیلەکەی مؤنثی مەجازی یە.

وە هەروەها دەشتوانرێ، کە فیعلەکە بەبێ (تاء)ی،تأنیث بهێنرێت، وەك: (طلع الشمسُ).

هەڵبەتە بە (تأنیث) و (تذکیر) هێنانی فیعل لە مؤنثی مەجازی،دا لەکاتێکدا دروستە کە فیعلەکە پێش بکەوێت بەسەر فاعیلەکەدا، بەڵام کاتێك کە فیعلەکە دواخرابێت، و فاعیلەکەیش پێش خرابێت، لەم کاتەدا بێگومانە کە فیعلە مؤنثەکە دەهێنرێت، وەك (الشمس طلعتْ).

*لێرەدا ئاگاداریيەك هەیە، کە پێویستە بزانرێ، ئەگەر فاعیل باس نەکرابوو، ئەوا ئیتر ضە میرێك دەبێت، کە بە موستەتیری خۆی ئەنوێنێت، کە دەگەڕێتەوە بۆ ئیسمە باسکراوەکە، وەك: (زیدٌ قام) و (هندٌ قامتْ) کە لە نمونەی یەکەمدا (هو) لە (قام) داو لە نمونەی دووەم دا (هي) لە (قامت) دا شاراوەیە، وە یان ئەوەیە کە ضە میرەکە دەگەڕێتەوە، بۆ ئیسمێك کە باس نەکراوە، بەڵام ئەوە هەیە کە فیعلەکە دەلالەتی لەسەر دەکات، وەك.

(لا یشربُ الخمر حین یشربُها و هو مؤمنٌ) کە ضە میرەکە لە (یشرب)دا بۆ (شاربٌ) دەگەڕێتەوە، کە لە (یشرب)ەوە، دەفامرێتەوە.

* * *

## ﴿نائب الفاعل﴾

**و منها: نائب الفاعل، و هو إِسم ناب عن الفاعل بعد حذفه، و تغيير صيغة العامل من المعلوم، إِلى المجهول، نحو: نصر العادل ، وأكرم العاقل، والأصل: نصر الله العادل، و أكرم الناس العاقل، فغيرت صيغة الفعلين إِلى المجهول، وحذف الفاعل، و جعل المفعول في محله، و إِعرب إِعرابه، و إِذا وجد المفعول به، في الكلام، فلا ينوب عن الفاعل غيره من المفاعيل.**

---

## ﴿باسی نائیب فاعیل﴾

**نائیب فاعیل:** ئەو ئیسمەیە، کە دوای حەزف بوونی فاعیل یان گۆڕانی صیغەی عامیلەکە، یان، دوای گۆڕانی فیعلەکە لە (مەعلوم) بۆ (مەجهول) لە جێگای فاعیل دابنیشێ، وەك (نصر العادل، أكرم العاقل) کە لە ئەصڵدا (نصر الله العادل) و( أكرم الناس العاقل)بون، کە (الله) و (الناس) حەزف بوون و (العادل ، العاقل) بوونە نائیب فاعیل! بەهۆی گۆڕانی فیعلەکانەوە، بۆ (مەجهول)! وە (مەفعول) خرایە جێگای (فاعیل) و بوویە (نائیب فاعیل) وە ئەو ئیعرابەی وەرگرت، وە (مەفعول بە) کە لەڕستەکەدا هەبووە، هەر ئەو دەبێتە (نائیب فاعیل) و (مەفاعیل)ەکانی ترنابن.

## ﴿الفعل المضارع﴾

**و مِنها فعل المضارع المجرد عن الناصب، و الجازم، نحو: يصل الأرحام، ألو الأحلام، والعامل فيه معنوي، و هو وقوعه موقع إِسم الفاعل.**

---

فیعلی موضاریعی ڕووت لە حاڵەتی ئەداتی ناصیبە و جازیمە، وەك (یصل الارحام، أو لو الارحام) وەعامیل تیایدا مەعنەوی یە، و کەوتۆتە جێگای ئیسمی فاعیل!

### ﴿مەرجەکانی عەمەلکردنی (أذن)﴾

(أذن): لەکاتێکدا دەبێتە (عامل: کارکەر) کە خاوەنی سێ مەرج بێت:

١–بۆ مانای (أستقبال: داهاتوو) بێت.

٢–لەسەرەتای کەلامەکەوەبێت.

٣–دەبێت فیعلە موضاریعەکە (إذن)ی پێوە لکابێت:

واتە: لەفزێکی تر نەکەوتبێتە نێوانیانەوە.

هەڵبەتە ئەگەر ڕستەی (قسم) بکەوێتە نێوان فیعلە موضاریعەکە، و (أذن)، لەم کاتەدا دیسانەوە (إذن)،نەصبە ئەدات، بە فیعلە موضاریعەکە، وەك: (أذن والله أکرمك) وە، وەك: ئەم شیعرە:

أذن والله.. نرميهم بحرب يشيب الطفل من قبل المشيب!

### ﴿ ئەوحەرفانەی کە فیعل مەجزوم دەکەن﴾

ئەمانە چەند حەرفێکن بە حەرفەکانی جازیمە ناو دەبرێن، وە فیعل مەجزوم دەکەن، پێنج دانەن:

(لم، لما، لام الأمر، لا النهي وأن الشرطية).

(لم، لما) بۆ گۆڕینی موضاریع دەبن بۆ ماضی، و نەفی کردنی لە ماضیدا.
وەك: (لم يضرب) کە ماناکەی پێشتر بەم شێوازە بوو، (لێدەدات پیاوێکی غائیب لە ئێستادا یان لە داهاتوودا)، کەچی کە (لم)ی چوویە سەر ماناکەی بەم شێوازەیە: (لێدەر نی یە، پیاوێکی غائیب لە ڕابردوودا).

## ﴿(لم): بۆنەفی کردنە لەکاتی ڕابردوودا﴾

(لم): بۆ نەفی کردنە لەکاتی ڕابردوو، (ماضی سادە)دا، بەڵام (لما) بۆ نەفی لە کاتی ڕابردوو (ماضی نەقلّی) دەهێنرێت، وەك: (ندم زيدٌ ولم ينفعة الندم: زەید پەشیمان بوویەوە، بەڵام ئەم پەشیمانییە، سودی پێ نەگەیاند).
واتە: (عدم النفع: سود پێ نەگەیاندن)ـەکە، لەدوای پەشیمانییەکە بووە، بۆیە پێویست (لازم) نییە، کە لە (لم)دا، (عدم النفع: سودنەگەیاندن) لەکاتی ڕابردوودا تا کاتی هەواڵدانەکە بەو شتە بەردەوامی و ئیستیمراریەتی هەبێت.
بەڵام لە (لمّا) دا، بەم شێوازە نییە، بەڵکو (عدم النفع: سودنەگەیاندن)ـەکە لە کاتی ڕابردووەوە، تا کاتی هەواڵدانەکە، بەو شتە بەردەوامی هەیە.
وە بزانە: (لم) لە گەڵ حەرفی شەرتی (أن)دا دێت، وەك:
(إن لم تفعل أفعل):ئەگەر نەیکەیت ئەیکەم.
(أفعل): جەوابە بۆ (إن).
بزانە: دروستە نەفی کردن بە (لم) بەردەوامی نەبێت، و کاتی بێت، وەك:
(لم يضرب): واتە لێدەر نەبووە، واتە پێ دەچێت لە دواییدا لێدەر بووبێت، (ثم ضرب)، پاشان لێدەر بێت.

وە دروستە حەزفی فیعلی (لما) بکرێت، وەك: (شارفت المدینة) كە (أدخلها) حەزف کراوە، واتە: رێز گیراو بووم، کە بەرەو شارەکە ڕۆیشتم، بەڵام هێشتا داخڵی شارەکە نەبووم.

(شارفت): فیعل وفاعیل. (المدینة): مەفعول.

## ﴿لێکچوونی(لم) و (لمّا)﴾

بەشێوەیەکی گشتی لە نێوان (لم) و (لمّا)دا لە چەند ڕوویەکەوە لێکچوون، و لە چەند ڕویەکەوە جیاوازی هەیە:

١-ئەو ڕووانەی کە تیایدا هاوبەشن و، وەك یەکن:

أ- لە چوونە سەر فیعلی موضاریع دا.

ب-جەزم

ج-نەفـــی!

د-گۆڕینی موضاریع بۆ ماضی.

هـ-حەرف بوون، (حرفیة).

٢-ئەو ڕووانەی کە تیایدا جیاوازن:

(لم) لەگەڵ ئەداتی (شەرط)دا، دەهێنرێت، بەڵام هیچ کات (لمّا) لە گەڵ ئەداتی (شەرط)دا، بەکار ناهێنرێت.

وەك: (أن لم تقم أقم: ئەگەر هەڵنەسیت، هەڵ دەسم).

بەڵام هیچ کات (إن لما تقم أقم) دروست نیە، و ناگوترێت لە (لم)دا دروستە، کە نەفی یەکەی بپچڕێت، وەك: (لم یکن، ثم کان: نەبوو، پاشان بوو).

بەڵام لە (لما) دروستە، کە فیعلەکەی حەزف ببێت، وەك: (قاربتُ المدینة فلمّا: بەنزیکی شارەکە گەیشتووم، بەڵام هێشتا نەچوومەتە ناویەوە)، بەڵام لە دوای (لم)، ئەم جۆرە حەزفە دروست نییە.

وە لە (لمّا)دا، چاوەڕوانی هاتنە دی فیعلەکە هەیە، بەڵام لە (لم)دا، ئەم جۆرە حوکمە بوونی نییە.

وەك: (لمّا یرکب الامیر)، هێشتا ئەمیرەکە سوار نەبووە، وە هەر بەم جۆرەیش لە (لمّا)دا، نەفی هەر لەکاتی ڕابردوەوە، تا ئێستا (حال) بەردەوامە، بەڵام لە (لم)دا بەردەوامێتی ناوێت، وەك: (لمّا یذوقوا عذابَ السّعیر)، و ئەم نەفی یە، تا هەر کاتێك کە هەواڵ بدەین، هەر بەردەوامیی هەیە.

بزانە کە: لە گەڵ (لما)دا، فیعلەکەش هات، ئەوا ئەو فیعلە بە واتای (انتظار– چاوەڕوانیی) دێت، وەك: (لما یذوقوا عذاب السعیر)، واتە: هێشتا سەختی دۆزەخیان نەچەشتووە، واتە: چاوەڕوانی چەشتنی دەکات.

بزانە: (لما) کە لەگەڵ فیعلی موضاریعدا هات، جازیمەی پێ دەوترێ، وە ئەگەر لەگەڵ ماضیدا هات، (ظرف) دەبێت، وە دەبێتە مەفعول فیه، بۆ فیعلە ماضی‌یەکە، جا فیعلی ماضی دوو جۆرە:

أ–لە (لەفظ، و مەعنا)دا، فیعلی ماضی‌یە، وەك (لما قمت): کاتێ کە تۆ هەستایت، من دەوەستم! (قمت) :( لەفظ، و مەعنا) ماضی‌یە، و (لما) ظرفە، بۆ فیعلەکە، و مەفعول بە، یە، لە مەحەلدا.

ب–(لەفظی موضاریع، و مەعنای ماضی)، وەك: (لم تقم قمت)، کە (لم تقم) لە (لەفظ)دا، موضاریعە، بەڵام لە مانادا ماضی‌یە، بە هۆی ئەوەوە

که (لم)ـی،چووەته سەر لێرەدا (لما)بووەتە(ظرف) بۆی وله مەحەلدا مەنصوبە.

بزانە: (لما) که لەگەڵ غەیری ماضی و موضاریعدا هات، ئەوە به واتای (إلا) دێت، وەك: (إن كل لما جميع لدينا محضرون) که لێرەدا: (لما) واتە: (إلا). واتە لەنێو بوونەوەردا نییە، هیچ کەسێك، (ئیللا:إلا) له لامان حازر دەبێت!

(و): عطف. (إن): حرف نفي. (كل): مبتدأ.

(لما): استثناء. (جميع): خبر. (لدينا): مفعول فيهِ.

(نا): مضاف إليه. (محضرون): خبر ثاني.

(لام الأمر): بۆ داوا کردنی کردنی کارێکە، وەك: (ليضرب زيد) پێویستە زەید لێدەر بێت،و ئەمەش دەچێتە سەر (شەش جۆر) له (غائیب) و سەر .. دوو جۆری (موتەکەللیم)، کەچی ناچێتە سەر (موخاطەب)، به مەجهولیی نەبێت، وەك: (لیضرب): بضم الياء، وفتح الراء.

## ﴿لامی ئەمر، و فیعلی ئەمر﴾

لامی ئەمر بۆ داواکردنی کارێکە، وە فیعلی ئەمر ئەو فیعلەیە که به هۆی ئەنجامی کارەکە، یان ڕوودانی حاڵەتێك به صیغەیەکی تایبەت، داوای کردنیان بکرێت، وە (لام)ـی، ئەمر له حاڵەتێکدا که فیعلەکە مەعلوم بێت، (بناء مجهول) نەبێت، تەنها سەر شەش صیغەی غائیب و دوو صیغەتی موتەکەللیم دەچێت، وەك: ليفعل – ليفعلا – ليفعلوا – لتفعلْ – لتفعلا – ليفعلْنَ – لأفْعلْ – لنفْعَلْ.

وە لەکاتێکدا که فیعلەکە مەجهول بێت، ئەوا لام دەچێتە سەر گشت صیغەکانی وەك:

لِيُنْصَرْ – لِيُنْصَرا – لِيُنْصَروا – لِتُنْصَرْ – لِتُنْصَرا – لِيُنْصَرْنَ – لِيُنْصَرْ – لِيُتْنَصرا – لِتُنْصَراوا – لِتُنْصَري – لِتُنْصَرا – لِتُنْصَرْنَ – لأُنْصَرْ – لِنَنْصُرْ.

(لا النهی): بۆ داوا کردنی نەکردنی کارێکە، وە دەچێتە سەر هەموو صیغەکان بۆ غائیب، وەك: (لا یضرب)، و موخاطەب، وەك: (لا تضرب) و موتەکەللیم، وەك: ( لا نضرب).

بزانە: کە(لاء)ـی، نەهی، دەچێتە سەر گشت صیغەکانی موضاریعی مەعلوم و مەجهول، بەم جۆرە:

موضاریعی مەعلوم: وەك: لا يَضْرِبْ – لا يَضْرِبا – لا يضْرِبوا – لا تَضْرب – لا تضربا – لا يَضْرِبنَ – لا تضرب – لا تضربا – لا تضربوا – لا تضربي – لا تضربا – لا تضربن – لا أضرب – لا نضرب.

موضاریعی مەمجهول، وەك: لا یضرب – لا یضربا – لا یضْربوا – لاتُضرب – لا تُضربا – لا یضْربنَ – لا تُضرب – لا تُضربا – لا تُضربوا – لا تضْربي – لا تضْربا – لا تضْربنَ – لا أضربْ – لا نُضْربْ.

*ئاگاداری: ئەو پێنج فیعلەی کە لە حاڵەتی ڕەفعدا، بە جەزم، نونی ڕەفعە کەیان لا دەچێت، وەك:

لنْ یکتبا – لم تکتبا – لم یکتبوا – لم تکتبوا – لم تکتبي.

وە کۆتایی ئەم چوار فیعلە موضاریعە لە حاڵەتی جەزم ساکن دەبێت، وەك:

لمْ یکتُب – لَمْ تکتُب – لَم أکتُب – لَمْ نکتُبْ.

(أن): دەچێتە سەر دوو فیعل، و یەکەم بە (فیعلی شەرط)، و دووەم بە (فیعلی جەزاء، یان، جەزاء شەرط) ناو دەبرێت، ئەگەر چووە سەر موضاریع مەجزومی دەکات، بەڵام ئەگەر پێش موضاریعە کە فیعلی

ماضی بوو، ئەوا بە مەجزومیی، و غەیرە مەجزومی دروستە، وەك:(إن قمت أقم) بە مەجزومی (أقوم).

وەك: (إن تقم أقم)، كە (أقم) بە هۆی (أن)ـەوە، مەجزوم بووە، ئەم (ئامراز: ئەدات)ـە، جازمانە بە (كلم المجازاة) ناوزەد كراون.

## ﴿عەلامەتی جەزم لە غەیری ناقیصدا﴾

عەلامەتی جەزم لە غەیری ناقیصدا، بە حەزفی حەرەكەی كۆتاییە، وەك: (لم یضرب)، وە یان بە حەزفی نون دەبێت، لە (تثنیة) و جەمعی موزەككەر و موفرەدی موخاطەبی(مؤنث)دا، وەك:

لم یضربا – لم تضربا – لم یضربوا – لم تضربوا – لم تضربي.

وە عەلامەتی جەزم لە فیلی ناقیصد ا بە حەزفی حەرفی عیللە، ( واو، ألف ، یاء)، دەبێت. وەك: لم یدع – لم یرض – لم یخْش.

*ئاگاداری: لە هەندێ جێگادا (إن)ی شەرطیە، دەچێتە سەر دوو فیعلی ماضی، كە لەم كاتەدا فیعلە ماضیەكە، لە ڕووی ماناوە، دەگۆڕێت بۆ موضاریع، بەڵام فیعلە ماضیەكە لە ڕووی لەفظەوە مەجزوم نابێت، چونكە فیعلی ماضی مەبنی یە، وەك: (إن ضربتَ ضربتُ: ئەگەر بوەشێنی ئەوە شێنم)، كە (إن)ـی، شەرطیەی (ضربْتَ): فیعل و فاعیلە، كە ئەم ڕستەیە لە مەحەلدا مەجزومە، و فیعلی شەرطە، (ضرَبتُ): فیعل و فاعیلە، و كە ئەم ڕستەیە، لە مەحەلدا مەجزومە، و جەوابی شەرطە.

– وە ئەگەر شەرط، موضاریع، و (جەزاء)، فیعلی ماضی بێت؟

لەم کاتەدا تەنها فیعلە شەرتەکە مەجزوم دەبێت، وەك: (إن تضربْ ضربتُ) کە (إنْ): شەرطیە، (تضْرِب): فیعل و فاعیلە، ئەم ڕستەیە لە مەحەلی جەزمدا، فیعلی شەرتە، (ضربْتُ): فیعل و فاعیلە، کە ئەم ڕستەیەش لە مەحەلدا مەجزومە، و (جەزاء)ـی، شەرتە.

چەند سوودێك: یەکەم: ئەوەیە کە لە پێش فیعلی جەزای حەرفی مەجزومەوە عەطف هات، سێ شێواز دروستە:

أ–بە هۆی عەطفەوە، مەجزوم کردنی مەعطوف.

ب–بە هۆی تەقدیرکردنی (أن)ـی، ناصیبەوە، مەنصوبکردنی فیعلەکە.

ج–مەرفوع کردنی بەوەی کە وا دانێیت، ڕستەیەکی سەربەخۆیە، وەك: (إن تأتني آتك فأحدثك).

مەبەست: ئەصڵی (آت– آتي) بووە، بە هۆی ئەوەوە کە جەزایە بۆ (إن): (یاء)ـەکە، بە هۆی مەجزومیەوە لاچوو.

وە بزانە: (أحدث) دروستە، بە جەزمی بیخوێنیتەوە، بە هۆی (فاء)ـی، عەطفەوە، وە دروستە مەنصوبی بکەین، بە هۆی تەقدیری (أن)ـی، ناصیبەوە، وە دروستە مەرفوعی بکەین، بە هۆی ئەوەوە کە ڕستەیەکی سەربەخۆی (استئناف)ییە.

وە بزانە: ئەگەر (أحدث) عەطف بکرێتە سەر، فیعلی شەرط، کە (تأتنی)یە، ئەوا (جەزم، و نەصب) جائیزە، و ڕەفع دروست نییە، بەڵام ئەگەر عەطف بکرێتە سەر (جەزاء شەرط)، کە (آتك)یە، ئەوا سێ شێوازەکە دروستن.

## ﴿ئەو ڕستەیەی کە عەطف کرابێتە سەر (جزاء، شرط)﴾

**سودی یەکەم:** دەربارەی ئەو ڕستەیەی، کە عەطف کرابێتە سەر (جەزاء شەرط)، وە ئەم ڕستەیە بەگوێرەی مەوقیعیەتی خۆی خاوەنی سێ جۆر ئیعرابە:

لەم جۆرەی مەعطوف لەسەر (جەزاء) دا:

ئەگەر مەنصوب بوو، ئەوە بە (أضمار: شاردنەوە)، و تەقدیری (أن)ـی، ناصیبەیە، و ئەگەر مەرفوع بێت، ئەوە (إستئنافية)یە، وەك: (إن تأتِني آتيك فأحدّثك: ئەگەر بێیت بۆ لام، ئەوا منیش دێم بۆ لات و ئەوسا قسەت بۆ دەکەم). (أن): شەرطیە، (تأت): فیعل و فاعیلە، (نون): ویقایە، یە، (یاء): منصوب بنزع الخافض، (فاء) عاطیفە، یان ئیستیئنافیە، یە!

(أُحدّث): فیعل و فاعیلە، (کاف): لە مەحەللی نەصبدا، مەفعول بِهِ، یە.

**دووەم:** دروستە حەزفکردنی فیعل شەرطی:(إن) بکرێت، کاتێك کە ئەو فیعلە (إلا)ی پێوە بوو، وەك: (قم وإلا أقم)، کە ئەصڵەکەی (وأن لا تقم أقم) بووە، حەزفی (تقم) کراوە، چونکە (لا)ـی، لە گەڵدا بووە.

## ﴿(قُم و إن لاتقم أقُم)﴾

(قُم و إن لاتقمْ أقُمْ): (قُم): فیعل و فاعیلە، (واو): عاطیفەیە، (إن): شەرطیە، (لاتَقمْ): فیعل و فاعیلە، ئەم ڕستەیە، جەزای شەرتە، کە لە نموونە باسکراوە کەی سەرەوەدا، فیعل شەرتەکە، (تتم) حەزف بووە.

**سێیەم:** زۆر جار ڕستەی شەرطیە، لە (إن)ـی، شەرطیەدا عەطف دەکرێتە سەر ڕستەیەکی مەحزوف، هەر وەك، (لو)ـی، شەرطیە، وەك چۆن لە گەڵ فیعلە شەرطەکەیدا عەطف دەکرێتە سەر ڕستەیەکی شەرطیەی مەحزوف،

بەو شێوازەش (أن شرطية) عەطف دەكرێتە سەر ڕستەی (شرطیە)، وەك: (تصدق و إن كان درهما)، كە ڕستەی (وإن كان درهما) عەطفە لە سەر ڕستەی (و إن كان زائدا)، وە هەروەها وەك: (أكرم الضيف ولو كان كافرا)، كە (و لو كان كافرا) عەطفە، لە سەر (و لو كان مؤمنا).

(أكرم)، (تصدق): فعل أمر. (الضيف): مفعول.

(درهما)، (زائدا)، (كافرا)، (مؤمنا): خبر كان.

## ﴿ڕستەی شەرط عەطف دەكرێتە سەر ڕستەی مەحزوف﴾

لە زۆر جێگادا ڕستەی شەرط، عەطف دەكرێتە سەر ڕستەی مەحزوف، وەك، (لو)ـی، شەرطیە، واتە: هەر بەو شێوازەی كە ئەو شتەی (لو)ـی، چووەتە سەر مەعطوفە لە سەر ڕستەیەكی حەزفكراو، ئەو ڕستەیەش كە لە گەڵ (إن)ـی، شەرطیەدا دێت، دیسانەوە لەم قاعیدەیە دەرنەچووە، و مەعطوفە لەسەر ڕستەیەكی مەحزوف.

وەك: (تصدّق و إن كان درهماً) كە خۆی (تصدّقْ وإن كان زائداً و إن كان درهماً) بووە.

ئەگەر جائیز نەبوو، فیعلی جەزاء بكرێتە شەرط، لەوێدا واجبە (فاء)ـی، بچێتە سەر، وەك لەم جێگایانەدا:

١-ڕستەی ئیسمیە، وەك: (و إن يمسسك بخير فهو على كل شئ قدير) كە (هو): مبتدأ، (على كل خير): خەبەر، كە ئەم ڕستە ئیسمیە، ناتوانێت ببێتە شەرط، چونكە شەرط دەبێت فیعل بێت، نەك ئیسم، وە لەبەر ئەوەی جەزای (إن) دروست بوو، بۆیە دەبێت (فاء)ـی، بچێتە سەر.

٢- ڕستەی (طلبية)، وەك: (أن كنتم تحبون الله فاتبعونی).

(اتبعوا): فیعلی ئەمرە، وە جەزایە بۆ (إن)، بۆیە بە واجبی (فاء)ـی، چوویە سەر.

٣–فیعلی جامد، وەك: ﴿ وَ لَوْلاَ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَاءَ اللَّهُ لاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ إِنْ تُرَنِي أَنَا أَقَلَّ مِنْكَ مَالاً وَوَلَدًا(٣٩)فَعَسَى رَبِّي أَنْ يُؤْتِيَنِي خَيْرًا مِنْ جَنَّتِكَ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِنْ السَّمَاءِ فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا(٤٠)﴾.

(عسی) فیعلی جامیدە، و جەزایە بۆ (إن)، و بە واجبی (فاء)ـی، چووە سەر.

٤–فیعلی ماضی کە (قد)ـی، چووبێتە سەر، وەك (إن سرق فقد سرق أخ)، کە (قد سرق)، (فاء)ـی، چووە سەر.

٥–فیعلی موضاریع کە (سین)ی پێوە بێت، وەك: (إن جاء فسيأتي عمرو) کە: (سيأتى)، (فاء)ـی، چووە سەر.

٦–فعلی موضاریعی (لن) چووبێتە سەری، وەك: ( و ما تفعلوا من خير فلن تکفروه).

٧–فیعلی جەزاء کە (ما)ـی، نافیەی پێوە بێ، وەك: (فأن توليتم فما سألتكم من أجر).

٨–فیعلی جەزاء، کە (لا)ـی، پێوە بێ، (لێرەدا خیلافی لە سەرە):

ئەگەر دروست بێت، کە جەزاء، بکرێتە (شەرط)، لێرەدا دوو شێواز هەیە، بۆیە ئەگەر جەزاء فیعلی ماضی بێت، لە ماناوە، بە بێ(قد)، وەك: (إن قمت لم يقم عمرو)، لێرەدا (فاء) دروست نییە، بچێتە سەر (جەزاء).

وإلا فوجهان: ئەگەر جەزاء ماضی نەبوو، لە لەفظ ومەعنادا، دوو شێواز دروستە:

١–(فاء): دروستە هەبێت، وەك: (إن ضربتني فأضربك).

٢–(فاء) نەبێت، وەك: (إن ضربتني أضربك).

## ﴿ (أشياء الستة: شەش شتەکە) ﴾

هەر بەو شێوازەی کە فیعلی موضاریع لە دوای (فاء) لە جەوابی (أشياء الستة: شەش شتەکەدا) بە (أن)ـی، موقەددەرە مەنصوب دەبوو، ئەوا دیسانەوە بە (أن)ـی، موقەددەرە مەجزوم دەبێت، تەنها بەو جیاوازییەوە کە موضاریعی مەجزوم نابێتە جەوابی نەفی:

١–ئەمر: وەك: (آتيني أكرمْكَ).

٢–نەهی: وەك: (لا تَكْفُرْ تدخُل الجنّة: کافر مەبە، دەچیتە بەهەشتەوە)، ڕێگری کراوە، کە بگوترێ: (لا تكفر تدخل النّار: کافر مەبە، بەهۆی ئەوە کە نەچیتە نێو ئاگرەوە)، چونکە کافر نەبوون، هۆکاری چوونە ئاگرێ نییە، بۆیە دەبێت فیعلە موضاریعەکە بە ڕەفع بخوێنرێتەوە، وەك: (لا تكفرْ تدخُل النّار: کافر مەبە، چونکە ئەچیتە دۆزەخەوە).

٣–ئیستیفهام: وەك: (أين بيتُك أزُرْكَ).

٤–(تمنيّ): وەك: (وليتني عنْدكِ أفُزْ).

٥–(عرضْ)، وەك: (ألا تنْزل بنا تنصبْ خيراً منّا).

لە سەرجەم ئەو ڕستانەدا کە هاتوون، هاتنی ڕستەی دووەم، لە سەر ڕستەی یەکەم وەستاوە، واتە: ئەگەر ڕستەی یەکەم ڕوو بدات، ئەوا ڕستەی دووە میش دێتە دی.

## ﴿ باسی ئەو ئیسمانەی کە جەزمە دەدەن، بە فیعلی موضاریع ﴾

فیعلی موضاریع: ئەو فیعلەیە کە شەباهەت و لێکچوونی لە گەڵ ئیسمدا هەیە، وە فیعلی موضاریع لە سەرەتایەوە، یەکێك لە پیتەکان (أنيتُ) دێت، وەك: (يفعل–تفعل–أفعل–نفعل)، وە ئەم پیتانە بە (مُضارِعة) ناوزەد

کراون، چونکە فیعل بە هۆی ئەم حەرفانەوە، لە گەڵ ئیسمدا لێکچوون، پەیدا دەکات، وە فیعلی موضاریع لە ڕووی حەرەکات و سەکەناتەوە، هاو وەزنی ئیسمە، وە مەبەست: لە هاو وەزن بوون، لە ڕووی ئیصطیلاحی (عەروض)ـەوەیە، وە لە زانستی (عروض)دا، دوو ووشە، لە کاتێکدا بە هاو وەزن دادەنرێن، کە لە ڕووی حەرفەکان، و حەرەکاتەکانەوە بەرامبەرییان هەبێت، واتە: ژمارەی پیتەکان لە هەر دووکیاندا یەکسان بن، بۆ وێنە: (توتی) و (بُلبُل)، لە ئیصطیلاحی زانستی (عروض)دا، هاو وەزنن، چونکە:

*یەکەم:* ژمارەی حەرفەکانی هەردووکیان یەکسانن.

*دووەم:* حەرفی یەکەم، و سێیەم لە هەردووکیاندا موتەحەڕیکن.

جا هەر لەمەشەوە فیعلی موضاریعی (یضربُ) لە ئیصطیلاحی زانستی (عروض)دا، لەگەڵ ئیسم فاعیلی (ضارب)دا، هاو وەزنن.

لە ڕووەکانی تری لێکچوونی فیعلی موضاریع بە ئیسمەوە، ئەوەیە کە لامی تەئکید:(لامی ئیبتیدائیەت) بە سەرەتای فیعلی موضاریع و ئیسمەوە دەلکێت، وەك:( إن زيداً ليقوم)، هەر وەك لـــــە ئیسمیشدا (إن زيداً لقائمٌ) دەووترێت، و فیعلی موضاریع و ئیسم فاعیل لە ڕووی یەکسانی حەرفەکانەوە دیسانەوە وەك یەکن، وە هەر بەم شێوازەیش فیعلی موضاریع و ئیسم لە ڕوویماناوە هەردووکیان هاوبەشن، لە نێوان (حال: ئێستا) و (مستقبل: داهاتوو)دا.

هەڵبەتە هەندێکیش گوتویانە: حاڵ و داهاتوو هەردووکیان مانای حەقیقی یەکەی حاڵ، و مانا مەجازییەکەی بۆ موستەقبەلە.

وە هەندێکیش ئەم لێکدانەوەیەیان بە بەهێز داناوە، چونکە فیعلی موضاریع هەر کات بە بێ نیشانە (مجرّد عن القرائن) بەکار هێنرا، ئەوا لە سەر (حال)

حیساب دەکرێت، وە لە زەمانی (مستقبل)دا، بە بێ نیشانە (قرینة) بە کار ناهێنرێت.

لە بەر ئەوەی کە لەسەر واتای (أن)ـی، شەرطیە، دامەزراون، و بە (کلم المجازات) ناو دەبرێن، چونکە پێویستیان بە (جەزاء) هەیە، کە ئەمانەن: (متی... کیفما، إذا)، وە بزانە: (إذ، حیث) هەمیشە (ما)یان لەگەڵدایە، ئەگەر لە گەڵیاندا نەبوو، ئەوا جازمە نین، (متی، إذما) بۆ (زەمان) کات بە کار دێن، وەك (متی تقم أقم: هەرکات هەستایت، هەڵدەستم).

*(إذْما): ئەو ئەداتە شەرتەیە، کە دوو فیعل مەجزوم دەکات، وە لە لای (سیبویە) حەرفی شەرتە، وە لە لای زانایان، (مبرّد) و (إبن سرّاج) و (فارسی) ظەرفە، وە هەندێکیش ڕایان وایە، کە عەمەلی (إذْما)، کە جەزم دانە بە دوو فیعل، تەنها لەکاتی زەرورەتدایە!

(أینما، حیثما) بۆ (مەکان: شوێن) بەکاردێن، وەك: (أینما تکن أکن: لە هەر شوێنێك دانیشتی دائەنیشم). (أنی): وەك: (أینما، متی) وایە، بۆ زەمان، و مەکانیش بەکاردێت، وەك:(أنی تقعد أقعد: لە هەرشوێنێ دانیشی دائەنیشم). بۆ زەمان وەك:(أنی تصم أصم: هەر کاتێ بە ڕۆژوو بیت، منیش بە ڕۆژوو دەبم).

(مهما)، وەك: (متی) وایە، بۆ زەمانە، وەك: (مهما تسافر أسافر).

هەندێ دەڵێن (مهما) :(بسیط:سادە)یە، واتە: هەر خۆی وابووە، و (مهما) بووە، و مورەککەب نییە، وە هەندێ دەڵێن (مهما): مورەککەبە لە (ما)ـی، شەرطیە، و (ما)ـی، زائیدە، کە ئەلفی (ما)ی یەکەم کرا، بە (ها)، لە بەر خۆپاراستن لە دووبارە بوونەوەی ئەلفەکە، چونکە ئەگەر نەگۆڕایە (ماما) دەبوو، وەك پێشتریش ووتمان، یاخود (مهما) لە (مە) و (ما)ی شەرطیە،

پێکهاتووە، کە (مە) واتە: واز بێنە، وەك ئەوەی کەسێ بڵێ (لا تفعل ما أفعل: ئەوەی من دەیکەم، تۆ مەیکە)، تۆیش لە وەڵامدا بڵێیت:(مهما تفعل أفعل: کە تۆ کردت، منیش دەیکەم).

## باسی (من)، و(ما)، و هی تریش...

(مَن): بۆ عاقڵ بەکاردێت، وەك (من تکرم أکرم).

(ما): بۆ غەیرە عاقڵ بەکاردێت، وەك: (ما تصنع أصنع) یان ( و ما تفعلوا من خیر یعلمه الله).

## لەفزی (ما) لە قورئانی پیرۆزدا

لەفزی (ما) لە قورئانی پیرۆزدا، بۆ شەش مانا بەکار هاتووە:

*یەکەم:* (ما) بە مانای (نەء) هاتووە، وەك ئەم ئایەتە (أُوْلَئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلاَ النَّارَ) ئەوانە بێجگە لە ئاگر شتی تر ناخەنە،... (نا)خەنە، ناو سکیانەوە. البقرة/١٧٤.

*دووەم:* (ما) بە مانای (نی یە)یە، وەك ئەم ئایەتە: (وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا قَالَ يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ): وە بۆلای هۆزی سەمود برای ئەوان ساڵحمان نارد، ووتی: ئەی هۆزی من خوا بپەرستن کە بێجگە لەو بۆ ئێوە پەرستراوێکی —بەهەقی—تری نی یە، هود/٦١.

*سێیەم:* (ما) بەمانای (ئەوەی کە) هاتووە: وەك ئەم ئایەتە (وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالأُنْثَى): وە بەو زاتەی کە نێر و مێی خولقاندووە. اللیل/٣.

*چوارەم:* (ما) بەمانای (کام شت) هاتووە، وەك ئەم ئایەتە: (أَمْ كُنتُمْ شُهَدَاءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنْ بَعْدِي) یا لە سەرەمەرگی یەعقوبدا حازربوون و —دیتان— ئەو دەمەی وا بە منداڵەکانی خۆی ووت: دوای من چی ئەپەرستن. البقرة/١٣٣.

پێنجەم: (ما) بەمانای (صلة)ـەی، زیادە لە کەلامدا دێت، هەر وەك لەم ئایەتەدا هاتووە، (فبما رحمة من الله لنت لهم: لەبەر تیشکی ڕەحمەتی خوا بوو، کە بۆ ئەوان نەرم و دلۆڤان بووی، آل عمران/١٥٩.

شەشەم: (ما) بەمانای (هەروەك چۆن) هاتووە، وەك ئەم ئایەتە: (فَأَمَّا الَّذِينَ شَقُوا فَفِي النَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ، خَالِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتْ السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ): جا ئەوانەی بێ بەخت بوون لە ئاگردان و ئەوانە لەوێدا هەناسە زۆر بە سەختی و توندی هەڵدەکشێن، بە شێوەیەك کە دەنگێکی زۆر نــاخۆشیان لێوە دەردەچێ، بۆ هەمیشە لەوێدا ئەمێننەوە تا ئاسمان و زەوی هەبن، هود: (١٠٥/١٠٦).

(أی): بۆ عاقڵ، و غەیرە عاقڵ بەکاردێت،وەك:(أیا تضرب أضرب)،بۆ عاقڵ. (أیا تصنع أصنع) بۆ غەیرە عاقڵ.

ئەگەر ئەم (کلمات المجاز)ـانە بە غەیری ئەم مانایانە بێن، نابنە (کلم المجاز) وەك باس دەکرێ.

## ﴿لەقورئانی پیرۆزدا (سماء) بە پێنج جۆر هاتووە﴾

– لە قورئانی پیرۆزدا (سماء) بە پێنج جۆر هاتووە:

یەکەم: (سماء) بەمانای سەقفی خانوو هاتووە: وەك ئەم ئایەتە: (فلیمدُد بسبب إلی السماء).

دووەم: (سماء) بە مانای هەور هاتووە، وەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: (وأنزل من السماء ماءً).

سێیەم: (سماء) بە مانای باران هاتووە، وەك ئەم ئایەتە: (یرسل السماء علیکم مدْراراً).

*چوارەم:* (سماء) بە ماناى خودى ئاسمانيش هاتووە، وەك ئەم ئايەتە پيرۆزە: (والسماء بنيناها بأيد).

*پێنجەم:* (سماء) بەماناى ئاسمانى بەهەشت و دۆزەخ هاتووە، وەك ئەم ئايەتە: (خالدين فيها مادامت السموات والارض).

کەچی (من) بۆ غەيرە عاقڵ بەکاردێت، وەك (ومنهم من يمشى على أربع) کە لێرەدا بۆ ئاژەڵى غەيرە عاقڵ هاتووە.

(متى): بۆ (إستفهام)ـە، وەك (متى تقوم: کەى دەوەستى)، کە لێرەدا جازمە نييە، چونکە بە ماناى (إستفهام) هاتووە.

(متى): أداة إستفهام، مفعول مقدم. تقوم: فعل مضارع.

بۆيە مەفعول پێش فيعل کەوتووە، چونکە (هل) دەبێت لەسەرەتاى ڕستەدا بێت، وە هەروەها ڕستەى (متى القتال: کەى شەڕە)، (متى) خبر مقدم، (القتال): مبتدأ مؤخر.

(متى): بۆ عاقڵ و غەيرە عاقڵ دەبێت، کە لە نموونەى (متى تقوم) بۆ عاقڵە. (متى القتال): بۆ غەيرە عاقڵە.

(أين): بۆ ئيستيفهامە، وەك: (أين تكون، أين زيد).

(أنى): بۆ ئيستيفهامە بە ماناى مەکان دێت، بۆ هەواڵ پرسينى (حال)يش دەبێت، وەك: (أنى زيد؟)، زەيد لە کوێ يە؟.

*** لە قورئانى پيرۆزدا، لەفزى (أنى) بەسێ شێواز بەکار هێنراوە:**

*يەکەم:* (أنّى) بەماناى (چۆن) هاتووە، وەك ئەم ئايەتە: (أَنَّى يُحْيِي هَذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا)، خوا چۆن لە دواى مردن ئەمانە زيندوو دەکاتەوە، البقرة/ ٢٥٩.

*دووەم:* (أنّى) بەماناى (لە کوێوە) هاتووە، وەك ئەم ئايەتە: (أَنَّى لَكِ هَذَا) ئەى مەريەم؟ ئەمەت لەکوێ بوو، آل عمران/٣٧.

سێیەم: (أنّى) بە مانای سەعات و کات و سات دێت، وەك ئەم ئایەتە: (آناء اللّيل وهُم يسجدون: شەوانە ئایەتەکانی خوا ئەخوێننەوە، و سوجدە بۆ خوا ئەبەن. آل عمران/١١٣.

وە لە سورەتی (طه)دا دەفەرموێت: (ومِنْ آناءِ اللّيل: وە هەندێ لە کاتژمێر گەلی شەو، طه/١٣٠).

(أين هو): واتە: ئەو ئەحوالّی چۆنە؟

وە بە مانای (متى)ی ئیستیفهامیە دێت، وەك: (أنى القتال) کەی شەڕە؟

(من) بۆ ئیستیفهامە، وەك: (من أنت): تۆ کێی؟

(مهما): بۆ ئیستیفهامی زەمانە، وەك: (مهما لي الليلة) ئەمشەو بۆ من چ شەوێکە؟

(مهما): بە مانای (ما)ی شەرطیە دێت، وەك: (مهما نذره من الهيئة المشروعة انقعد: ئەگەر شتێك بکاتە نەزر، و ئەو شتە دروست بێت، کە بکرێتە نەزر، ئەوا ئەو کارە دروستە).

کە لێرەدا (مهما) بە مانای (ما)ـی، شەرطیە، هاتووە.

(ما): بۆ ئیستیفهام دێت، وەك: (ما هذا).

بە مەوصوفەیی دێت، وەك (مررت بما معجب لك)، کە (معجب) صیفەتە بۆ (ما).

وە بە (صفة)یـی، دێت، واتا (ما) صیفەت بێت، بۆ مەوصوفێك وەك:

(أضربه ضربا ما): کە لێرەدا (ما)، واتە: (چ لێدانێ بە زەبر!)، کە (ما) صیفەتە بۆ (ضربا).

وە بە مەوصولەیی دێت، وەك: (فيهِ ما فيهِ)، کە (ما): بە واتای (الذي): مەوصولە هاتووە.

وە بە (تامة)یی، دێت، واتە: پێویستی بە صیفەت نەبێت، وەك: (ما أحسن زیدا!).

## ﴿ هاتنی (من) بۆ غەیری عاقڵ ﴾

- لە سێ شێوازدا (من) بۆ غەیری عاقڵ بەکاردێت:

١-هەرکات غەیرە عاقڵ، لە جێگای عاقڵ، بە کار بهێنرێت، وەك:

أسرب القطا هل من يعير جناحه لعلي إلى من قد هويت أطيرُ.

واتە: ئەی پێڕی باڵندەکانی (قەتێ) -جۆرە باڵندەیەکە- ئایا کەسێك لەناو ئێوەدا هەیە، کە باڵەکانی بدات بە لامەوە، بۆ ماوەیەك، تا بە هۆی ئەو باڵانەوە، خۆم بگەیەنمە لای ئەو کەسەی کە دەمەوێت، و فڕەی باڵ لێبدەم بۆ لای؟!

کە لەم نموونەیەدا (من) بۆ غەیری عاقڵ بە کار هاتووە، چونکە شاعیر باڵندەی (قەتێ)ی، لە پلەی عاقڵدا فەرز کردووە، وە هەروەك مرۆڤ خیتابی ڕووبەڕوو کردوونەتەوە.

٢-وە یان غەیرە عاقڵ، و عاقڵ پێکەوە باس بکرێن، بۆیە لەم شێوازەدا (من) بۆ غەیرە عاقڵ، لەبابی (تەغلیب: گشتاندن)دا، بەکاردێت، وەك: (يسجدُ له من في السماوات والأرض: سوجدە بۆ خوا دەبات، سەرجەم ئەوانەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەن).

ئیتر هاوبەش لە نێوان عاقڵ و غەیرە عاقڵدا، کە (مَنْ)، بۆ غەیرە عاقڵیش لە بابی (تەغلیب: گشتاندن)دا، بە کار هاتووە.

(تغليب: واتە زیاترەکەیان حیسابی بۆ کراوە).

٣-غەیرە عاقڵەکە لکابێت، بە عاقڵەکەوە، بەو مانایەی کە لەفزێکی گشتی بە کار بهێنرێت،کە غەیرە عاقڵ، و عاقڵیش لە ژێر ئەو عاممەدا جێگای ببێتەوە، وەك: ﴿ وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِنْ مَاءٍ فَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى بَطْنِه وَمِنْهُمْ مَنْ

يَمْشي عَلَى رِجْلَيْن وَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ يَخْلُقُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ(٤٥)﴾.

كە لەم جێگایەدا، چونکە غەیرە عاقڵ، (من یمشی علی بطنه) لەگەڵ عاقڵدا (من یمشي علی رجْلین) هاتووە، و پێوەی لکاوە، بۆیە (من)، بۆ غەیرە عاقڵیش بە کار هێنراوە.

بە هۆی (کیفما و إذا)وە، (جەزم)دان، زۆر کەمە.

## ﴿کیفما تکن أکن﴾

لەڕووی (مانع)بوون، و مەحاڵ بوونی مانا لە (کیفما)دا، چونکە لە شتە مەحاڵەکانە، کە موتەکەللیم، لە هەموو حاڵەتێکدا، لە گەڵ کابرای موخاطەب دا هاوڕا بێت، وەك: (کیفما تکن أکن: هەرچۆن و هەرشێوازێك ببیت منیش وا دەبم).

بۆیە ئیحتیمالی ئەوە هەیە، کە کابرای موخاطەبی ئەم کەلامە نەخۆش بێت، و موتەککەللیم ئەم حاڵەتەی نەبێت، وە هەر بەم جۆرەش لە نێوان مانای (إذا) و (أن)ـی، شەرطیەدا جیاوازی هەیە، چونکە (إذا) بۆ تەخصیص، و (أن)ـی، شەرطیە، بۆ (تعمیم: گشت گرتنەوە) بە کار دەهێنرێن، وەك: (أنا آتیك إذا حمّر البسرُ: من دێم بۆ لاتان، هەرکات کە خورما سور بوو)، وە (إن تأتني أکرمكَ: ئەگەر بێیت بۆ لام، ڕێزت دەگرم).

جا خوێنەری بەڕێز بزانە: خەبەر ئەو کەلامەیە کە موتەککەللیم، بە هۆیەوە کابرای موخاطەب، لە کار، و کردارێکی خاریجی ئاگادار دەکاتەوە، و هەواڵی دەداتێ، و ئەگەر هەواڵەکە هاوڕێکی واقیع بوو، ئەوە بە خەبەرێکی ڕاست دادەنرێت، بەڵام ئەگەر ئەو هەواڵە لە خارجدا بوونی نەبوو، و وانەبوو، ئەوا بە خەبەری درۆ لە قەڵەم دەدرێت، بۆیە دەتوانرێت، بگوترێت، خەبەر ئەو گوتەیەیە کە: ئیحتیمالی (صدق و کذب: ڕاست و درۆ)ـی، هەیە، وە بە کابرای بێژەریش دەتوانین، ڕاستگۆیی، یان درۆزنی، ئاماژە پێ بکەین، وەك: (ألکتابُ خیر جلیسٍ)-(الحسود لا یسود).

## ﴿الباب الثانى : في الفضلة﴾

## ﴿المفعول بِهِ﴾

**فمنها المفعول به: و هو أِسم، ما وقع عليه فعل الفاعل، نحو: علمت التلميذ، والاصل تأخّره عن الفعل والفاعل، كما ذكرنا، وقد يتقدم عليهما لأِقتضائه الصدر، نحو: من أرسلت الى الحبيب، أو على الفاعل فقط، نحو: ما وصل المقصود اِلاّ الطالب، وقد يحذف عامله جوازاً، كقولك: مكة... في جواب: أين تريد؟**

---

### ﴿باسی مەفعول بە﴾

لە بابەتی فوضلە، (مەفعول بە)یە، کە ئەو ئیسمەیە کەکاری کارکەرێکی بەسەردا ئەنجام دەدرێ، وەك "علمت التلميذ" وە لەئەصڵدا دواکەوتنیەتی لە فیعل و فاعیل، وەك باس کرا، وە هەندێ جار پێش دەکەوێ، چونکە واپێویست دەکات، کە لەوێدا پێش بکەوێت، وەك "من أرسلت الى الحبيب"، یان هەندێ جار پێش فاعیل دەکەوێت وەك: "ما وصل المقصود الا الطالب" وە هەندێ جار عامیلەکەی مەحزوف دەبێت، وەك دەڵێیت: "مكــة" لە وەڵامی کەسێکدا، کەدەڵێت:(أين تريد؟).

و وجوباً في مواضع: منها المنصوب على التحذير، نحو: الأسد الأسد، أي احذر، أو على الأغراء، نحو: أخاك.. أخاك.. أي: ألزم، أو على الأختصاص، وذلك إمّا أسم معرف باللام، كقولك:( نحن العلماء ورثة الأنبياء)، أي نخص العلماء، أو إسم مضاف، كقولك:(نحن معشر الطلاب نريد أستاذاً يهدي للصواب)، أو أيّها كصورته في النداء موصوفاً بصفة معرفة، واقعاً بعد ضمير المتكلمّ، نحو: (نحن أيّها الخدام للإسلام، نحتاج إلى مزيد الأقدام، و الأهتمام).

---

وە لەهەندێ شوێندا واجبە، کە عامیلەکەی مەحزوف بێت، وەك ئەو شوێنەی کە بۆ (تحذیر: ئاگادارکردنەوە)یە،کە دەڵێت، (الأسد الأسد: شێرەکە، شێرەکە)، واتە: (أحذره: بێداربەلێی)، یان بۆ ئەوەی کەسێك ئامۆژگاری و بێدارکەیت، وەك (أخاك أخاك: براکەت ، براکەت)، واتە: بێداربەو پێوەی پابەندبە، یان لەکاتی تایبەت کردندا، ئەمەش یان لەگەڵ ئەلف و لامی تەعریفدایە، وەك "نحن العلماء ورثة الأنبياء" واتە (نخص العلماء: زاناکان تایبەتن لەوەدا)، یان لەگەڵ ئیسمێکی موضافدا، وەك:(نحن معشر الطلاب نريد أستاذاً يهدي للصواب) یان لەگەڵ (أيها)ا، وەك: لە "نداء"دا دێت، کە وەصف کرابێت، بە صیفەتێکی ناسراو، کە کەوتبێتە دوای ضە میری موتەکەللیم وەك : (نحن أيها الخدام للأسلام، نحتاج ألى مزيد الأقدام والأهتمام).

## ﴿المنـــادى﴾

ومنها المنادى، و هو المطلوب إِقباله بحرف نائب مناب أدعو، و ينصب لفظاً، أو محلا على المفعولية له، فإن كان مفرداً معرفة، أو نكرة مقصودة، بُني على الضمّ، أو نائبه، و هو اَلف المثنى، و واو الجمع، نحو: يا زيد، و يا رجل خذ بيدى، و إِن كان نكرة غير مقصودة، أو مضافاً، أو شبهه أعرب بالنصب، أو نائبه، و هو الياء، نحو: يا رجلاً، و يا غلام الأمير، و يا ساعياً في الخير، و يا مسلمي البلد، خذوا بيدي، و نِعْمَ ما قال الشاعر:

ياسيّد الأنام، يا ذا الجاه　　　كن لي شفيعاً يوم وعد الله

---

## ﴿باسی مونادا﴾

مونادا: ئەوەیە کە داواکراوە، بێتەدی! وە بەحەرفێك دەردەبڕدرێ، کە لەجێی (أدعوا) دادەنیشێ، و مەنصوب دەکات، لە لەفزدا یان لە مەحەلدا، (بناء) لەسەر مەفعولیەت بۆی! ئەگەر موفرەدی مەعریفە بوو، یان نەکیرەی (مەبەست دار:مقصود) بوو، (وەك باسکرا) مەبنی دەبێت، لە سەر (ضمّ)ـە، یان مەبنی یە، بە (ألف و واو) لە (مثنى و جمع)دا، وەك: (یازید)، و(یا رجل خذ بیدي) وە ئەگەر نەکیرەی مەقصودە بوو، یان موضاف بوو، یان (شبهـ مضاف) بوو، ئەوە ئیعرابەکەی بە نەصبە، یان بە نائیبی نەصبە،یە. کە (یاء)ە، وەك: (یارجلاً، ویا غلام الامیر ویا ساعیاً فی الخیر، ویا مسلمی البلد خذوا بیدي).وە هەروەها:

**یاسید البشر یا ذا الجاه　　　کن لي شفیعاً یوم وعد الله**

* * * *

## ﴿المفعول المطلق﴾

و منها المفعول المطلق، و هو إسم ما فعله فاعل العامل المذكور، ويأتي على مأخذه كثيراً، نحو: نصرت فلاناً نصراً، وأجتهدتُ أجتهاداً، و قد يأتي بغير لفظه، نحو: هديتُ الطالبَ أرشاداً، و قعدت جلوساً.

---

## ﴿باسی مەفعول موتلەق﴾

مەفعول موتلەق: ئیسمێکە کە کارکەرێك ئەو کارەی کردبێت، و عامیلەکەی لەوڕستەیەدا هاتبێت، وە زۆر بەکار دێت، وەك (نصرت فلاناً نصراً، وأجتهدت أجتهاداً) کە (نصراً وأجتهاداً) مەفعول موتلەقن، و عامیلەکانیان باس کراون، و هەندێ جار بەغەیری لەفزەکە دێن، وەك (هديت الطالب ارشاداً، وقعدت جلوساً) کە (أرشاداً ، جلوساً) لەفزەکەیان جیایە، لە فیعلەکانیان.

***ڕوونکردنەوە: عامیلی سەر مەفعول موتلەق دەبنە سێ بەش:**

**١.مەصدەر:** ئیتر چونیەکە ئەو مەصدەرە کارکەرە "عامل"ە، وەك لەفزی مەعمولەکەبێت، وەك: (فإن جهنّم جزاؤُكم جزاءاً مَوفوراً)، چونکە بەشی یەکەم (جزاؤكم) لەبەشی دووەم دا کاری کردووە، و هەردو کیشیان یەك لەفزیان هەیە.

وە یان جاری وا هەیە مەصدەرەکە، هاو لەفز نییە، لەگەڵ مەعمولەکەدا بەڵکو هاومانان، وەك: (أعجبني قعُودكَ جُلوساً).

**٢.فیعل:** کە ئەمیش دیسان دوو بەشە:

یان لە لەفزی مەصدەرەکەیە، و وەك یەکن، وەك: (كلم الله موسى تكليماً) چونکە (كلّم) لە (تكليماً) دا کاری کردووە و لە لەفزەکەی ئەوە، وە هەروەها وەك: (أنّهم يكيدون كيداً).

وە یاخود لەوانەیە لە مانادا وەك مەصدەرەکە وابێت، نەك لە لەفزدا وەك: (قعدتُ جلوساً) هەرچەندە هەندێك لە زانایانی نەحو (سیبویە و شوێنکەوتوانی) لەم بەشەدا عامیلەکە بەموقەددەر ئەزانن، و بەم جۆرە تەقدیریان کردووە، (قعدت و جلستُ جلوساً).

٣.وەصف:وەك، ئیسمی فاعیل و ئیسمی مەفعول و.. ئەمیش یان وەك لەفزی مەصدەرەکە وایە، وەك: (والصّافات صفاً، هو مضروبٌ ضرْباً).

وەیان لەمانادا وەك مەصدەرەکە وایە، وەك: (أنا قاعدٌ جلُوساً).

## ﴿دەربارەی مەفعول موتلّەق﴾

(مفعول مطلق ):مەصدەرێکە کە هاوجینس یاخود هاومانای فیعلێك بێت . کە پێشتر باس کرا بێت.جاری واهەیە کەمەفعول موتلّەق جۆری فیعلەکە ڕوون ئەکاتەوە (نظرت فی الکتاب نظر المحقق)، وە هەندێ جار ژمارە یان ئەندازەی ڕوودانی فیعلەکە ڕوون ئەکاتەوە ، وەك: ( جلست جلسة او جلستین)، وە هەروەها بۆی هەیە کە مەفعول موتلّەق سێ جۆرە:

١.مەفعول موتلّەقی نەوعی:

٢. مەفعول موتلّەقی عەدەدی،"ژمارەیی".

٣. مەفعول موتلّەقی تەئکیدی .

وەجاری واهەیە دەگونجێت فیعلەکە حەزف بێت . وە مەفعول موتلّەقێك جێگای بگرێتەوە ،وەئەمەشیان زیاتر لە دۆعادا بەکاردەهێنرێت، وەك:(سقیالك)، وە پێویستە ئاگامان لەوە بێت ،کە لەفزەکانی وەك : (سبحان) و (ایضا) و (لبیك)، مەفعول موتلّەقن، وە هەموو کات عامیلەکانیان حەزف کراوە، وە لە هەندێ جێگادا صیفەتی مەفعول موتلّەقەکە، مەوصوفە، حەزف دەکرێت، وەك: "ضربته شدیدا= ضربته ضربا شدیدا".

وە (باء) بۆ (الصاق) بەکاردێت، ئیتر یان حەقیقی یە وەك: (به داء).

یان بۆ (مەجازە)، وەك: (مررت بزید)، كە لێرە دا واتە: (قرب مروری منه) كە (منه) بۆ (زید) دەگەڕێتەوە.واتە (مروری) من لە (زید)ەوە نزیك بوو، نەك لاشەم بە لاشەیەوە لكابێت، كەوابوو لێرەدا (باء) بۆ ئیلصاقی مەجازی یە.

## ﴿ عامیلی مەفعول موتلەق ﴾

هەندێ جار عامیلی مەفعول موتڵەق، لە ڕوی بونی قەرینەیەكەوە (جوازاً) حەزف دەبێت، وەك ئەوەیكە بەكەسێك بڵێیت،كە تازە لەسەفەر گەڕاوەتەوە (خبر مقدم) كە ئەم وتەیە لەم جێگایەدا لە جێی مەفعول موتڵەق دانیشتووە وە عامیلەكەی (قدمك)بووە، كە حەزف كراوە. دەگونجێت، كەسێك گرفتی هەبێت و ڕەخنە بگرێت، كە مەفعول موتڵەق دەبێت، بەشێوەی مەصدەر بهێنرێت، لە كاتێكدا كە (خبر مقدم)لەسەر شێوەی مەفعول موتڵەق نیيە.

لە وەڵامی ئەم كێشەیەدا دەتوانرێت بگوترێت، (خبر مقدم) مەفعول موتڵەق كە فیعلەكەی حەزف بووە، بەو مانایەی كە وشەی(خبر) ئیسمی تەفضیلە، وە لە ئەصڵدا لەسەر شێوەی (أُخَیَر)بووە، كە هەمزەكەی لە ڕووی زۆر بەكارهێنان (كثرة الأستعمال)ەوە، حەزف كراوە، وە مەصدەر بوونی وشەی (خَیر)بە دوو شێواز ثابت دەبێت بەم جۆرەی لای خوارەوە:

أ- خەبەری موقەددەم: صیفەتە بۆ مەفعول موتڵەق (قدوماً)،ئەو كاتە مەوصوفەكە (قدوماً) لە دوای حەزفی عامیلەكە، ئەمیش حەزف كراوە، وە صیفەی خەبەری موقەددەم جێگاكەیی گرتوەتەوە.

ب- بە ئیعتباری موضاف إلیه،كە موقەددەمە: واتە: لە فزی خەبەر، كە موضافە، لە موضاف إلیه،یەكەی خۆی موقەددەمە،توانیویەتی مەصدەربوون وەرگبرێت.

وە هەر بەم جۆرەش جاری وا هەیە کە عامیلی مەفعول موتلەق (وجوبا) حەزف دەبێت، کە ئەمەیان سەماعی،یە (واتە: ئەو وشانەی کە لە ئەهلی ئەو مانەوە بیستراوە، وە بە چەند تایبەت مەندی و خەسلەتێکی خۆیانەوە لای هەموو یان بەکار هێنراون).

وەك: سَقیاً وَ رَعْیاً ،کە لە ئەصڵدا (سقاكَ اللهُ سَقیاً وَرَعاكَ اللهُ رِعْیاً)بوە.

- لە چەند جێگایەکدا عامیلی مەفعول موتلەق لە ڕوی قیاسەوە (قیاساً)حەزف دەکرێت:

١- لە دوای (أمّا)ی تەفصیلی، لە کاتێکدا کە مەفعول موتلەق بۆ درێژەو تەفضیل دان بە داهاتووی نێوڕۆکی جوملەکە بێت، وەك: (فَسُدُّوا الوثاقَ فأما مَنّاً بَعْدُ وَ إمّا فِداءُ حَتیّ تَضعَ الْحَرْبُ أَوْ زارِها)کە لە ئەصڵدا (أمّا تمُنُّوُنَ مَنّاً وَ أما تَفْدُنَ فِداءَ)بووە.

٢- مەفعول موتلەق کە نێوەڕۆکی جوملەیەك ڕون بکاتەوە کە ئەوی وەك سودێك لە جوملەکەوە وەر دەگرێ ڕێك هەمان مانای مەصدەرەکەیە، وەك: (لَهُ عَليَّ أَلْفُ دِرْهَم أعترافاً)کەئەوەی لەم جوملەیەوە وەردەگیرێ ڕێك هەمان مانای مەصدەرەکەیە وەك: (له عليّ ألف درهم أعترافاً) کە لەم جوملەیەدا مەفعول موتلەق (إعترافاً) مانای جوملەکە تەئکید دەکاتەوە، کە ئەوەی وەك سودیسش لە جوملەکەوە وەردەگیرێ هەمان ئەو ئیعتیرافەیە لەسەر ئەو هەزار درهەمە، کە لەئەصڵدا (له عليّ ألفُ درهمٍ أعترفُ إعترافاً) بووە.

٣- مەفعول موتلەق نێوەڕۆکی جوملەیەك تەئکید دەکاتەوە کە سودی ئەو جوملەیە هەمان واتای ئەو مەصدەرە نی یە، وەك، (أنت أبني حقاً) کە (حقاً) بە مانای (حقیقتاً)ە، وە ئیحتیمالی ئەوەش هەیە کە جوملەی (أنت أبني) حەقیقەت بێت، واتە: لەواقیعدا موخاطە ب کوڕی موتەکەللیم بێت، بەڵکو مەبەستی موتەکەللیم ئەوەیە کە تۆ لە پلەو پایەی کوڕی منداى، واتە: هەر بەو شێوازەی کە کوڕەکەی خۆمم خۆش دەوێت، تۆیشم هەر خۆش دەوێت، چونکە تەقدیری جوملەکە بەم شێوازەیە، (أنت أبني أحقُ حقاً).

٤- مەفعول موتلّەقی حەصرکراو درابێتە پاڵ (أسم ذات)ێك وەك: (ما أنت ألا سيراً) کە لە ئەصڵدا (ما أنت إلا تسير سيراً) بووە.

٥- مەفعول موتلّەقەکە دوبارە بوەوەبێت، وەك: (زيدٌ سراً سيْراً) کە لە ئەصڵدا (زيدٌ يسيرُ سيراً) بووە.

٦- مەفعول موتلّەق "تشبيه"ی لێ بناسرێتەوە وە: (مرزتُ به فإذاً له صوتٌ صوتَ حمارٍ) دام بەلایدا، کەچی لەناکاودا ئەو ئاوازێکی و دەنگێکی هەبوو، وەکدەنگی گوێ درێژ، کە لە ئەصڵدا (مررتُ بة فإذاً له صوْتٌ بصوتُ صوْتَ حمار) بووە.

وە ئەو ئیسم فیعلانەی کە نەصبەو ڕەفعە دەکەن، وەك:

(نزال) کە لەسەرُ وەزنی (أنزل)ە: کە فیعلی ئەمرە.

(تراك) واتە (تەرك بكە)، کە (لامر) مەفعولی (تراك)ە.

## ﴿المفعول لَهُ﴾

ومنها المفعول لَهُ، وهو إِسم ما فُعِل لِأَجْلِهِ الفعل المذكور، و إِنَّما ينصب، إِذا كان حدثاً أحدثه فاعل الفعل المذكور، و قارنه في الزمان، نحو: نصحت التلميذ تهذيباً لأخلاقِهِ، بخلاف ما إِذا كان إِسم غير الحدث، نحو: ذهبت إِليه للفلوس، أو لم يكن من أحداث الفاعل المذكور، نحو: جئت إِليك لدعوتك إِيَّايّ، أو لم يقارنه في الزمان: نحو: (درستك اليوم لوعدي به أمس).

---

## ﴿باسی مەفعول لَهُ﴾

مەفعول لَهُ: ئەو ئیسمەیە، کە فیعلەکە بەهۆی ئەوەوە، ئەنجام دراوە، ئەگەر بکەری ئەو کردەوەیە کردبووی، ئەوا مەنصوب دەبێت، وە بۆ (زەمان) دەبوو، وەك (نصحت التلميذ تهذيباً لأخلاقه) بەپێچەوانەی ئەوەوە کە ئیسمەکە ڕوداو نەبێت، وەك: (ذهبت أليه للفلوس)، یانْ فاعیلەکە ئەنجامی نەدابێت، وەك (جئت أليك لدعوتك أيايّ) یاخود بۆ زەمان نەدەبوو، وەك (درستك اليوم لوعدى به أمس).

## ﴿المفعولُ فيهِ﴾

ومنها المفعول فيهِ، و هو إِسم زمانٍ، أَو مكان فعل فيه الفعل المذكور، و ينصب الأول مطلقاً محدوداً، نحو: قرأت القرآن يوم الجمعة، أو غير محدود، نحو: قرأته حيناً.

والثاني: إِذا كان أسم مكان مبهم، كأَسماء الجهات الست، نحو: وقفت أمامك، أو خلفك، و أما المكان المحدود فلا ينصب منه، إِلا ألفاظ مسموعة، نحو: دخلت البلد، و نزلت الخان، و سكنت البيت.

---

## ﴿باسی مه فعول فيهِ﴾

مەفعول فيهِ: ئەميش ئيسميى زەمان يان مەكانە، كە ئەو فيعلەی تيا ئەنجام دراوە، لە (زەمان)دا، بەگشتی مەنصوبە،وەك (قرأت القرآن يوم الجمعة) ئيتر كاتەكە دياری كراوبێت، يان (نەء)... وەك: (قرأته حيناً). دووەم: ئەگەر ئيسميى مەكانى ناديار بوو، وەك (شەش ئاڕاستەكە) (چەپ ، ڕاست، بەردەم،....) وەك" (وقفت أمامك)، يان (خلفك)! وە لەمەكانى دياری كراودا، مەنصوب نی يە، تەنها لەو لەفزانەدا،نەبێت، كەوا بينراون، وەك (دخلت البلد، ونزلت الخان وسكنت البيت).

### ﴿ظەرف و مەفعول فيه﴾

*يەكێكی تر لە مەعمولەكانی فيعل ئەو شتەيە كە فيعلەكە تيايدا و لەسەری ڕووی داوە كەبە، ظەرف و مەفعول فيه، ناو دەبرێت، بەدەستەواژەيەكی تر (مەفعول فيه): ئەو ئيسمەيە كە بۆ ڕونكردنەوەی كات و شوێن (زمان و مكان)ی فيعل باس دەكرێت.

وەك: (قُمتُ يوم الجمعةِ) ڕۆژی جومعە بە ڕۆژوبووم، (صُمتُ): فيعل و فاعيلە، (يوم) مەفعول فيه يە، و موضافە، (الجُمُعةِ): موضاف إليه.

(وصلّيت أمامك)، (صلّيت) فيعل و فاعليه (أمامَ) موضافه و مەفعول فيه يه، (ك) لەمەحەللی جەڕدا موضاف اليه يه، له نمونەی یەکەمدا، (صُمت يوم الجمعة) مەفعول فيه يه،كه، مەفعول فيه، يەكی زەمانی يه، و له نمونەی دووەم دا (صلّيتُ أمامك) يەكێكی تر له مەنصوبات و مەعمول "بەركار"ەكانی فيعل، ئەو ئيسمەيه كه فيعلەكه لەڕاستيدا تەنها لەبەر خاتری ئەو كراوەو ئەنجام دراوه، كه به "مفعول به" ناوزەد كراوه، وەك: (ضربُته تأديباً) لێمدا، تا ئەدەب فێربێت، واته، لەبەر خاتری ئەدەب دادانی ئەو، لێدانەكەيم كردووه. (ضربتهُ): فيعلەو فاعيله، و مەفعول به يه، (تأديباً): مەفعول له، يه.

وه هەروەها وەك: (قعدتُ عن الحربِ جنباً): لەبەر ترس، لەشەڕەكه لام سەند، (قعدتُ: فيعل و فاعيله، "عن الحرب": جارو مەجروورە. و ظەرف له غوه، و موتەعەللیقه به (قعدتُ)، و مەفعول له،يه.

لەم شەن و كەوكردنەی سەرەوەدا، دوو نمونەمان بەرچاو كەوت، كه ئەوانيش (ضَربتُه تأديباً)ە، لەگەڵ (عقدتُ عن الحرب جُبناً)ە، كه يەكەم ڕستەيان (مَفْعُول لَهُ)ی،تەحصيلی يه، كه تەحصيلی ئەوەيه كه فيعلەكه لەبەرخاتری ئەو مەفعول لَهُ،يه،ئەكرێت، واته، (ضَرْبَ)ـه، كه بۆ ئەوه كراوه، تا (تأديب) وەربگيرێت، بەڵام دووەم نمونه، به (حصول)ی ناوزەد دەكرێت، چونكه (جُبْن: ترس)ەكه، بەهۆی فيعلەكەوه دروست بووه كه شەڕەكەيه، واته، مەفعول لەحاڵەتی (حصول)دا، بونی بەستراوه به بوون و وجودی فيعلەكەوه.

ئەوەش بزانه، كه (زجاج) كەيەكێكه لەزاناكانی نەحو، (مفعول لَهُ)ی به مەصدەری مەفعول موتلەق داناوه، وه وای داناوه كه (تأديباً) له نمونەی (ضَرَبْتهُ تأديباً) دا، بەم جۆره تەقدير دەكرێت، (أدّبته تأديباً).

يەكێكی تر له مەنصوبات و مەعمولاتی فيعل، ئەو ئيسمەيه كه لەمانادا به فاعيلی فيعلەكه دێته ئەژمار، وەك: (طابَ زيْدٌ نفساً) بەتەقديری (طاب نفس زيدٍ)ە، هەر بەو

جۆرەی کە لەم مەفهوم و ماناوە دەردەکەوێت، کە ئەو ئیسمەی لەسەرەوە باسمان کرد، ئاشکراکەری مانای ڕستەکانە، و ئەو نادیارییەی بەسەریانەوەهەیە لای دەبات، لە هەر ڕستەیەك دا کە تەمیز هەبێت، هەرچەندە تەمیزەکەش دەرنەکەوتبێت، ئەوا جۆرە نادیاریەك (أبهام) دێتە ئاراوە، کە ئەو نادیاریەش تەنها بەدەرخستن و باس کردنی تەمیزەکە لادەبرێت، وە لەڕاستیدا ئەو تەمیزەیە کە نادیاری لەسەرجەمی ڕستەکەدا دور ئەخاتەوە و ڕوونی پێ دەبەخشێت، لەبەرخاتری ئەمەیە کە لەپێناسەی تەمیزدا گوتراوە:"**فالتميزُ: اسْمٌ يذكر لبيان المراد من أسم مبهم قبلهُ**":بۆیە، تەمیز کاری ئەوەیە کە نادیاری "أبهام" لائەبات، لەسەر شتە باس کراوەکە، وەك: (واشتعل الرأس شيباً)، و (طاب زيدٌ نفساً).

(اشتعل): فیعلە و (الرّأسُ) فاعیلە، (شيباً) مەنصوبەو تەمیزە، کە لەم نمونەیەدا (شيباً)، ئەو ئیبهامەی لەسەر (رأس) لابردووە، و ڕەنگەکەی دیاری کردووە.

(طاب): فیعلەو (زيدٌ) فاعلیە، (نفساً) تەمیزە، لەم نمونەیەدا تەمیزەکە ئیبهامیەتی لەسەر زاتێکی موقەددەر لاداوە، لە نمونەی (طاب زيدٌ نفْساً) هیچ ئیبهامێك لە (طاب)دا نی یە، و پەیوەندی نێوان ئەم دوانە ڕوون و ئاشکرایە.

بەڵکو لەواقیعدا تەمیزەکە ئیبهامی زاتە شاراوە (مقدّر)ەکەی دەرخستووە، کە تەقدیری کەلامەکە بەم جۆرەیە: (طابَ أمْرٌ من أمورِ زيدٍ) ئەم شتە موقەددەرە، کە گۆڕدراوە بەزاتێکی موقەددەر، موبهەمەو دیار نی یە، و ئیتر (نفساً) ئەو نادیاریەی لادا، لەم ڕوانگەیەوە نمونەی (گابَ زيْدٌ نفْساً)، وشەی (نفساً) ئیبهامەکەی لەسەر کەسی نیسبەت بۆ دراو لادا،نەك لەسەرخودی نیسبەت دانەکە.

وە لەنمونەی (واشتعل الرّأسُ شيْباً)دا، تەقدیری ڕستەکە بەم جۆرەیە، (أشتعل الشّيئ المنسوبُ إلى الرّأس) کە (شيباً)، ئیبهامی لەسەر زاتی موقەددەرەکە (خودی شتە شاراوەکە) کە (شيئ)ە، لاداوە، وە ئەم حوکمە لەسەرجەم نمونەکاندا هەر بەم جۆرەیە، وەك: (طابَ زيدٌ اباً وأبوّةً وداراً و عِلْماً).

بۆیە تەمیز، لابەری ئیبهام بێت، لەسەر زاتی موقەددەر یاخود لەسەر زاتێکی باسکراو (مذكور)، چونیەکەو هەربەتەمیز ناودەبرێت و بەنەکیرەیش دێت.

## ﴿المفعول مَعَهُ﴾

و منها المفعول مَعَهُ: و هو الإِسم المذكور بعد الواو لمصاحبة معمول عامل سابق، صراحة أَو لا، نحو: سار زيد وعمراً، وهو على أربعة أقسام:

الأول: ما وجب فيه النصب، نحو: جئت و زيداً، و مالَكَ، و زيداً، و ذلك لعدم تحقق شرط صحة العطف.

الثاني: ما ترجح فيه النصب على الرفع، و ذلك في ما تحقق شرط صحة العطف، لكن خيف منه فوات قصد المعية، نحو: لا تاكل السمك، و تشرب اللبن.

الثالث: ما ترجح فيه العطف على النصب، و ذلك مثل ما وقع فيه الواو بعد ضمير رفع منفصل تلو اِستفهام، نحو: ما أنت، و زيد، لِأَنَّ العطف يجعل زيد عمدة، والنصب يجعله فضلة، والعمدة أهم من الفضلة.

الرابع: ما اِستوى فيه الأمران، و هو ما تحقق فيه شرط العطف، والنصب، بدون مزية لِأَحد الجانبين، نحو: جئت أنا و زيد، و زيداً، و أمّا ما يجب فيه الرفع بالعطف، نحو: أنت و رأيك، وكلّ رجل وضيعته، فليس من باب المفعول مَعَهُ.

---

## ﴿باسی مەفعول مَعَهُ﴾

مەفعول مَعَهُ: ئەو ئیسمەیە کە دوای (واو)ێك، دێت، کە بۆ هاوڕێیی پێ کردنی ئەو مەعمولە،یە. لەگەڵ عامیلە پێشوەکەیدا، ڕاستەوخۆ بێت، یان (نەء)...، وەك: (ساء زید وعمراً) و چوار بەشە:

یەکەم: ئەوەی نەصبەی تیادا واجبە، وەك (جئت وزیداً) (ومالك وزیداً) و ئەمەش لەبەر تێدانەبوونی عەطف لەڕستەکاندا.

دووەم: ئەوەی کە نەصبەی بۆ چاکترە، لەڕەفعە، ئەمیش ئەوەیە کە عە طفی تیادا بەدی دەکرێت، بەڵام بەکەمیی! وە مەبەستی لەگەڵدا بوون(مَعِيَّةْ)ی، تیا فەوتاوە، وەك: (لا تأكل السمك وتشرب اللبن).

سێیەم: ئەوەی کە عە طفی بۆ چاکترە لە نەصبە، ئەمەش لەکاتێکدایە، کە "واو" کەوتبێتە دوای ضە میرێکی مەرفوعی مونفەصیل، کە ئەداتی ئیستیفهامی لەگەڵدا هاتبێت، وەك (ما أنت وزيد) چونکە عە طف کرانی(زید) دە چێتە بابی (عمدة)وە، بەڵام نەصب دەچێتە بابی (فُضلَة)وە، وە بێگومان (عمدة)یش، گرنگترە لە (فضلة).

چوارەم: ئەوەی کە (نەصب) ، (عە طف)ی تیادا یەکسان بێت، و یەکێکیان لەوی تر زیاتر نەبێت، وەك (جئت أنا وزيدٌ وزيداً) هەردووکیان دروستن، بەڵام ئەوەی کە ڕەفعەی تیادا واجبە، بە عە طف وەك (أنت ورأيك)، و(كل رجل وضيعته) ئەمە لەسەر (مەفعول مَعَهُ) ناهێنرێنە ئەژمار!

### ﴿ باسی مەفعول معه﴾

**مەفعول معه،** ئەو ئیسمەیە کە لەدوای ئەو (واو)ەوە دێت، کە مانای (مع)ی هەڵگرتووە، ئەمەش لەڕووی (مصاحبة)و هاوڕێیەتی نواندن لەگەڵ (امل)ـەکەیدا، بە دەستەواژەیەکی تر (مفعول معه) کەسێك یان شتێکە کە فیعلەکە بەهۆی ئەوەوە ئەنجام دەدرێت، وە ئەو ئیسمە مەنصوبەیە کە لەدوای (واو)ی بە مانا (مع) دێت، وەك: (خرجت و زيداً) لەگەڵ زەید دا هاتە دەرەوە.

***(مفعول مَعَه) دوو بەشە:***

١-(مفعول معه)ی حەقیقی: ئەوەیە کە لەحەقیقەتدا لەگەڵ فیعلەکەی خۆی دا حوکمی هاوبەشی و شەریکی هەبێت، وەك: (جئت أنا وزيداً) کە (زيد) لە هاتندا لەگەڵ ئیسمەکەی پێش خۆیدا (أنا) هاوبەش و شەریکە.

٢-(مفعول معه)ی مەجازی: ئەوەیە کە ئەو هاوبەشی و شەریکیە حەقیقی نەبێت، وەك: (سیریی والطریق) کە دیار و ڕونە کەڕێگا ناچێت بەڕێدا، بەڵکو لەڕووی مەجازییەوە لەگەڵ فاعیلەکەی (سیری)دا دامان ناوە، چونکە کاتێك کەسەیارەکە بە توندی ڕێگای بڕی، لەلای کابرای سوار وایە کە ڕێگاو دارو درەختەکانی دەوروبەریش لە حەرەکەت کردن دان.

__نموونەی دووەم:__ (کفی): فعل ماضي. (ك): مفعول،(و): بمعنی مع. (زیدا): مەنصوب بە هۆی (واو)ەوە،" مفعول معە"،(درهم): فاعل (کفی).

وە ئەوەی بە هۆی (واو)ی (بمعنی مع) مەنصوب دەبێت بە (مفعول معه) ناو دەبرێت.

﴿ئەو واوەی کە لەپێش مەفعول "معە"، دا دێت!﴾

ئەو واوەی کە لەپێش مەفعول "معە"، دا دێت دەبێت واوی عەطف نەبێت، بۆیە لە نمونەی: (سرت وزیدا: لەگەڵ زەیددا چومە سەفەر) ناتوانین ئەو واوی (معیة)ـە، بە حەرفی عەطف دابنێین، چونکە ضەمیری موتتەصیلی (تُ) جائزالوجهین نییە، وە ئەگەر بمانەوێت ئیسمێك عەطف بکەینە سەری، لەسەرەتادا دەبێت بەهۆی ضەمیرێکی مونفەصیلەوە، تەئکیدی بکەین، ئەوکات ئیسمێکی عەطف بکەینە سەر، هەر بەم شێوازەیش عەطف کردنی واوی (معیة) لەم نمونەیەشدا ناشیرین و قەبیحە،(مالك و زیداً) چونکە عەطف کردن لەسەر ضەمیری مەجروورو دروست نییە، مەگەر لە دوای گەڕاندنەوەی حەرفە جەڕەکە بۆسەر مەعطوفەکە، لەبەر ئەوەیش کە حەرفە جەڕەکە لە (زید)دا،دوبارە نەکراوەتەوە، ئەوا عەطف کردنەکەی دروست نەبووە، بەڵام لە نمونەی (جئتُ أنا و زیداً) عەطف دروستە و هیچ گرفتێکی تیادا نییە چونکە عەطف کردنە سەرضەمیری مونفەصیل هیچ گرفتێکی نییە، وهەروەها عەطف کردن لە (ضربَتْ

زيداً وعمرواً)دا پێویستە، چونکە ئەو واوەی دوایی لە جیاتی (مفعول بە) خۆی نواندووە.

وە پێویستە ئەوە بزانرێت کە هەندێ جار لە دوای (ما) و (کیف) کە لە ئیسمەکانی (إستفهام)ن، عامیلی (مفعولٌ معە) حەزف دەکرێت، وە لە م جۆرە جێگایانەدا فیعلی (تکون)، یان شیبه فیعلی (حاصل) لە (تقدیر)دایە. وەك: (ما أنت والطب)، (کیف أنت درس النّحْوِ) کە لە ئەصڵدا بەم جۆرە بوون: (ماتکون أنت و الطلب)، (کیف تکون و درس النحو).

(إلا) یەکێکە لەوانەی ئیسمێك مەنصوب دەکات و بۆ (استثناء) بەکاردێت.

## ﴿المُستثنى﴾

ومنها المستثنى، و هو متصل، و منقطع، أما المتصل فهو المذكور بعد إِلاّ، أو إِحدى أخواتها المخرج من مستثنى منه عام شامل له، و لغيره، نحو: جاء القوم ألاّ زيداً، وأمّا المنقطع فهو المذكور بعدها غير مخرج منه، نحو: وصل الطلاب إِلاّ كتبهم، فإِن تقدم المستثنى على المستثنى منه، فهو منصوب مطلقاً، نحو: إِلاّ زيداً جاء القوم ، و إِلاّ الخيل وصل الجيش، وكذا إِن تأخر، وكان منقطعا، أو متصلاً، لكن في كلام مثبت كما مرّ المثال، وأمّا إِذا تأخر، وكان متصلاً، و في كلام منفى، فيجوز نصبه.

---

## ﴿باسی موستەسنا﴾

موستەسنا: ئەمەش یان موتتەصیله، یان مونقەطیعە، (متصل): ئەوەیە کە دوای (الاّ) یان یەکێك لە خوشکەکانی (ألاّ) بێت، وە لە خودی (مستثنی مِنْهُ)یە، وەگشتگیرە بۆ ئەوو ، بۆ غەیری ئەویش، وەك (جاء القوم ألاّ زیداً)، بەلاّم (مُنْقَطِعْ)، ئەوەیەکە لە خودی (مستثنی منه) نی یە، وەك: (وصل الطلاب ألاّ کتبهم) ئەگەر موستەسنا پێش (مُستثْنی مِنْهُ) کەوت، ئەوە مەفعول بِهِ‌یە، بەگشتی، وەك: (ألاّ زیداً جاء القوم) و (ألاّ الخیل وصل الجیش) وە هەروەها یش دەبێت، ئەگەر دواکەوت، ئیتر مونقەطیع بێت، یان موتتەصیل!

و يختار بَدَلِيَتُهُ للمستثنى منه، نحو: ما جاء الجيش إلاّ طليعته، بالرفع والنصب، هذا إذا ذكر المستثنى منه، و أمّا غيره، وهو ما لـم يذكر المستثنى منه، فيه سواء، كان الكلام منفياً، و هو الكثير، أو مثبتاً، وهو القليل، و يُسمّى بالمستثنى المُفَرَّغ، فيعرب على حسب اِقتضاء العامل، نحو: ما صحبني إلاّ العلماء، و ما أحببتُ إلاّ العقلاء، وما تَرَجَّيْتُ الخير إلاّ من العارفين.

و قد يستثنى بغير، و سوى، و سواء، فيكون المستثنى بها مجروراً بالأضافة، و أنفسها معربة كالمستثنى بإلاّ، على ما سبق، و المستثنى بليس، و لا يكون، و ماعدا، و ماخلا، منصوب لا غير، و بِعَدا، و خَلا، و حاشا مجرور، نحو: جاء القوم غير زيد، أو لا يكون زيداً، أو ماعدا زيداً، أو عدا زيد.

---

بەلاّم لەكەلامی (مستثنی مِنْهُ)دا، بۆ هەردوكیانە، وەك: (ماجاء الجیش ألاّ طلیعتهُ) بەرەفعەو نصبە پێویستە، ئەمە ئەگەر (مستثنی مِنْهُ) باس كرا، ئەگەر نا..... یەكسانە! كەلامەكە، مەنفی بێت كە ئەمە زۆر هەیە، وەیان (مُثْبَتْ)بێت، كە ئەمەیان كەمە، وە بە موستەسنای (مُفَرَّغْ) ناو دەبرێت،و بە گوێرەی عامیلەكەی ئیعراب دەكرێت،وەك: (ماصحبنی ألاّ العلماء)، و(ما أحببت ألا العقلاء) ، و(ماترجیت الخیر ألاّ من العارفین)، وە موستەسنا بە (غیر، و سوی، سواء) دەكرێت، ئیتر موستەسنا مەجروردەبێت، بەهۆی ئیضافەوە، وە خودی خۆیان وەك موستەسنا بە (ألاّ) موعرەبن، وە موستەسنا بە (لیس، ماعدا، ماخلا) مەنصوب دەبن، وە بە (عدا، خلا، حاشا) مەجرور دەبن، وەك : (جاء القوم غیر زید)، أو( لا یكون زیداً)، أو (ماعدا زیداً)، أو( عدا زید).

﴿ باسی (إستِثناء)﴾

لە (إستِثْناء)دا چوار شت پێویستە:

١-مستثنی بە، لەفزی فاعل و خۆیشی موتەكەللیمەكەیە.

٢-مستثنى بەلـەفزی مەفعول و ئەو وشەیەیە کە لـەدوای ئەداتی (إستثناء)ە کەوە هاتووە.

٣-(مستثنی منه) کە ئەو لـەفزە گشتییەیە کە لـەپێش ئەداتی (إستثناء)ە کەوەیە.

٤-(مستثنی به): کە ئەداتی (إستثناء)ە کەیە.

وە ئەوەی بە هۆی (إلا)وە مەنصوب دەبێت بە (مستثنى) دەناسرێت، ئەوەی لێرەدا ئیعتیباری پێ دەکرێت ئەوەیە کە (مستثنى ومستثنى منه) لێك جیاواز بن.

## *مەرجەکانی مەنصوب بوونی (مستثنی):

١-پێویستە (مستثنى) لـە کەلامێکی تەواو:(تام)دا بێت، واتە (مستثنى منه) :مثبت بێت نەك مەنفی، دەی ئەگەر (مستثنى منه) مەنفی بوو (مستثنى) تەواو (تام) نی یە، وەك:(جاءني القوم) کە (مثبت)ە، (إلا زیدا) کە (زیدا) تاممە.

٢-یان ئەوەیە کە (مستثنی) پێش (مستثنی منه) کەوتبێت، وەك:(جاءني إلا زیدا أحد) کە (زیدا) (مستثنی مقدم)ـە، و (أحد) (مستنثنی منه)یە و مەنصوبە.

٣-یاخود (متسثنى)کە (منقطع) بێت، واتە (مستثنى) لـە (مستثنى منه)دا نەبێت، وەك: (ما جاءني أحد إلا حمارا) کە (حمارا) (مستثنى منقطع)ە ومەنصوبە.

## دوو جۆری تر لە (مستثنی)دا ماوە:

أ-دروستە (مستثنى) مەنصوب بێت، وە دروستیشە بە (بدل) حساب بکرێت، ئەویش لـە کاتێکدا کەلامەکە تام بێت، مەنفی نەبێت، وەك: (ما فعلوه إلا قليل) (قلیل) بە مەرفوعی بەو مەبەستەی کە (بدل) بێت بۆ (واو)ی جەمع لـە (فعلو)دا.

یان (إلا قلیلا) بە مەنصوبی بە هۆی (مستثنى)یەیەوە.

**﴿ئەگەر موستەسنا بە نەصبە بخوێنرێتەوە﴾**

بەڵام ئەگەر موستەسنا بە نەصبە بخوێنرێتەوە، ئەوا لەم کاتەدا نابێتە بەدەل، وە هەروەها ئەگەر بەهۆی بەرگر (مانع)ێك و پاساوێکەوە نەمانتوانی موستەسناکە بە (تابع)ی لەفزی (مستثنی منه)دابنێین، لەم کاتەدا پێویستە تابیعی مەحەللی موستەسنا بهێنین: وەك(لا إله إلا الله). هۆی ئەوەی کە ئێمە پاساومان هەیە و ناتوانین (الله) لە بەدەلی لەفزی (إله)دا دابنێین.

ئەوەیە کە کاتێك بەدەل هێنرا، ئیتر (مبدل منه) لەکارکەوتندایە، وە ئەگەر بەدەل نەتوانێت لە جێی (مبدل منه) دابنیشێت، لەم کاتەدا ناتوانرێت لە ئیعرابە لەفزییەکەی (مبدل منه) بێ ئومێدی و یاخیبوون بنوێنێت، لەم نمونەیەشدا دیسانەوە ئەو (مانع)ـە هەیە، چونکە (الله) ناتوانرێ لە جێی (إله) دابنرێت، چونکە ئەگەر (الله) لەجێی (إله) دابنێین، ئەوا پێویستە ئیسمی (لاء)ی نەفی للجنس مەعریفە بێت، لەکاتێکدا کە زانیمان دەبێت ئیسمی (لاء) نەفی للجنس نەکیرە بێت.

– وە ئیعرابی (مستثنی)لای هەندێ بە گوێرەی عەوامیلەکانیەتی، ئەمەش لە کاتێکدا کە (مستثنی منه) باس نەکرابێت، وەك:

١-مەرفوع، وەك: (ما ضربني إلا زيد). (زيد): فاعیلە و مەرفوعە.

٢-مەنصوب، وەك: (لست إلا قائما)، (قائما): مەنصوب، خبر (ليس).

٣-مەرفوع وەك: (ما مررت إلا بزيد)، (بزيد): جار ومەجرور بەهۆی (باء)ەوە، چونکە لەم نموونانەدا (مستثنى منه) نەهاتووە.

ئاگاداری: هەندێك دەڵێن مەنصوبی (مستثنى) بە هۆی (إلا)وە نییە، بەڵکو بە هۆی (استثنی)ی (مقدره)وەیە.

وە هەندێك دەڵێن بەهۆی (استثنی)ی (مقدر)ەوەیە، بەڵام بە یارمەتی (إلا)وە دەتوانێت مەنصوبی بکات.

(مفرغ): واتە (مسثنى منه) باس نەکرابێت.

**تەواوکاری:** بزانە (استثناء) بە (غیر، سوی، سواء) دەکرێت، واتە ئەمانیش لە (أداة الإستثناء)ن، بەڵام ئەمان (مستثنی) مەجرور دەکەن، چونکە ئیضافە دەکرێن بۆ لای (مستثنی)ـەکە.

وە بزانە (غیر) دەتوانێت وەك (مستثنی) مەنصوب بێت، ئەگەر:

١-ئەگەر لە فظی (غیر) لە کەلامێکی (تام)دا بێت، وەك:

(جاءني القوم غير زيد)، لێرەدا (غیر) مەنصوبە.

**﴿ باسی لەفزی (غیر)﴾**

لەفزی (غیر) لەسەرەتادا بۆ صیفە دانراوە، چونکە ئەم لەفزە هەڵگری مانای (مغایرة: جیاوازی)یە، وەك:(جائني رجلٌ غير زيدٍ :کابرایەك هات بۆلام، کە ئەم جۆرە تایبەتمەندی یە کە هاتنەکەیە، لە زەید دا نەبووە) واتە: ئەوی جیاکردەوە، بەڵام جاری وا هەیە کە لەدانان (وضع)ی سەرەتای خۆی دەردەچێت، و دەبێتە بەشێك لە ئەداتی (أستثناء)، هەروەك چۆن سەرەتای دانانی (ألا) خۆی بۆ (أستثناء)ە، بەڵام جاری وا هەیە لەو ڕێڕەوە لا دەدات، و دەبێتە صیفەتی کەلیمەیەك، وەك: (لوكان فيهما ألهة ألا الله لفسدتا: ئەگەر لەئاسمانەکان و زەوی پەرستراوێکی تر ، غەیری خودا هەبێت، ئەوا یاسای جیهان تێك دەچوو، خەراب دەبوو)، کەلەم نموونەیەدا لەفزی (إلا) بە مانای (غیر) و (صفة) هاتووە.

٢-ئەگەر (مستنثى) پێش (مستثنى منه) کەوت، وەك:

(ما جاءني غير زيد أحد) کە لێرەدا (مستثنى منه) دوای (زيد) کەوتووە، بۆیە مەنصوب کراوە.

٣-ئەگەر (مستثنى): (منقطع) بوو، ئەوا مەنصوب دەبێت، وەك:

(ما جاءني أحد غير حمار).

٤-ئەگەر لەفظی (غیر) لە کەلامێکی مەنفیدا بوو، وەك:

(ما جاءني القوم غير زيد)، ئەوا (غیر) بە مەنصوبیش دەبێت و بە مەرفوعیش دەبێت.

**٥-ئەگەر (مستثنی) (مفرغ) بوو، واتە (مستثنی منە) باس نەکرابوو، ئەوە ئیعراب بە گوێرەی عەوامیلەکانە، وەك:**

(ما ضربني غیر زید)، **کە (غیر) مەرفوعە، چونکە فاعیلی** (ضرب)ە.

**وە (لست غیر قائم) بە نەصبی (غیر)، چونکە خەبەری (لست)یە.**

**وە (ما مررت بغیر زید) بە مەجروری (غیر) بە هۆی** (باء)**ەوە.**

**وە بزانە** (سوی، سواء) **مەنصوب دەبن لە کاتێکدا کە بوونە** (مفعول فیه)**، وەك:**

(جاءني **القوم** سوی زید) **(سوی) مفعول فیه یە بۆ (جاء).**

**وە بزانە کە** (استثناء) **بەهۆی (حاشا، عدا، خلا، ما عدا، ماخلا)وە دەکرێت بەو شێوازەی کەباس کرا.**

**وە هەروەها بە هۆی (لیس، لا یکون)** استثناء **دەکرێت، وەك:**

(سیجیئ أهلك لیس زیدا) لیس یعني: إلا.

(سیجیئ أهلك لا یکون بشرا) (لا یکون): للإستثناء.

**وە** (مستثنی) **بە هۆی (لیس و لا یکون) مەنصوب دەبێت بە هۆی ئەوەوە کە خەبەرە، چونکە ئیسمی (لیس و لایکون)** مە حذوفە **و ئەصڵەکەی** (لیس بعضهم إلا زیدا)**ە، وە حەزفی ئیسمەکەیان بە واجبی یە.بەڵام جوملەی (لیس زیدا)، (لا یکون بشرا) بە هۆی (حالیە)وە مەنصوب دەبن، چونکە (حاڵ)ی (زید) رادەگەیەنن.**

## ﴿ باسی (الاّ) و(لاسیما)﴾

**دەگونجێت ئەم پرسیارە بکرێت کە (ألا) دوای خۆی** (مستثنی) **،کە لەپێش خۆی** (مستثنی منە) **دەردەکات، وە لەڕووی حوکمیشەوە دیسانەوە** (مستثنی) **لەگەڵ** (مستثنی منە)**دا جیاوازیان هەیە، بەڵام** (لا سیما) **دواکەی خۆی لە حوکمی پێش خۆی دەرناکات، هەروەك لە نمونەی** (أکرم القوم لاسیما زیداً)**دا، ئەم مانایە دەفامرێتەوە.**

بەڵکو دەتوانرێ بگوترێ حوکمی (أکرم) لە (زید) دا، بەشێوەیەکی باشتر لە (زید)دا هێزی پەیدا کردووە، لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا دەبێت بگوترێت، (أخراج) و (تغایر) دوو شتی جیاوازن:

جاری وا هەیە کە (تغایر) تەنها پەیوەستە بە (أثبات و نفي) ، وەك: (جائني القوم إلا زیداً)، (ماجائني القومُ إلا زیداً). وە لەهەندێ جێگادا (تغایر)ەکە بەهۆی (شدّة)و (ضعف)ەوەیە، لە (لاسیما)دا دیسانەوە ئەم جۆرە (تغایر)ە هەیە، واتە: دەتوانرێت بوترێت، حوکمی (زید)، لە گەڵ سەرجەم ئەفرادەکانی ئەو هۆزە (قوم)ـەدا ،لەڕووی (إکرام)ـەوە، جیاوازە.

یاخود دوای (لا سیما) مەجرور دەبێت، واتە (سیّ) ئیضافە بکرێت بۆ لای (زید) و (ما) زائیدە بێت، واتە ببێتە (لا سیّ زید موجود) (سیّ) ئیضافە کرا بۆ لای (زید) (موجود) خەبەر (لا).

## ﴿وشەی (سَیّ) لە (لاسیما)دا﴾

وشەی (سَیّ) لە (لاسیما)دا لەڕووی لەفزو ماناوە،وەك وشەیی (مثل) وایە، کە عەینو لفیعلەکەی لە ئەصڵدا (واو) بووە، وە (مثنی)کەی دەبێتە (سیّان) وە لەحاڵەتی (تثنیە)دا بێ نیازە لە ئیضافە کردن، هەروەك (مثلان)، بێ نیازە لە ئیضافە کردن.

والجملة حال في حالین: مەبەست لە (حالین) یەکەم: حاڵەتی ڕەفعە، وە دووەم حاڵەتی نەصبە، وە جوملەی (لا سیما زید) لەمەحەلدا مەنصوبە، بە هۆی (حال)یەتەوە.

ئەگەر ئێمە (لا سیما) لە ئەصڵدا بە (استثناء) دانەنێین، وە (حکما) بە (استثناء) حیسابی بکەین، ئەوکاتە دەتوانین کە ئەوە قبوڵ بکەین، کە دوای (سیما) مەنصوب بێت، چونکە لە (رفع وجر)دا ئەمە نابێت، چونکە لە ڕەفعدا (ما) بە مەوصولە یان مەوصوفە دادەنرێت و پێویستە لێرەدا کە (مبتدأ) مەحذوف بێت، وە (زید) بە خەبەر

دابنرێت، وە لە (جر)دا (ما) بە زائیدە حیساب دەکرێت، ئەو کاتە (سیّ) بۆ لای (زید)ئیضافە دەکرێت، ئیتر ناچارین قبوڵی مەنصوبیەتی دوای(سیما) بکەین.

ئێمە کە (لا سیما)مان لەو دوو جۆرەی سەرەوە نەقڵ کردووە، ئەوە نی یە کە لە هەیئەتی ئەصڵی خۆی گۆڕا بێت، بەڵکو وك خۆی دەمێنێتەوە.

کخصوصا إعرابا ومعنی: (لا سیما) لە ڕوانگەی سیّیەمیانەوە وەك (خصوصا) وایە لە ڕووی (اعراب و مانا)وە.

لە رووی ئیعرابەوە: (خصوصا) مەصدەرە، ومەفعول موطلەقە، بۆ (أخصّ)ی موقەددەرە، وە لەو شوێنەدا کە (لا سیما) لە جیّی (خصوصا) هاتبێت لە مەحەلدا مەنصوبە.

**لە ڕووی ماناوە:** کاتێك کە (لا سیما) لە ئیعرابدا (قائم مقام)ی:" خصوصا" بوو، گومانی تیا نی یە، کە ئەم دووانە لە ڕووی ماناوە یەکێکن.

## ﴿الحـــــال﴾

ومنها الحال: و هو وصف صريح، أو مؤول متضمن لمعنى في مبين لهيئة الفاعل، أو المفعول وقت الفعل، و الغالب فيه أن يكون منتقلاً مشتقاً، نحو: جاء القاسم باسماً، و قد يأتي جامداً إذا وصف بمشتق، نحو: ﴿فتمثل لها بشراً سويّا﴾مريم: ١٧، أو قدر عليه مضاف، نحو: (وقع المصارعان عدلي جمل مماثلى عدليه)، أو وقع في التسعير، نحو:( بعته يداً بيد)، أي: متناجزين، و(كيلاً بكيل) أي: متماثلين، أو للتشبيه، نحو: (كرّ زيد أسدا) أي: مماثلاً له.

---

## ﴿باسی حاڵ﴾

حاڵ: وەصفێکی ڕاستەوخۆیە، یان تەئویل کراوە بۆ گرتنەخۆی واتایەك، چۆنیەتی (فاعیل و مەفعول) لەکاتی کارەکەدا دەردەخات، وە بەزۆری موشتەققە، وەك: (جاء القاسم باسماً) وە بە (جامِد)ی دێت، وە ئەگەر وەصف کرا بوو، بە موشتەقێك وەك:(فتمثل لها بشراً سوياً)، یان موضافی تێدا تەقدیر کرا بوو،وەك: (وقع المصارعان عدلي جمل مماثلي عدليه)، یان (نرخ دانان)ی تیادا بوو، وەك (بعته يداً بيد) واتە:....... ،وە(كيلاً بكيل) واتە: وەك یەکن، یان بۆ (تشبيه: لێکچواندن) وەك: (كرّ زيداً أسدا) واتە: وەك ئەو وایە!

والأصل فيه التنكير، و في صاحبها التعريف، فلا ينكر اِلاّ مع مسوغ، نحو: أ في الدار رجل مختفياً، و قد يأتي عن المبتدأ، و المضاف أليه، إذا كان المضاف عاملاً فيه، نحو: أعجبني ضرب زيد عمراً صديقين، أو كان جزءاً له، نحو قوله تعالى:﴿ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلّ إِخْوَانًا﴾الحجرات:٤٧، أو مثل جزئه، نحو: ﴿وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا﴾النساء:١٢٥، و يجوز تقديمه على صاحبه، اِلاّ اِذا كان مجروراً بالحرف ، أو بالأضافة، و على عامله، اِلاّ اِذا كان معنى فعل، نحو: هذا زيد غاضباً، و قد يحذف عامله لقرينة، كقولك: ماشياً، لمن قال: كيف جئت؟ و أما حذفه فجائز، اِلاّ اِذا وقع جواباً كما ذكرناً، أو قيْداً لنهي، نحو: ﴿لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى﴾النساء:٤٣.

---

وەئەصلّ لە حالّ دا ئەوەیە، کە نەکیرەیە، وەئەصلّ لە (صاحب الحال) دا ئەوەیە، کە مەعریفە بێت! نەکیرە ناکرێت، مەگەر بە بوونی بیانویەکی دروست ، وەك: (أفي الدار رجل مختفياً) وەلەسەر موبتەداو موضاف أليه دێت، ئەگەر موضافەکە عەمەلی تیادا کردبوو، وەك : (أعجبني ضرب زيد عمراً صديقين) یان بەشێك بوولێی، وەك: ﴿ونزعنا ما في صدورهم من غل أخواناً﴾الحجرات:٤٧.یان وەك بەشێك وابوو، وەك :﴿واتبع ملة أبراهيم حنيفاً﴾النساء:١٢٥.وە دروستە حالّ پێش بخرێت،بەسەر خاوەن حالّەکەدا، تەنها لە کاتێکدا نەبێت، کە بەهۆی حەرفی جەڕەوە یان بە هۆی ئیضافەوە مەجرور بوبێت، وە دروستە حالّ پێش بخرێت،بەسەر عامیلەکەیدا تەنها لە کاتێکدا نەبێت، کە ئەو عامیلەمانافیعل بێت، وەك: ( هذا زيد غاضباً)،وە هەندێ جار لەکاتی بوونی ئاماژەیەکداعامیلی حالّ حەزف دەکرێت، وەك، کاتێك پیادەڕەو بیت بە کەسێك بڵێیت: (کیف جئت؟چۆن هاتی؟)،وە هەندێ جار حەزف کردنیشی دروستە، تەنها لە کاتێکدا نەبێت، کە بوبێتە وەڵاّم بۆ شتێك، وەك باسمان کرد،یاخود بوبێتە (پەیوەستە: قَیْدْ)بۆ (نەهی)،وەك: ﴿لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى﴾النساء:٤٣.

## ﴿ باسی (حال)﴾

یەکێك لە مەنصوبات، بریتی یە لە (حال): وە حاڵیش ئەو صیفەت یا خود جوملەیەیە کە حاڵەتی فاعیل یان حاڵەتی مەفعول یان هەردوکیان لەکاتی ڕودانی فیعلەکەدا ڕوون دەکاتەوە. حاڵ سێ بەشە:

١-حاڵی موفرەد: ئەوەیە کە یەك وشە (مفرد،تثنية، جمع)بێت، وەك: (جائني زيدٌ راكباً). (جائني الرجلان راكبين)، (جائني المعلّمون راكبين).

٢-حاڵێك جوملەبێت، ئەوەیە کە جومەلەیەکی فیعلی یان ئیسمی یە حاڵەتی فاعیل یان مەفعولە کە ڕوون بکاتەوە، وەك: (جاء زيدٌ يضحكُ: زەید لەحاڵەتێکدا کە پێدەکەنی هات).

٣-شیبە جوملە: حاڵ جاری وا هەیە کە (شبه جمله)-ظەرف و جار و مەجرور- دەبێت، کە لەم کاتەدا فیعل یان شیبە فیعل لە ڕووی تەعەللوق بون پێیانەوە حەزف دەبێت. وەك: (رأيت القمر بين السّحاب)-(شاهدتُ العصفور على الشجر) کە لەم دوو جوملەیەدا (بين السحاب) و (على الشجر) دەبنە حاڵ.

وە بەهۆی (لا سيما)وە (استثناء) دەکرێت، وەك:(أكرم القوم لاسيما زيدا) (لا سيما) أي: خصوصا،(أكرم القوم سيما زيدا) بە بێ (لا) هەر دەبێت.

### (باسی حاڵ، لە شەرحی هیدایەدا):

(حاڵ)، ئەو ئیسمەیە ، کە دەلالەت دەکاتە سەر حاڵیەتی فاعل یان مفعول یان هەر دوکیان ، بۆ حاڵی فاعل، وەك ( جائنى زيد راكبا ) کە ( راکبا ) حاڵە بۆ (زید) کە فاعلە ، وە بۆ حاڵیەتی مفعول، وەك ( ضربت زيدا مشدودا ) دام لە زەید ، لە کاتێکا کە حاڵی زید ، وابوو ، دەست و پێی بەسترابوو ، کە (زید) مفعولە و ( مشدودا ) حاڵە بۆی، وە ( لقيت عمرا راكبين ) بە ( عمرو ) گەشتم ، لە کاتێکا کە هەر دوکمان سوار بووین کە ( ت ) فاعل و ( عمرا ) مفعول و ( راكبين ) حاڵە بۆ هەر دوکیان .

وە هەندێ جار فعل معنوی یە ، واتە لە ڕستەکەدا ( لفظا ) نەهاتووە ، وەك ( زید في الدار قائما ) کە ( زید أستقر في الدار قائما ) بووە ، ( أستقر ) کە فعلەکەیە مەحزوف بووە ، و بە هۆی ( جار و مجرور )ـەکەوە ، هەستی پێ دەکرێت .
وەهەندێ جار فعلی مفعولە کە باس نەکراوە و معنوی یە وەك ( هذا زیدٌ قائما ) کە (زید) لە معنادا مفعول بە یە ، کە لە ئەصلدا ( أنبه علیه قائما ) بووە، وە یا ( أشیر ألیه قائما ) بووە ، کە فعلەکان محزوف بوون.
وە هەندێ جار عامل و نصب کەری حالْ، لە ڕستەدا دیارە، وەك ( ضربت زیدا راکبا )، وە هەندێ جار ( معنوی ) نادیارە ، وەك ( زید فی الدار قائما ) کە ( زید أستقر فی الدار قائما ) بووە .

## ﴿جیـاوازی نێوان تەمیز، و حالْ﴾:

لەچەند ڕویەکەوە جیاوازی هەیە، لەنێوان حالْ و تەمیزدا، کەبەسەرنج لێدانی ئەو جیاوازیانە دەتوانرێت، لەیەکتر جودا بکرێنەوەو بناسرێنەوە.

١.حالْ بەشێوەی جوملە "فیعلی، ئیسمی، شیبە جوملە" دەهێنرێت، بەلاّم تەمیز لەسەرجەم حالّەتەکاندا ئیسمێکی موفرەدە.

٢.حالْ ڕونکەرەوەی شکلْ و شێوازی خاوەن حالّە کە (ذي الحال)ەکەیە، بەلاّم تەمیز ڕونکەرەوە،و دەرخەری زاتی شتەکانە.

٣.حالْ بۆی هەیە، بەشێوەی "متعدّد" ژمێردراوی بێت، لەکاتێکدا تەمیز تەنها بە موفرەدی دێت، و ڕونادات کە بە ژمێردرای بێت.

٤.حالْ لەهەندێ جێگای تایبەتدا پێش دەکەوێت، بەسەر "ذي الحال"دا، بەلاّم تەمیز لەهیچ کاتێکدا پێش ناکەوێت، و تەمیزی پێش کەوتە، هەندێ جار و زۆر بەکەمی لەشیعردا دەبێت، کە ئەوەندە کەمە ئەو حالّەتەش حیسابی لەسەر ناکرێت.

٥.حالْ دەبێت موشتەق بێت، لەکاتێکدا کە تەمیز دەبێت، جامید بێت.

٦.حالْ جەخت کەرەو "مۆکد"ی عامیلەکەیە، لەکاتێکدا کە تەمیز ڕونکەرەوەی عامیلەکەی خۆیەتی.

وە لەهەندیٚ ڕوویشەوە، حالٚ و تەمیز، وەك یەكن:

١.هەردووكیان نەكیرەن.

٢.هەردووكیان مەنصوبن.

٣.هەردووكیان نادیاری "إبهام" لائەبەن.

٤.هەردووكیان لەكەلامدا زیادە "فُضْلة"ن.

پاشان یەكێكی تر لە مەنصوبات و مەعمولاتی فیعل، بریتییە لە "منصوب بنزع الخافض"ە، ئەوە بزانە كە هەندیٚ جار، مەجروور بوون لەكەلام دا بەبیٚ حەرفی جەڕ ڕوو ئەدات، لەم كاتەدا ئەوە مەجرور بوون نی یە، و بەڵكو مەنصوب بوونە، و بە "منصوب بنزع الخافض" نازەد دەكرێت.

وەك: (جائنی)، كە لەئەصڵدا (جاءَ ألیّ)بووە، وە(تعسفن رملا)مەڕەكان ڕۆشتنە دەشتەكەوە، كە لەئەصڵدا (صارت النّعاجُ في الرّمل) بووە.

* * *

## ﴿التميـــيــــز﴾

و منها التمييز: و هو إسم بمعنى من رافع لِلْإبهام عن مفرد، أو نسبة في جملة، أو شبهها، كإسم الفاعل مع فاعله، فالأوّل يرفع لِإبهامٍ عن عدد، نحو: ﴿إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا﴾ يوسف.٤، أو كيلٍ، نحو: عندي قفيز بُرّاً.

---

## ﴿باسی تــــەمــــيـــــز﴾

یەکێکیتر لە نەواسیخ، تەمیزە، کە ئەویش ئەوناوەیە، کە تەپو تۆزی نادیاری لە سەر کەسێکی تاك یا خود لەسەر بەشێکی جوملە یەك یان شیبهـ جوملەیەك لا دەبات، وەك ئیسمی فاعیل لە گەڵ فاعیلەکەیدا، کە ڕوونی دەکا تەوە، و نادیارییەکەی دەسڕێتەوە، کە لە یەکەمدا بۆ سڕینەوەی نادیارییە، لە سەر ئەو ژمارەیە، وەك، خوای پەروەردگار دەفەرموێت، لە سەر زمانی (سیدنا یوسف) علیەالسلام: (أن رأیت أحدعشر کوکبا)، لەخەونمدا یانزدە ئەستێرەم بینی، کە ڕوونی دەکاتەوە، یازدە چشتی دیوە؟ پیاو؟ کتێب؟ هەرچی؟ نەء... یازدە ئەستێرە! یاخود بە ڕووونکردنەوەی پێوانەیەك دێت، وەك: (عندی قفیز برا) لە لامە قەفیزێك گەنم، کە (قفیز: بەرانبەر بە دوانزە ساعە، و هەر صاعێکیش ٣ کیلویە، و هەروەها لە پێوانەشدا بۆ ١٤٤ مەتر زەوی بەکار دەهێنرێت)، کە ڕوونی دەکاتەوە، قەفیزێك چی لە لایە)، گەنمی لایە!

أو وزن، نحو: عندى رطل زيتا ، أو مساحة، نحو: عندي ذراعان فاسونا، أو ما يشبهها، كقوله تعالى: ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَه﴾،الزلزلة.٧.

ومّما ينبغي علمه، أن تمييز العدد ينصب في ما بين عشرة، ومأئة، وتمييز ثلاثة إلى عشرة، مجرور ومجموع، نحو: ثلاثة رجال، و عشرة كتب، و تمييز مائة، و ألف، و تثنيتهما، و جمعهما مجرور، ومفرد.

---

یا خود تەمیز بۆ ڕوونکردنەوەی پێوانە بە کار دێت، وەك: (عندى رطل زيتاً: برێك ڕۆنم لایە)، (رطل: بەرانبەر بە نیومەنە)، کە برێکی دیاریکراوە، کە لەم ڕستەیەشدا بڕەکە دیاری دەکات، و نادیارییەکەی ئەسڕێتەوە، یاخود تەمیز بۆ ڕوونکردنەوەی، (مساحة: ڕوبەر) بە کار دەهێنرێت، وەك: (عِندي ذراعان فاسوناً: دوومەتر قوماشی فاسۆنم هەیە)، کە بڕەکەی بە دوو مەتر دیاری کردووە، و ڕوونی کردۆتەوە، یا خود تەمیز جاری وا هەیە، بۆ دیاری کردنی غەیری ئەوانەیش دێت، کە ڕابوردن، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (فمن يعمل مثقال ذرة خيراً يره: ئینجا هەر کەسێك بە ئەندازەی هەرە وردیلەیەك چاکەی کردبێت، دەیبینێتەوە)، کە بڕەکەی و جۆرەکەی دیاری کردووە، کە چاکە کردنە، و ئەگەر هێندەی سەرە مێرولەیەکیش بێت!

پاشان ئەوەی پێویستە بزانرێت، ئەوەیە کە تەمیزی (عدد: ژمارەکان)ی، لە نێوان (عشرة: دە)، تا (مائة: سەد)، بە مەنصوبی دێت، وە تەمیزی (ثلاثة: سێ)، بۆ (عشرة: دە) بە مەجروری، و بە جەمع کراوەیی دێت، وەك،(ثلاثة رجال)، و(عشرة كتب)، وە تەمیزی (مائة: سەد) و (ألف: هەزار)، و موسەنناکانیان، و جەمعەکانیان بە مەجروری و موفرەدی دێت.

والثاني يرفع الأِبهام عن نسبة أِسناديّة، في جملة، نحو: طاب زيد نفساً، أو نسبة أِيقاعية فيها، أي: ربط الفعل بالمفعول، نحو: و﴿فجرنا الأرض عيوناً﴾القمر.١٢، أو عن نسبة في شبه جملة، نحو: الأرض منفجرة عيوناً ، وأنت أعلى منزلاً.*

فأِنَّ التمييز فيهما يرفع الأِبهام عن نسبة، أعلى، ومنفجرة، أِلى فاعلهما المستتر، والوصف مع فاعله شبه الجملة ، و العامل في تمييز القسم الأول، المفرد المبهم، و في تمييز القسم الثاني ما سبقه، من فعلٍ، أو شبهه.

---

دووەم، تەميز ناديارى لە سەر حالـەتێكى تێك ئاڵـراو، لا دەبات، لە ڕستەيەكدا، وەك: (طاب زيد نفساً: زەيد كە سێكى دەرون پاكژە) كە لە پێكهاتەى ئەو كەسەدا، دەروونى جيا كردۆتەوە، يا خود بۆ ديارى كردنى بڕ، و ئەندازە، و (ئاماژەيەكى ئيقاعى، واتە: بە ستنەوەى فيعل بە مەفعولـەكەيەوە) دەبێت، وەك خواى پەروەردگار دەفەرموێت: (و فجرنا لأرض عيونا: وە كانياوى زۆرمان لە زەويدا هەڵقولاند!)، كە جۆرى هەڵقولاوەكە، كە كانياوە ڕوون دەكاتەوە، ياخود تەميز بۆ دياريكردنى ئاماژە و ئەندازەيەك لە شيبهـ جوملەدا دەبێت، وەك: (الإرض منفجرة عيونا)، و (أنت أعلى منزلا)، كە ئەويان مەنصوب بووە، و لە مانادا فاعيلە، چونكە ئەگەر (أعلى) كە ئيسمى تەفضيلە بيكەيتەوە، بە فيعل، ئەوا (منزلا) بە مەرفوعى دەهێنرێت، بەم جۆرە (أنت علا منزِلُكَ) كە (منزِلُكَ)، مەرفوع بۆتەوە، بەلام لە ڕستەى (أنت أعلى رجل)دا، مەجرور بووە، چونكە لە مانادا فاعيل نىيە، وە ياسا، و ڕێساى مەنصوب بوونەكەى لـەوەدايە كە هەر تەميزێك لە توخم، و جينسى پێش خۆى نەبور، ئەوە

مەنصوب دەبێت، بەڵام ئەمەش دیسان دێتەوە ڕێ، ئەگەر (إفْعَلُ) ئیضافە کرابوو، ئەوا مەنصوب دەبێتەوە، لەم کاتەشدا، وەك: (أنت أفضلُ الناس رجلا)، جا بزانە کە تەمیز لە هەر دوو ڕستەی (الارض منفجرة عیونا) و (أنت أعلى منزلا)دا، جۆرە نادیارییەك سەر (أعلى) و (منفجرة)، بۆ لای فاعیلە شاراوەکانیان لادەبات، و دەرەوێنێتەوە.

وە عامیلی سەر تەمیز، لە بەشی یەکەمدا، ئەو موفرەدە نادیارەیە، کە عەمەلی تیایدا کردووە، وە تەمیزی بەشی دووەم، ئەو فیعل، یاخود شیبهـ فیعلەیە، کە لە پێشیەوە هاتووە.

و ممّا يحتاج إِلى التمييز، كم، وكأين، وكذا، فكم: كناية عن العدد، وتستعمل لِلْأِسْتِفهامِ، وتمييزها حينئذ مفرد منصوب، نحو: :كم كتاباً قرأت؟ و قد تدخل عليها الباء الجارة، فيجوز جر تمييزها بِمَنْ، نحو: بِكَمْ مِنْ دِرْهَمٍ أِشتريته؟ و لِلْاَخبارِ، و تفيد الكثرة، وتمييزها مجرور مفرد، نحو: كم وضيع ترفع بالعلم! وكأين، وهي مركبة من الكاف ، وأى المعربة المنونة، ولما تركب جعلت نون التنوين، ثابتة في آخرها، و بـنـي على السكون، واستعمل لِلْاَخبارِ والتكثير، و تمييزها مفرد مجرور بِمِنْ، نحو(١): ﴿وَكَأَيِّن مِنْ دَابَّةٍ لاَ تَحْمِلُ رِزْقَهَا اللَّهُ يَرْزُقُهَا﴾العنكبوت. ٦٠.

---

وه لـەوانەی کەپێویستیان بە تەمیز هەیە، (کم)، (کأین)، (کذا)، کە وشەی (کم) بۆ دەربڕین، و دركاندنی ژمارەیە، وە بۆ (أستفهام: پرسیار کردن)یش، بەکار دەهێنرێت، وە لـەم کاتەدا تەمیزەکەی موفرەدی مەنصوب دەبێت، وەك: (کم کتاباً قرات ؟ چەند کتێبت خوێندۆتەوە؟) وە هەندێ جار پیتی (باء)ی، حەرفە جەڕی دەچێتە سەر، بۆیە مەجرورکردنی تەمیزەکەی بە هۆی (من)ـەوە، دروست دەبێت، وەك (بکم من درهم أشتريت؟ بە چەند درهەمت کڕیوە؟)، وە بۆ هەواڵ پێدان دەبێت، بەڵام زۆرایەتی لـێوە دەفامرێتەوە، کە تەمیزەکەی بە مەجروری، و موفرەدی دێت، وەك، (کم وضيع ترفع بالعلم! چەندێ کەسی لابەلا، بە هۆی زانستەوە باڵا، و پایەبەرز بوونەوە!)، وە هەروەها (کأین) پێویستی بە تەمیز هەیە، کە

---

(١)*هذا النوع من التمييز بعد أفعل التفضيل ينصب، لِأنَّهُ فاعل فى المعنى، والمثال فى قوة علا منزلک جدا، بخلافه فى أنت أعلى رجل فيجر، لِأنَّهُ ليس فاعلاً فى المعنى، وضابط النصب كل تمييز، لم يكن من جنس ما قبله! "الماتن، رحمه الله".

ئەم (كأين)ـە، لە پیتی (كاف) و (أی)ـی، موعرەبی تەنویندار پێك هاتووە، كە لـكێنران بە یەكەوە، نوونی تەنوین لـەكۆتاییەكەیدا جێگیر كرا، و لـە سەر سكون مەبنی بوو، كە بە گشتی بۆ هەواڵ پێدان، و زۆرایەتی بە كار دەهێنرێت، وە تەمیزەكەیش موفرەدە، و بە (من)، مەجرور دەبێت، وەك پەروەردگاری جیهانیان دەفەرموێت: (وكأين من دابه لا تحمل رزقها، الله یرزقها: زۆر گیانلـەبەر هەیە، ڕۆزی خۆی هەڵناگرێ، و كۆی ناكاتەوە بۆ داهاتوو، خوا ڕۆزی ئەو گیانلـەبەرانە دەدات).

وكذا: كناية عن العدد كثيراً، وتمييزها مفرد منصوب، نحو: عندي كذا درهماً، و تأتي كناية عن غيره قليلاً، نحو: سافرت يوم كذا كناية عن يوم السبت، أو فعلت كذا وكذا، كناية عن الأعمال.

---

وە (كذا) بۆ ئاماژەدان بە (ژمارە: عدد) دێت، بە زۆری، وە تەمیزەکەی موفرەد، و مەنصوب دەبێت، وەك، (عندی كذا درهما،: ئەوەندە درهەمم لایە).

وە بۆ ئاماژەدان بە غەیری (ژمارە)یش، دێت، بەڵام بە کەمی، وەك: (سافرت یوم كذا: فلانە ڕۆژ سەفەرم کرد)، کە مەبەست پێی ڕۆژی شەممەیە، یاخود (فعلتُ كذا، و كذا: فلان، و فلان، ئیشم کردا).

ـ یەکێکی تر لـە مەنصوبات و مەعمولاتی فیعل، ئەو ئیسمەیە کە لـەماناوادا بە فاعیلی فیعلـەکە دێتە ئەژمار، وەك: (طابَ زیْدٌ نفْساً) بەتەقدیری (طاب نفس زیدٍ)ە، هەر بەو جۆرەی کە لـەم مەفهوم و ماناوە دەردەکەوێت، کە ئەو ئیسمەی لـەسەرەوە باسمان کرد، ئاشکراکەری مانای ڕستەکانە، و ئەو نادیارییەی بەسەریانەوەهەیە لای دەبات، لـە هەر ڕستەیەك دا کە تەمیز هەبێت، هەرچەندە تەمیزەکەش دەرنەکەوتبێت، ئەوا جۆرە نادیاریەك (أبهام) دێتە ئاراوە، کە ئەو نادیاریەش تەنها بەدەرخستن و باس کردنی تەمیزەکە لادەبرێت، وە لـەڕاستیدا ئەو تەمیزەیە کە نادیاری لـەسەرجەمی ڕستەکەدا دور ئەخاتەوە و ڕوونی پێ دەبەخشێت، لـەبەرخاتری ئەمەیە کە لـەپێناسەی تەمیزدا گوتراوە:"**فالتمیزُ: أسْمٌ یذکر لبیان المراد من أسم مبهم قبلهُ**":بۆیە، تەمیز کاری ئەوەیە کە نادیاری "أبهام" لائەبات، لـەسەر شتە باس کراوەکە، وەك: (واشتعل الرأس شیباً)، و (طاب زیدٌ نفساً).

(اشتعل): فیعلە و (الرّأسُ) فاعیلـە، (شیباً) مەنصوبەو تەمیزە، کە لـەم نمونەیەدا (شیباً)، ئەو ئیبهامەی لـەسەر (رأس) لابردووە، و ڕەنگەکەی دیاری کردووە.

(طاب): فیعلەو (زیدٌ) فاعلیە، (نفساً) تەمیزە، لەم نمونەیەدا تەمیزەکە ئیبهامیەتی لەسەر زاتێکی موقەددەر لاداوە، لە نمونەی (طاب زیدٌ نفْساً) هیچ ئیبهامێك لە (طاب)دا نی یە، و پەیوەندی نێوان ئەم دوانە ڕوون و ئاشکرایە.

بەڵکو لەواقیعدا تەمیزەکە ئیبهامی زاتە شاراوە (مقدّر)ەکەی دەرخستووە، کە تەقدیری کەلامەکە بەم جۆرەیە: (طابَ أمْرٌ من أمورِ زیدٍ) ئەم شتە موقەددەرە، کە گۆڕدراوە بەزاتێکی موقەددەر، موبهەمەو دیار نی یە، و ئیتر (نفساً) ئەو نادیاریەی لادا، لەم ڕوانگەیەوە نمونەی (گابٌ زیْدٌ نفْساً)، وشەی (نفساً) ئیبهامەکەی لەسەر کەسی نیسبەت بۆ دراو لادا،نەك لەسەرخودی نیسبەت دانەکە.

وە لەنمونەی (واشتعل الرّأسُ شیْباً)دا، تەقدیری ڕستەکە بەم جۆرەیە، (أشتعل الشّیئ المنسوبُ إلی الرّأس) کە (شیباً)، ئیبهامی لەسەر زاتی موقەددەرەکە (خودی شتە شاراوەکە) کە (شیئ)ە، لاداوە، وە ئەم حوکمە لەسەرجەم نمونەکاندا هەر بەم جۆرەیە، وەك: (طابَ زیدٌ اباً وأبوّةً وداراً و عِلْماً).

بۆیە تەمیز، لابەری ئیبهام بێت، لەسەر زاتی موقەددەر یاخود لەسەر زاتێکی باسکراو (مذکور)، چونیەکەو هەربەتەمیز ناودەبرێت و بە کیرەیش دێت.

**﴿جیاوازی نێوان تەمیزو حاڵ﴾**

لەچەند ڕویەکەوە جیاوازی هەیە، لەنێوان حاڵ و تەمیزدا، کەبەسەرنج لێدانی ئەو جیاوازیانە دەتوانرێت، لەیەکتر جودا بکرێنەوەو بناسرێنەوە.

١.حاڵ بەشێوەی جوملە "فیعلی، ئیسمی، شیبە جوملە" دەهێنرێت، بەڵام تەمیز لەسەرجەم حاڵەتەکاندا ئیسمێکی موفرەدە.

٢.حاڵ ڕونکەرەوەی شکلّ و شێوازی خاوەن حاڵە کە (ذي الحال)ەکەیە، بەڵام تەمیز ڕونکەرەوە،و دەرخەری زاتی شتەکانە.

٣.حاڵ بۆی هەیە، بەشێوەی "متعدّد" ژمێردراوی بێت، لەکاتێکدا تەمیز تەنها بە موفرەدی دێت، و ڕونادات کە بە ژمێردرای بێت.

٤.حاڵ لەهەندێ جێگای تایبەتدا پێش دەکەوێت، بەسەر "ذي الحال"دا، بەڵام تەمیز لەهیچ کاتێکدا پێش ناکەوێت، و تەمیزی پێش کەوتە، هەندێ جار و زۆر بەکەمی لەشیعردا دەبێت، کە ئەوەندە کەمە ئەو حاڵەتەش حیسابی لەسەر ناکرێت.

٥.حاڵ دەبێت موشتەق بێت، لەکاتێکدا کە تەمیز دەبێت، جامید بێت.

٦.حاڵ جەخت کەرەو "مؤکد"ی عامیلەکەیە، لەکاتێکدا کە تەمیز ڕونکەرەوەی عامیلەکەی خۆیەتی.

وە لەهەندێ ڕوویشەوە، حاڵ و تەمیز، وەك یەکن:

١.هەردووکیان نەکیرەن.

٢.هەردووکیان مەنصوبن.

٣.هەردووکیان نادیاری "إبهام" لائەبەن.

٤.هەردووکیان لەکەلامدا زیادە "فُضْلة"ن.

*　　　*　　　*

**وەك ئەوەی کە باسی عەدەد کۆتاکتی بەم باسی تەمیزەوە هەیە، لێرەدا درێژە باسێك دەهێنم، کە لە (شەرحی هیدایە)، و (شەرحی عەوامیلی مەلا موحسین وەرمگرتوون، بە هیوای سوودبینین:**

﴿باسی ژمارەکان﴾: ئەم باسە لە ڕوانگەی ژمارەکە، و تەمیزەکەیەوە دەدوێت، ئینجا دەفەرموێ:(ما وُضع لیدّل علی کمیّة آحاد الأشیاء)، ئەوەیە کە دانرابێت بۆ ئەوەی کە لە سەر میقدار و ئەندازەی ژمارەهایەك دەلالەت بکات، وەك : (جائتنی تسع نساء)، کە لەفزی (تسع) لەم نمونەیەدا ژمارە و میقداری ( نساء) دەردەخات، کە نۆدانەن و بەس ! ( و أصول العدد أثنتا عشرة کلمة: واحد ألی عَشْر ، ومأة، و ألف)، و ژمارە ئەصڵیەکان دوانزە دانەن، بەم شێوەیە: ( واحد ، أثنان ، ثلاثة ، أربعة ،خمسة ، ستة

، سبعة ، ثمانية ، تسعة و عشرة)، وە هەروەها (مأة) و( ألف ) كە سەرجەم دوانزە دانەن، وە (مليون) حساب نييە، چونكە لە عەرەبيى فەصيحدا نەهاتووە،( وأستعماله من واحد اثنين على القياس )، وە بزانە كە بەكارهێنانى ژمارەى يەك و دوو هاوڕێكى قياسە ، .. ( أعنى) بەو مانايەى كە (يكون المذكر بدون التاء)، بۆ مەعدودى مذكر عەدەدەكە بە لەفظى مذكر دێت، (والمؤنث بالتاء) وە لە مؤنث دا لەگەڵ تاءدا دێت، و لە سەر لەفظى مؤنث دێت، بۆ نمونە، (تقول فى رجلى واحد وفى رجلين أثنان) بۆ (رجل:واحد)، دەڵێين، و بۆ ( رجلين:أثنان) چونكە مذكرن، ( وفى أمرأة : واحدة وفى امرأتين : أثنتان وثنتان )، وە بۆ ( أمرأة ) ، ( واحدة ) و بۆ (أمرأتين ) ، (أثنتان ) و ( ثنتان ) بەكاردێت، چونكە مؤنثن. (ومن ثلاثة ألى عشرة ) وە لە ژمارەى (٣) سێ تا ( ٩ ) نۆ ،( على خلاف القياس ) لە سەر پێچەوانەى ياساو قياس دەبێت، أعنى: واتە (للمذكر بالتاء) بۆ مەعدودى مذكر عەدەدەكە دەبێت مؤنث و ( تاء)ى پێوە بێت، (تقول : ثلاثه رجال ألى عشرة رجال) بۆ مذكر (ثلاثة رجال و أربعة رجال .... عشرة رجال ) بەكاردێت ، كە عەدەدو مەعدود پێچەوانەى قياسن!

(و للمؤنث بدونها ) بەڵام بۆ مؤنث بەبێ ( تا )ـە، ( تقول : ثلاث نسوة ، ألى عشر نسوة)، چونكە كە ( نسوة ) مؤنث دەبێت، عەدەد مذكر بێت، واتە: پێچەوانەى يەكترين، بعد العشر : وە دواى ژمارە (١٠) دە، واتە (١١) يانزە و (١٢) دوانزە هاوڕێكى قياسن، ( تقول : أحد عشر رجلاً ، وأثنى عشر رجلاً ، وأحدى عشرة أمرأة ، وأثنتى عشرة أمرأة)، مەبەست لێرەدا ئەوەيە كە بۆ مەعدودى مذكر دەبێت، هەر دوو بەشەكەى ژمارەكەى مذكر بن و بۆ مؤنث دەبێت هەر دوو بەشەكە مؤنث بن، وەك لەنمونەكاندا هاتبوو، كە ( أحد عشر ) موتابيقى (جلاً) بوو، (وأحدى عشرة) موتابيقى (أمرءة) بوو، ( و ثلاثة عشر رجلاً، وثلاث عشرة أمرءة ، ألى تسعة عشر رجلاً ، وألى تسع عشرة أمرءة)، لێرەدا دانەر قاعيدەيێكى تر دەسەلمێنىٚ، لە سێزدە (١٣) بەدواوە، تا (١٩) بەو شێوازەى كە دەبێت بەشى يەكەمى ژمارەكە خيلافى قياس بێت، وە بەشى دوومى موتابيق بێت، وەك لە نموونەكاندا هەيە، كە (ثلاثة) بەشى يەكەم، پێچەوانەى (رجلاً)ـە، چونكە (ثلاثة) مؤنثە، و (رجلاً) مذكرە،و بەشى دووەم كە (عشر)ـەيە، موتابيقى(رجلا)ـە، چونكە هەردووكيان مذكرن، و نمونەكانى ريش هەروان.

(بعد ذلك تقول : عشرون رجلاً ، وعشرون أمرأة ، بلا فرق ألى تسعين ، رجلاً و أمرأة)، پاشان ژمارەی بیست (٢٠) تا نەوەد (٩٠) کە ( ألفاظ العقود)ن، هەر وەکو خۆیان وان بۆ مذکر و مؤنث، ئەمان هەر یەك صیغەیان هەیە، وەك (عشرون رجلاً ) یان (عشرون أمرأة).

( وأحد و عشرون رجلاً وأحدى وعشرون أمرأة ، ألى تسعة و تسعين رجلاً و ألى تسع و تسعين أمرأة، وە ژمارەکانی (٢١ ، ٢٢ ، ٣١ ، ٣٢ ، ٤١ ، ٤٢ ، ٥١ ، ٥٢ ، ٦١ ، ٦٢ ، ٧١ ، ٧٢ ، ٨١ ، ٨٢، ٩١ ، ٩٢ )، دەبێت موتابیقی قیاس بن، وەك: ( جائنی أحد، وعشرون رجلاً ) کە (أحد) و ( عشرون) موتابیقی (رجلاً)ن، یان ( أحدی وعشرون أمرأة ) کە ئەمەیش هەر وایە، بەڵام جگە لەو ژمارانەی باسکران، تا نەوەد ونۆ ( ٩٩ ) دەبێت خیلافی قیاس بن، وەك (رأیت تسعة وتسعین رجلاً) کە (تسعة) پێچەوانەی (رجلاً)ـە، کە ئەو مؤنثە، و (رجلاً) موزەککەرە، و (تسعین) کە یەك صیغەی هەیە، بە هۆی (واو)ـەوە، عەطف کراوەتە سەری.

پاشان بۆ ( مأة ) و ( ألف ) و تەثنیەکانیان یەك صیغەیان هەیە، وەك ووترا کە لە (رجل و أمرأة)دا، هەر ( مأة ) بە کار هات و لە تەثنیەکەیاندا کە (مأتا) بۆ (رجل و أمرءة) بەبیٚ گۆڕانکاری بەکارهات، وە لە (ألف:هەزار) دا هەر وایە، بە بیٚ جیاوازی لە نێوان مزکر و مؤنث دا، کە لەو نمونانەدا لەفزی (مأة و ألف) لە حاڵەتی تثنیە دا بۆ مذکر و مؤنث وەك یەك هاتوە، وە لەو شوێنانەدا کە (مأة و ألف) لەحاڵەتی تثنیە دا بۆ لای غەیری خۆیان ئیضافە کران، نونەکەیان لابرا. ( فأذا زاد علی الألف والمأة یستعمل علی قیاس ماعرفتَ ، وتقدم الألفَ علی المأة ، والأحاد علی العشرات)، وە هەر کات کە لە ( ١٠٠ و ١٠٠٠ ) تێپەڕی، ئەوا دەبێت بە گوێرەی قاعیدە ناو براوەکان بدوێین، واتە : لە (١٠١ ،١٠٢ ، ١٠٠١ و ١٠٠٢) و هەروەها لە ( ١١١ ،١١٢ ، ١٠١١ ، ١٠١٢ .. )دا موطابیقی قیاس کاریکەین، واتە بۆ مذکر مذکر و بۆ مؤنث مؤنث بێت، کە لە ( ١٠٢ ، ١٠٠٢) تێپەڕی، و ( ١٠٣ ، ١٠٠٣) هاتنەکایەوە، ئەوا دەبێت بەخیلافی قیاس کار بکرێت، و دەبێت لە ژمارەیەکی وەك (١١٠٠)دا، لە ڕستەی یەکەمدا لەفزی هەزار پێش، صەد بخەین، و یان لە ڕستەی ( عندی ألف و مأة و أحدو عشرون رجلاً ) دا ( أحد ) پێش ( عشرون) بخەین، بە پێچەوانەی زمانی کوردییەوە کە دەڵێین:(هەزار و صەد و

بیست و یەك ) کە ( بیست ) پێش خراوە، ( تقول : عندی ألف ومأة و أحد و عشرون رجلاً )، (و ألفان و ثلث مأة و أثنان و عشرون رجلاً)، وە ژمارەی ( ٢٣٢٢ ) دوو لەفزی (الفان و عشرون) بۆ مذکر و مؤنث یەکسانن، وە ژمارەی هەزار بە سەر صەد دا هاتووە، وە ( أحاد ) پێش بە ( عشرات ) کەوتووە، وە ( أثنان و عشرون) موطابیقە، بەڵام (ثلث) بۆ یە بە مذکری هاتووە، چونکە لە کەناری ( مأة)دایە، ( وأربع الآلاف وسبع مأة و وخمس و أربعون رجلاً) پێشەکی ئەم ڕستەیە گرفتی تێدایە، بەوەی کە وشەی (رجلاً) دروست نییە، وە دەبوا ( أمرأة) بهاتایە، چونکە ( خمس ) بە مذکری هاتووە، کە ئەمەش لە هەندێ لەنوسخە کانی (الهدایة فی النحو)دا، جەختی لە سەر کراوەتەوە، وە ژمارە ( ٤٧٤٥ ) مەبەست ئەوەیە کە دوو لەفزی ( أربع و سبع ) لە کەناری ( آلاف و مأة ) دا، هەردووکیان مؤنثن، قەراریارن گرتووە، وە ئەم ژمارەیە قاعیدەکانی بە سەردا دەگونجێ!

وە تێنینی ئەوەش بکە کە ( ألف ) هەزار، پێش ( مأة ) کەوتووە، و (آحاد) لەپێش ( عشرات )ـەوە، هاتووە، ( و علی ذلك القیاس ) وە هەر لە سەر ئەو شێوەیە هی تر قیاس بکە، وەك:

١ـ ( عندی ألف و مأة و ثلثة رجل ، وثلث نسوة ) .

٢ـ ( عندی ألف و أمأة و أحد عشر رجلاً ، و إحدی عشرة امرأةً ) .

٣ـ ( عندی ألف و مأة و ثلثة عشر رجلاً ، و ثلث عشرة أمرأة ) .

٤ـ ( عندی ألف و مأة و أحدی و عشرون أمرأة ، و ألف و اثنتان و عشرون امرءة ،....أخ ) .

وەبزانە کەژمارەی ( واحد وأثنین ) پێویستیان بە تەمیز نییە، چونکە لەفزی جوێکەرەوەکە پێویستی پێی نییە، و دەڵێت: ( عندی رجل و رجلان ) ئیتر پێویست بە تەمیز ناکات، وە ئایەتی ( فأذا نفخ فی الصور نفخة واحدة ) یان (لا تتخذوا إلهین أثنین) ئەو ( واحدة ) و ( أثنین ) صیفەتی تەئکیدین، بەڵام ئیتر ژمارەکانی تر تەمیزیان بێگومان پێویستە! ( فتقول : فی ممیّز الثلاثة ألی العشرة : مخفوضاً ومجموعاً ) لە تەمیزی ( ٣ تا ١٠ ) بە مەجروری و بە جەمعی دێت، (تقول : ثلثة رجال و ثلث نسوة ) کە ( رجال، نسوة) بە مەجروری و بە جەمعی هاتوون، (إلاّ أذا کان

المميّزُ لفظ المأة فحينئذٍ يكون مخفوضاً مفرداً، تقول : ثلثمأة )، وە ئەگەر ژمارەی ( ٣ تا ٩ ) لە گەڵ لەفزی (مأة) دا هاتن، ئەوە تەمیزەکەیان مەجرور و موفرەدە، وەك (ثلثمأة) کە موفرەد و مەجرورە، و (مأة) بە جەمعی و مؤنثی یان ( مئین ) بە جەمعی مذکر بەکار نایەت، ( والقیاس : ثلث مآت أو مئین) هەر چەند قیاس وایە کە بە جەمعیی بێت.

(ومميّز أحد عشر ألى تسع و تسعين منصوب مفرد ) وە تەمیزی (أحد عشر) تا ( تسع و تسعین ) دەبێت، موفرەد و مەنصوب بێت، وەك: ( تقول : أحد عشر رجلاً ، وتسع و تسعون امرأة ) کە ( رجلاً و اِمرأة ) بە موفرەدی و مەنصوبی هاتوون، (و مميّز مأة وألف و تثنيتهما و جمع الألف مخفوظٌ مفرد) وە تەمیزی ( ١٠٠ و ١٠٠٠ ) و ( ٢٠٠ و ٢٠٠٠ ) دەبێت، مەجرور و موفرەد بێت، ( تقول : مأة رجل و مأتا رجل ، ومأة أمرأة و مأتا أمرأة ، وألف رجل و ألفا رجل و ألف أمرأة و ألفا أمرأة ، و ثلاث ألاف رجل و ثلاث آلاف أمرأة و قس على هذا ) کە لەم نموونانەدا کە تەمیزەکانیان موفرەد و مەجرورن، بە گوێرەی قاعیدەی ناوبراو، ئەوەی باسکرا چمکێك بوو، لە سەر عەدەد و پاشکۆکانی، وە ئەم باسی عەدەدە زۆر گرنگە، نابێت ئیهمال بکرێت!

ئینجا دێتە سەر پێناشەی مؤنث و دەفەرموێ : ( ما فيه علامة التأنيث لفظًا أو تقديراً)، مؤنث ئەوەیە کە عەلامەتی تأنیثی لە سەر بێت ئیتر لەفزی بێت، یان تەقدیری وەك باسدەکرێ، وە مذکر پێچەوانەی ئەمەیە کە باسکرا، وە نیشانەی تأنیث بون، سیانن:(تاء)ـە، وەك (طلحة) ، یان ئەلفی مەقصورەیە، وەك (حبلی) ، ( والممدودة کحمراء و صفراء) یان ئەلفی مەمدودەیە، وەك: (حمراء و صفراء ) پاشان دەفەرموێ : ( والمقدّر أنما هو التاء فقط)، وە تەنها عەلامەتێك کە لە ئیسمدا موقەددەرە، لەو سێ عەلامەتە (تاء) دەبێت، وەك ( أرض و دار ) کە مؤنثن، وە نیشانەی تأنیثەکە یان موقەددەرە، چونکە هەر کات تەصغیری بکەین، ( تاء)ـە، کە یان دەردەکەوێت.

(کأرض و دار ، بدليل أريضة ، ودويرة) کە تەصغیر کراون، و (تاء)ـە،کەیان دەرکەوتووە، ( ثم المؤنث على قسمين ) پاشان مؤنث دوو جۆرە: ( حقيقي و هو ما بأِزائه حيوان مذكر كأمرأة و ناقة) یان مؤنثی حقیقی: ئەویش ئەوەیە کە لە بەرانبەریدا گیاندارێکی مذکر هەبێت، وەك (اِمرأة– ناقة)، (و لفظيٌ : و هو مجازيٌ بخلافه كظلمة و

عين)، وه یان مؤنث لەفزیه ومەجازیه، به پێچەوانەی ئەوی ترەوه ، وەك ( ظلمة ، وعين ) كه مؤنثی لەفزین، و غەیره حەقیقین، ( وقد عرفت أحكام الفعل أذا أسند ألى المؤنث فلا نعيدها) وه حوكمی ئیسناددانی فیعلیی بۆ لای فاعیلێكی مؤنث باسكراو، پێویست به دووبارەكردنەوه ناكات .

## «یاسای ژمارەكان له دێڕی هۆنراوەدا»

| | |
|---|---|
| ثمانا بعد ما جاوزت الأثنين | بمجموع ومجرور فميز |
| عدا ما كان منها قد أضيفت | إلى مأة بفرد فهو ميز |
| وفيما بعد عشر فردا أنصب | إلى تسع وتسعين المميز |
| ولما جاز من تسع وتسعين | فجر عند ذا فردا تميز |

ئاگاداری: كاتێ كه دەتەوێت كه ئەندازەی شتێك بڵێیت، بۆ نموونه (رجل) یان (رجلان) واته پیاوو، دوو پیاو تەمیزی ناوێت، لەم كاتەدا كه لەمه تێپەڕی ژمارەكه دەهێنیت و تەمیزی بۆ دادەنێیت، وەك لەم شیعرانەدا عەللامه مەلا موحسینی فەیضی كاشانی ڕوونی كردۆتەوه:

ثمانا بعد ما جاوزت الأثنين     بمجموع ومجرور فميز

واته: هەشت دوای ئەوەی كه له یەك و دوو تێپەڕی، واته، له دوای ئەوەی كه تەمیزی یەك و دووت زانی، له سێ تا ده، كه هەشت ژمارەن، تەمیزەكەیان جەمع ومەجرور بكه، وەك: (عندي ثلاثة رجال).

عدا ما كان منها قد أضيفت     إلى مأة بفرد فهو ميز

جگه لەو ژمارانەی كه بۆ لای (مأة) ئیضافه كراون، لەوێدا تەمیز به موفرەدی بێنه، وەك: (ثلاثمأة) كه (مأة) موفرەده، و تەمیزه.

وفيما بعد عشر فردا أنصب     إلى تسع وتسعين المميز

له دوای (١٠) موفرەدەكه مەنصوب بكه، تا (٩٩)، واته: تەمیزی (١١– ٩٩) موفرەد و مەنصوب بكه.

ولما جاز من تسع وتسعين     فجر عند ذا فردا تميز

کە لە (٩٩) تێپەڕیت، پێویستە مەجرور بێت، لە لای کەسێ کە تەمیزەکە موفرەد بکات، واتە تەمیزی (١٠٠) بەرەو ژوور دەبێت، موفرەدو مەجرور بێت، وەك: (مأة رجل، مأتا رجل، ثلاثمأة رجل)، تا(تسعمأة رجل)، و(ألف رجل)، تا (تسعة آلاف رجل).

(ڕوونکردنەوە) : لەبەر ئەوەی کە باسی عەدەد، باسێکی ووشك و تا ڕادەیەك ناخۆش و سەختە لەم پەراوێزەدا بە درێژی ئەو عیبارەتە عەرەبییەی سەرەوە سەر لە نوێ شەرح دەکەمەوە، و زۆر بە ڕوونی دەیخەمە بەردەست خوێنەری بەڕێزەوە، إنشاءالله، تا تێگەیشتنی بۆ عیبارەتەکانی سەرەوە، و جەوهەری باسەکە زیاتربێت:

**پێش ئەم درێژە باسە پێویستە ئەم چەند یاساو ڕێسایەی خوارەوە بزانرێت:**

*__ئیسمی عەدەد:__ ئەو ئیسمەیە کە دانراوە تاوەکوو دەلالەت بکات لەسەر ئەندازەی شتەکان، یان بە دەستەواژەیەکی تر، ئیسمی عەدەد ،ئەو ئیسمەیە کە دەلالەت لەسەر ژمارە یاخود لە سەر (ترتیب: ڕێکخستن) بکات.

ئەو عەدەدەی کە دەلالەت لەسەر ژمارە بکات، بە عەدەدی ئەصڵی، و عەدەدەکە دەلالەت لەسەر تەرتیب، بکات، بە عەدەدی تەرتیبی ناوزەد کراون:

* __عەدەدی ئەصڵی،__ لەزمانی عەرەبیدا دەبنە چوار بەشەوە:

١– عەدەدی موفرەد: کە بریتی یە لە (واحد) تا (عشرة) و (مأئة) و (ألف).

٢– عەدەدی موڕەککەب:– کە بریتین لە (أحد عشر)، (أثنا عشر)، (ثلاثةَ عشر)، (أربعة عشر)، (خمسة عشرَ)، (ستّة عشر)، (سبعة عشر)، (ثمانيةَ عشرَ)، (تسْعةَ عشرَ).

٣–عوقود: کە بریتین لە (عشرون)، (ثلاثون)، (أربعون)، (خمسون)، (ستّونَ)، (سبعونّ)، (ثمانونَ)، (تسْعون).

٤– عەدەدی مەعطوف، لە (واحدو عشرون: بیست و یەك) تا (تسعٌ وتسعون: نەوەدونۆ) دەگرێتەوە.

–عەدەدە تەرتیبی یەکانیش دیسانەوە، وەك: عەدەدە ئەصڵی یەکان دەبنە چوار بەشەوە: (مفرد–مركبّ–عقود–معطوف).

أ–عەدەدە موفردە تەرتیبی یەکان بریتین لە: (أوّل–ثاني–ثالث–رابع–خامس–سادس–سابع–ثامِنْ–تاسعْ–عاشرْ).

ب–عەدەدی موڕەککەبی تەرتیبی لە (حادی عشر) تا (تاسع عشر) دەگرێتەوە.

ج–عوقود: لە (عشرون) تا (تسعون) دەگرێتەوە.

د–عەدەدی مەعطوفی تەرتیبی لە (حادی و عشرون) تا (تاسعْ و تسْعون) دەگرێتەوە.

*(بنەماکانی عەدەد:أُصول العدد) بریتین لە دوانزە وشە بەم تەرتیبە:

(واحد-إثنان-ثلاث-أربَعْ-خمْس-سِتّ-سبْع-ثمان-تسْع-عشر-مائة-ألف).

لەفزی (واحد و إثنان) لە موزەککەرداو (واحدة و أثنان، یان، ثنتان) لە مؤنث دا بەکار دێن، بە گوێرەی یاساو قیاسی زمانی عەرەبی، واتە: موزەککەر لەگەڵ موزەککەر و مؤنث لە گەڵ مؤنث دا دەهێنرێت، وە لەگەڵ (معدود: ژمێراوەکەدا) کۆناکرێنەوە، واتە: ناتوانرێت بگوترێت: (واحدٌ رجُلٌ و إثنانِ رجُلان و واحدة إمرئةٌ وإثنتان امرئتان).

بەڵام لەژمارەی سێ تا دە، (٣–١٠) بە پێچەوانەی یاساو قیاسە، واتە بۆ مەعدودی موزەککەر ژمارەی مؤنث و بۆ مەعدودی مؤنث، ژمارەی موزەککەر بەکار دەهێنرێت، بۆ وێنە: (ثلاثةُ–رجال) (رِجال) کە جەمعی (رَجل)ـە، و موزەککەررە، ژمارەکەی لە گەڵ (تاء تأنیث) داهێنراوە، وە لەگەڵ مؤنث دا، ژمارەکە بەبێ (تاء تأنیث) هاتووە، وەك: (ثلاثُ نسوة)، و وەك ئەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێت: (وسخّرها علیهم سبع لیالٍ و ثمانیةً أیام)

(سخّر)، فیعلی ماضي یە، و فاعیلەکەی ضەمیری شاراوەیە تیایدا، (هاء): مەفعول بە،یەکەمە. (علیهم): جارومەجروورە (سبع): مەفعول بە، دووەمە، و هو مضاف (لیال): مضاف إلیە (واو): حەرفی عەطفە (ثمانیة): عەطفە لە سەر (سبع) و هو مضاف (أیام)، مضاف إلیە، کە مەبەست لێرەدا، وشەی (لیال)، کە مؤنثە، و ژمارەی موزەککەری (سبع)ی بۆ بەکارهێنراوە، وە هەروەها وشەی (أيّام) کە موزەککەر و ژمارەی مؤنثی بۆ بەکارهێنراوە.

هەر دوو ژمارەی (یانزدە و دوانزە) بە گوێرەی یاسا و ڕێسا دەچێت بەڕێوە، بەدەستەواژەیەکی تر بۆ مەعدودی موزەککەر، عەدەدی موزەککەر، و بۆ مەعدودی مؤنث، عەدەدی مؤنث بەکاردەهێنرێت.

وەك، (أحد عشر)، (أثنی عشر رجلاً)، (إحدی عشرة أمرئة)، (إثنی عشرة أمرئة).

بەڵام لە ژمارەی (سێزدە، تا نۆزدە) بە پێچەوانەی قیاسەوەیە، بۆیە بۆ موزەککەر دەوترێت، (ثلاثةُ عشر رجُلاً) وە بۆ مؤنث (ثلاث عشرةَ إمرئة) دەگوترێت.

موزەککەر و مؤنث لە (عشرين) و هاو وێنەکانی دا (ثلاثون، أربعون، تا، تسعون) یەکسانن، وەك: (عشرون رجُلاً) و (عشرون إمرئةً) تا (تسعين رجلاً و إمرئةً).
ئەگەر ژمارەگەلێك ببنە هاوڕێی (عشرون)ـە، و هاووێنەکانی لەم کاتەدا لەگەڵ حەرفی عەطفدا دەهێنرێن، بۆ نمونە لە موزەککەردا (أحد و عشرون رجلاً) وە لە مؤنث دا (أحْدى و عشْرون إمرئةً) دەگوترێت، لە نموونەی یەکەمدا (مەعطوف عليه) —أحدٌ— بە موزەککەری و لە نمونەی دووەمدا مەعطوف عليه (أحدى) بە مؤنثی هات.
بەڵام لە ژمارەی (بیست و سێ) تا (نەوەدو نۆ) حوکمەکەی بە پێچەوانەی یاساو قیاسەوەیە.
وەك: (تِسعةٌ و تسعين رجُلاً) و (تسعٌ و تسعين إمرئةً) کە لە موزەککەردا مەعطوف عليه (تسعة) مؤنث بوو، وە لە مؤنث دا مەعطوف عليه —تسع— موزەککەر بوو.
لە دوو ژمارەی (مائة و ألف — صەدو هەزار دا)، وە هەروەها موسەننای، ئەم دوانە، (دوسەد و دووهەزار) یەکسانن، بەو مانایەی کە موزەککەرو مؤنث لەم تایبەتمەندیەدا هیچ جیاوازیەکیان نی یە، وەك: (مِاة رجلٍ) و (مأة أمرئةٍ) و (الف رجُلٍ) و (ألْف إمرئةٍ)، و (مأتا رجُلٍ)، و (مأتا إمرئةٍ) و (ألفاً إمرئةٍ) کە لەسەر جەم نمونەکاندا جیاوازیەك لە نێوان موزەککەر و مؤنث دا نی یە.
وە کاتێك کە ژمارەکە لە (صەدو هەزار) تێپەڕی.
ئەوەی کە زیاد کراوەکەیە لەسەری (سێ تا نۆ) هەروەك پێشتر حوکمەکەی باسکرا، عەطف دەکرێتە سەر خودی (مائة و ألف) وەك: (مأة و خمسة رجالٍ) و (مأة و خمس نسوةٍ).
*__بزانەکە:__ ڕێڕەوی هێنانی ژمارەکان بەم جۆرەیە، کە ژمارەی هەزار بەسەر سەد،دا پێش دەکەوێت، وە هەر بەم شێوازەیش(أحاد: یەکان)ـەکان بە سەر (عشرات: دەیان)ـەکاندا پێش دەکەون، بۆ نمونە: (هەزار و سەدو بیست و یەك) بەم جۆرە دەهێنرێت: (عندي ألف و مأةٍ و أحد و عشرون رجُلاً).
وە هەر بەم شێوازەیش (دوو هەزار و سێ سەد و بیست و نۆ) بەم جۆرە دەهێنرێت:(ألفان و ثلاث مأة و إثنان و عشرونَ رجُلاً).

وە کاتێك کە بمانەوێت بڵێین: (چوار هەزار و حەوت صەد و چل و پێنج) بەم جۆرە دەیڵێین: (عندي أربع آلاف و سبعمأة و خمس و أربعون رجُلاً).

*پاشان بزانە: کە هەردوو ژمارەی (واحد و إثنان) بە بێ تەمیز، دەهێنرێن، چونکە لەفزی (رجل) و (رجلان) بە تەنهایی دەلالەت لەسەر (واحد و أثنان) دەکەن، بەڵام ژمارەکانی تری غەیری (واحد و أثنان) پێویستیان بە تەمییز، هەیە.

هەر لەم ڕوانگەیەشەوە، تەمیزی (سێ تا دە) بە جەمعی و بە مەجروری دەهێنرێت، مەگەر لەکاتێکا کە تەمییزی (سێ تا دە) لەفزی (مأة)بێت، لەم کاتەدا بە موفرەدی و بە مەجروری دەهێنرێت، وەك: (ثلثمأةٍ) کە لەم نمونەیەدا موفرەدە، و مەجرورە.

وە تەمیزی ژمارەی (یانزە، تا، نەوەدو نۆ) مەنصوب و موفرەدە، وەك: (أحد عشر رجُلاً) لە موزەککەرداو (أحْدی عشرةَ أمرئةً) لە مؤنث دا. و (تسعةٌ و تِسْعونَ رجلاً) و (تِسْعٌ و تسعون إمرئةً). وە تەمییزی ژمارەکانی صەدو هەزار، وە هەروەها موسەنناکانی ئەم دوانە، و جەمعی هەزار، بە مەجروری وموفرەدی دێن، وەك:

(مأة رجُلٍ)، (مأتا رجُلٍ)، (ومأةُ إمرئةٍ) و (مأتا إمرئةٍ) و (ألفُ رجُلٍ) و (ألفا رجُلٍ) و (ألفُ إمرئةٍ) و (ثلاثُ آلاف رجُلٍ) و (ثلاثُ آلاف أمرئةٍ).

ئێستاش تۆو مانای مەتنەکەی سەرەوە:... وإذا أردتُ التنصيص على كميّة شئ فتقول رجل...

جەنابی مەلا موحسین،دانەر عەوامیلی مەلا موحسین، کە بەشێکی ئەم درێژە باسەم لێوە وەرگرتبوو، دەڵێت: هەرکات تۆ ویستت کە ژمارەو ئەندازەی شتێك دەربڕی، ئەوا دەڵێیت: (رجُلٌ و رجُلان) واتە: دوو ژمارە ی(یەك و دوو) کە بۆ موزەککەر، بە لەفزی موزەککەر و بۆ مؤنث بە لەفزی مؤنث دەیانهێنێت،

بۆیە لە موزەککەردا (واحد و إثنان) و لە مؤنث دا (واحدة و أثنتان) دەهێنرێت.

(واحد و أثنان) پێویستیان بە تەمییز نییە، بە دەستەواژەیەکی تر (واحدٌ رجلٌ) و (إثنان رجُلان) و (واحدة إمرئةٌ) و (إثنتان أمرئتان) ناوترێت.

بزانەکە: بۆی هەیە، (واحد و إثنان) ببنە صیفەت بۆ مەعدودەکەی خۆیان، وە لەم کاتەدا لەگەڵیدا هاوڕێك دەبێت، وەك: (رجُلٌ واحدٌ)، (رجُلان إثنان)، (إمرئةٌ واحدةٌ)، (إمرئتان إثنتانِ).

چونکە مەبەست لە هێنانی تەمییز، لابردن و سڕینەوەی نادیاری یە لە دوشت:

١-ڕونکردنەوەی ژمارەو ئەندازە.

٢-ڕوونکردنەوەی توخم (جنس)ی شتێك.

لە لەفزی (رجُل و اِمرئة)، (جنس)یش دەزانرێت، و هەروەها عەدەدیش دەزانرێت، هەروەك جەنابی مەلا موحسین،(هۆنەری ئەو شیعرانە) ئاماژەی بەو خاڵە کردووە، کە (رجل) و (رجُلان) بەبێ تەمییز دەهێنرێن، چونکە لەفزی (رجل) و (رجلان) بە تەنهایی دەلالەت لەسەر (واحد) و (إثنان) دەکەن، بەڵام ژمارەکانی تری غەیری (واحد) و (إثنان) پێویستیان بەهێنانی تەمییز هەیە.

ئەوکاتە جەنابی مەلا موحسین، دەڵێت: ثم تأتي بالعدد... کەواتە ژمارەکە دەهێنیت، و لە دوای هێنانی ژمارەکە ئەو شتە دەهێنیت، کە ئەو ژمارەیە تەمییز بکات، بەگوێرەی ئەو تەرتیبەی کە من بەهۆنراوە هێناومە:

ثماناً بعد ماجاوزت الأثنين بمجموع و مجرور فميّز.

ئەو هەشت ژمارەیەی کە لە دوای -دوو- دێن، کە بریتین لە: (ثلاثة، أربعة، خسمة، ستة، سبعة، ثمانية، تسعة، عشرة) تەمیزەکەیان بە صیغەی جەمع و بە مەجروری دێت، وەك: (ثلاثةُ رجالٍ)، (ثلاثُ نسْوةٍ).

عندما كان منها قد أضيفت إلى مأة بفردٍ فهو مييز

وە تەمیزی ژمارەکانی نێوان دوو، یانزە کاتێك کە بۆ لای سەد ئیضافەکران، موفرەدن، پێشتر دانەر وتبووی: ژمارەکانی (سێ تا دە) جەمع و مەجرورن، بەڵام کاتێك کە بۆ لای لەفزی (مأة) ئیضافە بکرێن، حوکمەکەیان جیاواز دەبێت، واتە: ئێستا کە بۆلای (مأة) ئیضافەکراون، مەجروربوونیان جێگیرو ثابتە، بەڵام بە شێوەی جەمع نایەن، بەڵکو بە شێوەی موفرەد بەکار دەهێنرێن: وەك: (ثلاث مأة رجُلٍ)، (أربعماْةً رجُلٍ) کە لەم دوو نمونەیەدا، لەفزی (رجُل) تەمیز، و بەشێوەی موفرەد و مەجرور بەکار هێنراوە.

وفيما بعد عشر فرْداً نصب إلى تسْع ومم تسعينَ المُميّزْ.

وە لەوانەی دا کە لەدوای ژمارەی (دە) و لەپێش ژمارەی (صەد)ـەوە، دێن، تەمیزەکەیان بە موفرەدی و بە مەنصوبی بهێنە، واتە: تەمیزی ژمارەی (یانزە) تا

(نەوەدو نۆ) مەنصوب و موفرەدە، وەك: (أحد عشر رجُلاً) لە موزەككەرداو (إحدى عشرةً إمرئةً) لە مؤنث دا.

ولّما جاز من تسع و تسعين فجُرّ عند ذا فرداً تميّز.

وە هەركات ژمارە لە (نەوەدو نۆ) تێپەڕی كرد، كەواتە: لەم كاتەدا تەمیز مەجرور بكە، لە كاتێكدا كە دەبێت، ئەو تەمیزە موفرەد بێت، واتە: تەمیزی ئەو ژمارانەی كە لە صەد زیاترن، موفرەد و مەجرور دەبن، وەك: (مأة رجُلٍ)، (مأتا رجُلٍ)، (مأة إمرئةٍ)، (مأتا مأة رجُلٍ)، (مأتا رجُلٍ)، (مأة إمرئةٍ)، (مأتا إمرئةٍ)، (ألف رجُلٍ)، (ألْف أمرئةٍ) و...

## ﴿چۆنیەتی هێنانی ژمارە لەگەڵ (تاء)دا، یان بێ (تاء)﴾

| | |
|---|---|
| في ثلاث وسبعة بـــــعده | ذكر أنت بعكس ماشـــتهرا |
| وفي الأثنين قبلها وكـــذا | بعدها ما هــو القياس جرى |
| كل تلك الثمان في التركيب | ماخلا العشر فيه ما استحلا |
| وادر في العشر عكس مامعه | في ســـوى كلها السواء ترى |

## چۆنیەتی هێنانی ژمارە لەگەڵ (تاء)دا، یان بێ (تاء) بە شیعر دامان ڕشتووە، تا بە جوانی لەبەر بكرێت:

في ثلاث وسبعة بعده ذكر أنت بعكس ماشتهرا

لە سێوە تا نۆ (٣، ٤، ٥، ٦، ٧، ٨، ٩) ئەگەر تەمیز موزەككەر بوو، با ژمارەكە(مؤنث) بێت، وە بە پێچەوانەشەوە، وەك: (ثلاثة رجلا، ثلاث نساء).

وفي الأثنين قبلها وكذا بعدها ما هو القياس جرى

واتە (١، ٢) پێش ئەم هەشتە بێن، وەك (أحد واثنان) بەبێ (ثلاثة ورابعة و خامسة إلى عشرة) باس دەكرێن، یان دوای ئەو هەشتە بێن، وەك (أحد عشر، اثنا عشر) لەسەر ئەو قاعیدە دەچن كە دەڵێ: ئەگەر تەمیز موزەككەر بوو،

(عدد)یش موزەککەرە، وەك لە موزەککەردا (أحد واثنان) و لە مؤنثدا (إحدى واثنان) دەوترێ.

كل تلك الثمان في التركيب ماخلا العشر فيه ما استطرا

ئەم هەشت ژمارە لەگەڵ (عشرة)دا، جگە لە خودی (١٠) پێچەوانەی یاسا مەشهورەکەن، کە باسکرا، بۆ نموونە ئەگەر (ثلاثة لەگەڵ دە)دا تەرکیب کرا، یاسا باس کراوەکەی نییە، کە لە (مؤنث)دا (ثلاث) بە بێ (تاء) و لە موزەککەردا (ثلاثة) بە (تاء)ـەوە دەخوێنرێتەوە، (استطرا) واتە: ئەمیش وەك ئەوانەی پێش وایە.

وادر في العشر عكس ما معه في سوى كلها السواء ترى

لە (١٠)دا پێچەوانەی مەشهورە، واتە ئەگەر تەمیز موزەککەر بوو، (عشر) موزەککەرە، ئەگەر تەمیز (مؤنث) بوو دەبێت (عشر) مؤنث بێت، هەر لە (١٠ تا ٩٠) بەم شێوازەیە، وەك: (عشرون، ثلاثون، تسعون) لەمانەدا یەکسانی دەبێت.

<u>خوێنەری بەڕێز:</u> لەم بەشی دووەمەی هۆنراوەکانی بەشی عەدەددا، ڕوونکردنەوەیەکی ترت ئاڕاستە دەکەم، تا چاکتر و جوانتر لە کرۆکی باسەکە بگەیت، إنشاءالله. جا بزانە ئەوەی کە ڕابوردو گوترا دەربارەی چۆنیەتی ئیعرابی تەمییز بوو، ئێستا <u>جەنابی مەلا موحسین</u> دەڵێت: بەڵام ئێستا باسەکە دەربارەی چۆنیەتی بە موزەککەرومؤنث، هێنانی تەمییزە، واتە: چ کاتێك دەبێت تەمییز بە موزەککەری و چ کاتێك دەبێت بە تەمییز بە مؤنثی بهێنرێت.

وە دەڵێت: لەبەر ئەوەی کە بتوانرێت، ئەم باسە لەبەر بکرێت، ئەوا ڕستەکانم بە شێوەی هۆنراوە هێناوە، بەم شێوەیە:

في ثلاثٍ وسبعةٍ بعده ذكّره أنثْ بعكس ما اشتهرا.

لە ژمارەی (سێ)، و حەوت ژمارەی دوای ئەو دا (أربعة، خسمة، ستة، سبعة، ثمانية، تسعة، عشرة) ژمارەکە دەبێت، بە پێچەوانەی تەمیزەوە بهێنرێت، واتە: ئەگەر تەمیز موزەککەربوو، دەبێت ژمارەکە مؤنث بێت، وە ئەگەر تەمیز مؤنث بوو، لەسەرەنجامدا ژمارەکە بە شێوەی موزەککەردەهێنرێت، وەك: (و سخّرها عليهم سبع ليالٍ و ثمانية أيام) کە وشەی (ليال) مؤنثە، وە عەدەدی موزەککەر ی (سبع) یان بۆ هێناوە، وە هەر بەم جۆرەش (أيام) موزەککەرە، کە لەبەر ئەمە، ژمارەی مؤنثی (ثمانية) یان بۆهێناوە.

پاشان بزانە: لەزمانی عەرەبیدا ئیسم بۆ موزەککەر ی(سبع) یان بۆ هێناون، وە هەر بەم جۆرەش (أیام) موزەککەرە، کە لەبەر ئەمە، ژمارەی مۆنثی (ثمانیة)یان بۆ هێناوە

*پاشان بزانە:* لە زمانی عەرەبیدا ئیسم بۆ موزەککەرو مۆنث دابەش کراوە، بۆ ئیسمی موزەککەر صیفەتی موزەککەرو مۆنث دابەشکراوە، وە بۆ ئیسمی موزەککەر صیفەتی موزەککەر بۆ ئیسمی مۆنث صیفەتی مۆنث دەهێنن، وە هەر بەم شێوازەیش ئەگەر فاعیلی فیعل، مۆنث بێت، ئەوا فیعلەکە لەگەڵیدا هاوڕێك و موتابیق دەکەن، بۆ نمونە دەگوترێت: (جاء علي العالم)و(جاءت سعیدة العالمة).

وە ضەمیرەکەیش دیسانەوە لە ڕووی موزەککەر بوون و مۆنث بوونەوە، لەگەڵ ئەو ئیسمەدا کە پەیوەستە پێیەوە، و ئەو ضەمیرەی بۆ سەر دەگوڕێتەوە، دەبێت هاوڕێك بن، بۆ نموونە: بۆ (علی) ضەمیری (هو) و بۆ (سعیدە) ضەمیری (هی) دەهێنرێت!

ئیسم و صیفەتی پیاوان و ئاژەڵانی نێر، موزەککەری حەقیقییە، وە ئیسم و صیفەتی ژنان و ئاژەڵانی مێینە مۆنثی حەقیقین.

*** ئیسمی مۆنث لە زمانی عەرەبیدا سێ نیشانەی هەیە:**

١- (تاء)، وەك: ( رحمة، نعمة).

٢- ئەلفی مەقصورەی زائیدە: وەك: (دعوی)،(ذکری).

٣- ئەلف و هەمزە: کە ئەلفی مەمدودەیشی پێ دەوترێت، کە هەرکات زیادە بوو، ئەوە نیشانەی (تأنیث)ـە، وەك، (بیداء) و (صحراء).

ئەو ئیسمە مۆنثانەی کە ناوو صیفەتی ژن یان ئاژەڵی مێینە نەبن، ئەوە بە مۆنثی مەجازی، ناو زەد کراون، ئەو ئیسمانەی کە مۆنثی مەجازین، بریتین لە:

١- ناوی شت (اسم الأشیاء) و ئەو وشانەی کەواتا هەڵدەگرن (المعانی) ئەمە، ئەگەر نیشانەی (تأنیث)یان پێوە بێت، وەك (حکمة)(عزة).

٢- ناوی ئەندامە جووتەکانی لاشە، وەك (ید، رِجل، أذن، عین).

٣- ناوی شارەکان : (مصر، بغداد)

٤- مۆنثە بیستراوەکان لە عەرەبەوە (سماعی) وەك: (شمس) ، (نفس) (حرب) (روح) (سماء) (أرض) (نار) (حال) (طریق) (دار).

لەو مؤنثەتەقديری يانەدا، تەنها لەفزی (تاء) ئامانج و مەبەستە، وەك: (أرض)، (دار) كە بە گوێرەی ياسای(تەصغير) دەبنە (أريضە) و(دويرة) چونكە گومانی تيادا نی يە، كە (التصغير يرد الأشياء الى أصلها).

وە مؤنثی تەقديری خاوەنی هەشت نيشانەيە، وە يان بەدەستەواژەيەكی تر، مؤنثی تەقديری دەتوانرێت، بە هەشت شێواز بناسرێت.

١- مؤنث بوونی ئەو ضەميرەی كە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شتە، بە مؤنثي ضە ميرەكەدا دەزانرێت، كە ئەو ووشەيە مؤنثە، وك: ( ونفس وما سواها )

٢- مؤنث بوونی ئەو ئيسمە ئيشارەيەی كە ئاماژە بۆ ئەو وشەيە دەكات وەك: ( هذه جهنم التي كنتم توعدون).

٣- مؤنث بوونی (حال)ـەكە، وەك: (هذه الكتف مشوية).

٤- مؤنث بوونی (نعت)ـەكەی، وەك: (النفس اللوامة).

٥- مؤنث بوونی خەبەرەكەی، وەك: (داري معمورة)

٦- مؤنث بوونی فيعلەكەی، وەك: (رميدت عينى)

٧- داكەوتنی (تاء)ـە، تەئنيسەكە لە ژمارەكە، وەك (ثلاث ليال).

٨- دەركەوتنی(تاء)ـە، تەئنيسەكە لە كاتی (تصغير : بچوك) كردنيدا و دەربڕينيدا، وەك (نويرة)كە بچوككراوەی (نار)ـە، كە مؤنثی سەماعی يە، وە (بزانە) كە ئەو وشانەی كە مؤنثی مەجازی بوون، و تائە تەئنيسەكەيان لە لەفزدا دەرنەكەوتووە، بەو مەرجەی كە (ثلاثي: سيانی)بن، وەك: (شمس) و (أرض) و (عين) لەكاتی بچوككردنەوەياندا (تاء)يان پێوە دەلكێت، بۆيە بۆ ئەو وشانەی سەرەوە لەكاتی تصغير كردنياندا (شمسية)، (أرضية) و( عينية) دەوترێت وە گەر(رباعی: چواری)يان (خماسی: پێنج پيتی) بوو، ياسا ئەوەيە كە(تاء)ـە، تەئنيسەكە، نەگەڕێتەوە بۆی، وە دەرنەبڕدرێ، وەك (عقرب) كە لە تەصغيركردنيدا (عقيرب) دەگوترێت، وە ناگوترێت (عقيربة)و (تاء)ـەكەی بۆ ناگێڕدرێتەوە.

وفي الأثنين قبلها وكذا بعدها وما هو القياس جرى.

لەو دوو ژمارەيەدا كە (يەك و دوو) كە لە پێش هەشت ژمارەكە (ثلاثة- أربعة- خمسة- ستة- سبعة، ثمانية، تسعة، عشرة) وە دێن، وە هەروەها ئەو ژمارەيەی كە لە دوای ئەم

هەشت ژمارەیەوە دێت، و هەروەها ئەو ژمارەیەی کە لە دوای ئەم هەشت ژمارەیەوە دێن، بە جۆرێك بەکار دەهێنرێن، کە هاورێکی قیاس و رێسای زمانی عەرەبی بێت، واتە: لەم کاتەدا تەمیزهاورێك و موتابیقە لەگەڵ ژمارەکەدا وەك: (واحد- اثنان)، (احد عشر رجلا)، ( اثنی عشر رجلا) ئەمە لە موزەککەر دا، (واحدة)،(أثنتان)، (أحدی عشرة امرئة) و (أثنتا عشرة أمرئة) لە مؤنث دا

كل تلك الثمان في التركيب ما خلا العشر فيه ما استطرا

هەر یەکە لەم هەشت ژمارەیە، (ثلاثة، أربعة، خسمة، ستة، سبعة ثمانية، تسعة، عشرة) ئەگەر هاتوو، لەگەڵ لەفزی (عشرة)دا خرانە پاڵ یەك، حوکمەکەیان بەو جۆرەیە کە رابوردا و ئێستا باسمان کرد.

واتە: تەمیز لە رِوی موزەککەرومؤنثەوە، بە پێچەوانەی ژمارەکەوەیە، بەلاّم ئەم یاسایە بۆ خودی (عشرة) نابێت، وەك ( ثلاثة عشر رجلا)، (أربعة عشر كتابا) (خمسة عشر كوكبا) ، (ستة عشر درسا) و.... لە تەواوی ئەو نمونانەدا تەمیزەکە لەگەڵ ژمارەی پێش (عشرة)دا لە رِووی موزەککەر و مؤنث، ـەوە، پێچەانەیە، بەلاّم تەمیزەکە لەگەڵ لەفزی (عشرة) دا هاو رێکەو موافیقن، وەك:(ثلاثة عشر رجلا) لەم نموونەیەدا (رجلا) تەمیزە، کە بە پێچەوانەی (ثلاثة)ـەوەیە، لە رووی موزەککەر و مؤنث، بوونەوە، بەلاّم (رجلا)، کە تەمیزە لەگەڵ خودی (مؤنث)بونەوە،بەلاّم (رجلا) کە تەمیزە لەگەڵ خودی (عشر) دا هاورێکە.

وأدرني العشر عكس ما معه في سوى كلها السواء ترى

*بزانە:* لە لە فزی (عشر)دا ، یاساکە پێچەوانەو جیاوازە، وەك (ثلاثة عشر رجلا)، (خمسة عشر أمرئة) کە لە نمونەی یەکەمدا (عشر) لەگەڵ (ثلاثة)دا لە رِوی (تذكير) و (تأنيث)ـەوە هاورێك نین ، وە هەروەها لە نمونەی دووەمیشدا (عشرة) لەگەڵ (خمس) دا، لە رِوی موزەککەرومؤنثەوە،پێچەوانەیە، بەلاّم لە عشرون و ثلاثون تسعون ومأة وألف دا موزەککەرو مؤنث یەکسانن، هەروەك جەنابی مەلا موحسین[1] ئاماژەی بەم مەسەلەیە کردووە،: في السواء كلها السواء تري... واتە: لە غەیری ئەوانەدا کە باسکران، ژمارەکانی تر لە رِووی موزەککەرو مؤنث بوونەوە هاورێکن.

---

١- عەوامیلی مەلا موحسین: مەتنێکی زانستی نەحوە، کە لە عەوامیلی جورجانی درێژترە، و بگرە بە سوودتریشە، بەلاّم کەمێك عیباراتی رِەقە، و قوتابی دوای جورجانی و بورکەوی بیخوێنێ باشە، ئەم مەلا موحسینە، بە مەلا موحسینی فەیضی کاشانی مەشهور بووە، و شیعە بووە، بەندەی ناتەوان شەرحێکم لە سەر ئەم عەوامیلی مەلا موحسینە نووسیوە، و لە ساڵی (٢٠٠٧) لە سلێمانی چاپم کردووە. ﴿عەبدوڵلا مەلا ئەحمەد، ٢٠١٣/٣/٢٤ - خورماڵ﴾.

## ﴿النواصب للفعل المضارع﴾

هي أربعة: أن للمصدرية، و الأِستقبال، كقوله ﷺ:(أمرت أن أسجد على سبعة أعظم)، و لن للنفي المؤكد في الأِستقبال، نحو: (لن يستريح المتكبر في حياته)، وكَيْ للتعليل، أَي: للدلالة على أن ما بعدها علة، لما قبلها ذهنا، وما قبلها علة لما بعدها في الواقع، نحو: (تعلمت العلوم، كي أستفيد منها). وأِذن وهي جواب لقول القائل، و جزاء لِفعل الفاعل، و شرط عملها، أن تكون مصدرة في الكلام، و متصلة بالفعل بعده، و تستعمل لِلْأِستقبال، كقولك: (أذن أعلمك، في جواب طالب، قال: جئتك راغباً في الأِستفادة ، من علومك).

---

## ﴿باسی ئەو ئامڕازانەی کە فیعلی موضاریع مەنصوب دەکەن﴾

ئەوانەی کە فیعلی موضاریع مەنصوب دەکەن، چوار دانەن: (أن)ی مەصدەریە یان ئیستیقبال، وەك ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری ئازیزﷺ کەدەفەرمویّت: (أمرت أن أسجد على سبعة أعظم) کە (اسجد) بە هۆی (أن)ەوە، مەنصوب بووە، وە (لن) بۆ نەفی کردنی ئەو شتە تەئکیدکراوەیە کە لەداهاتوودا بکرێت، وەك (لن يستريح المتكبر فى حياته)، وە (کی) بۆ (تَعْلِيلْ: هۆکار)ە، واتە: بۆ دەلالەت کردن لەسەر ئەوەی کە دوای (کَیْ) هۆیەکە، بۆ پێش (کَیْ) لە هزروزیهندا، وە پێش (کَیْ) هۆیەکە بۆ دوای (کَیْ) لەواقیعدا، وەك (تعلمت العلوم كَيْ أستفيد منها).

(أذن) وەلامە بۆ قسەی قسەکەر و جەزایە، بۆ فیعلی (فاعِل:کارکەر)، وە مەرجی عەمەل کردنی ئەوەیە، کەلەسەرەتای کەلامەوە بێت، وەلکابێت بە فیعلەکەی دوایەوە، وە لە (أستقبال: ئاینده)دا، کار دەکات، وەك قسەی تۆ کەدەڵێیت: (أذن أعلمك) ئەمە لە وەلامی قوتابییەکدایە کە دەڵێت: (جئتك راغباً في الأستفادة من علومك).

## ﴿الباب الثالث: في المجرورات، و المجزومات﴾

## ﴿حروف الجرّ﴾

أما المجرورات فقسمان: مجرور بالحروف، ومجرور بالأضافة، فالحروف الجارة عشرون، الباء للألصاق، نحو: مررتُ بعاصمة العراق، وللقسم، نحو: بالله أنّ الخلق الحسن، خيرٌ من المال والجاه، والتاء للقسم، نحو: تالله أن الأتفاق أكبر وسيلة للترقي، و الواو للقسم، نحو: والله أن العدو العاقل، أنفع من الصديق الجاهل، ومن لأبتداء الغاية في الزمان نحو: صمت من الفجر إلى غروب الشمس، أو في المكان نحو: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنْ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى﴾الاسراء: ١.

---

## ﴿باسی سێیەم: باسی مەجرورات، و مەجزومات﴾

### ﴿حەرفە جەڕەکان﴾

حەرفە جەڕەکان دووبەشن: مەجرور بە حەرف و مەجرور بەهۆی ئیضافەوە، وحەرفە جەڕەکان بیست دانەن، (باء): کە بۆ (ألصاق: پێوەکان)ە، وەك:(مررت بعاصمة العراق) وە بۆ سوێندیش دەبێت، وەك (بالله أن الخلق الحسن، خير من المال و الجاه)، وە (تاء) بۆ سوێندە، وەك (تالله أن الأتفاق أكبر وسيلة للترقى)، وە (واو)یش بۆ سوێندە، وەك (والله أن العدو العاقل أنفع من الصديق جاهل) وە (من) بۆسەرەتای مەبەستە لەکات وزەمەن دا، وەك (صمت من الفجر ألى غروب الشمس) یان بۆ بۆسەرەتای مەبەستە لە جێگا ومەکان دا، وەك ئەم فەرمایشتەی پەروەردگاری جیهانیان کە دەفەرموێت:﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنْ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى﴾الاسراء: ١.

و إلى لأنتهائها كما رأيت في المثالين، و في للظرفية، نحو: زيد في الغرفة، والسلامة في الوحدة، وعلى للأستعلاء، نحو: المتبرجة على البروج عازمة على الخروج، وحتى لأنتهاء الغاية، نحو: أكلت السمكة حتى رأسها، و اللام للملك، نحو: ﴿ولله المشرق والمغرب﴾البقرة:١١٥، والكاف للتشبيه، نحو: (القانع كالأمير)، و مذ، و منذ، لأبتداء الغاية، في الزمان الماضي، نحو: (ماسكن قلبي منذ فراق حبيبي)، وللظرفية في الزمان الحاضر، نحو: ما نمت مذ يومنا.

---

وە (ألى) بۆكۆتایی مەبەستە، وەك لەو دوو نمونەیەی پێشوودا بینیت، وە (فی) بۆ ظەرفیەتە (قەرار گرتنی شتێك لەناو شتێكی تردا) وەك: (زید فی الغرفة)و (السلامة في الوحدة) وە (على) بۆ بەرزێتی دەبێت، وەك (المتبرجة على البروج عازمة على الخروج) وە (حتى) بۆ كۆتایی مەبەستە، وەك (أكلت السمكة حتى رأسها) وە (لام) بۆ موڵكداری كردنە، وەك ئەم فەرمایشتەی پەروەردگاری جیهانیان كە دەفەرموێت: ﴿ولله المشرق والمغرب﴾البقره: ١١٥. وە (كاف) بۆ شوبهاندنە، وەك (القانع كالامير) وە (مذ، منذ) بۆ سەرەتای مەبەستن، لەسەردەمی ڕابردودا، وەك (ماسكن قلبي منذ فراق حبيبي)وە بۆ ظەرفیەتیش دەبن، بۆ كاتی ئێستا، وەك (مانمت مذ يومنا).

و رُبَّ للتقليل نحو: رُبَّ عبد يشكرالله، وحاشا، وعدا، و خلا، للأِستثناء، نحو: أحب كلّ مسلم حاشا الخائن، وعدا الكاذب، و خلا الطماع، وكي للتعليل، و تدخل على (أن)، أو(ما) المصدريتين، نحو: تصدقت بكسبي، كي أن يعفوني ربي، وخدمت الأستاذ الفهام كي ما يعلمني فقه الأسلام، وقد تدخل على ما الأِستفهامية، نحو: كيمه عصيت الخبير؟ و أنت عبد فقير، و (لولا)، لأِمتناع جوابه، لوجود مدخوله، نحو: لولاك لهلكت، و لَعَلَّ، في لغة عُقَيْلْ، نحو: لعل أبي المغوار منك قريب.

---

وه (ربّ) بۆ کەمێتی یە، وەك (رب عبد يشكر الله) وه (حاشا، عدا، خلا) بۆ ئیستیسنایە، وەك (أحب كلّ مسلم حاشا الخائن وعدا الكاذب و خلا الطماع)، وه (كی) بۆ عیللەت دار کردنە، و دەچێتە سەر (أن، ما) ی مەصدەریە، وەك (تصدقت بكسبی كی أن يعفونی ربی وخدمت الأستاذ الفهام كي ما يعلمني فقه الأسلام) وه هەندێ جار دەچێتە سەر (ما)ی ئیستیفهامیە، وەك (كيمه عصيت الخبير؟ وأنت عبد فقير) وه (لولا) بۆ بەرگری کردنە لەوەلاّمێك، بەهۆی بوونی شتێکەوە، وەك (لولاك لهلكت) وه (لعل) حەرفی جەڕە لەلوغەتی (عُقَيْلْ)دا، وەك (لعل أبی المغوار منك قريب) وه ئەم حەرفە جەڕانە حەڤدەیان، لەلایەن مەلاموحسینی فەیضی کاشانی یەوە، لە شیعرێکدا کۆکراونەتەوە:

باوتاوكاف و لام و، واو و منذ و مذ خلا
ربّ حاشا من عدا في عن على حتى ألى

و لا بُدّ لهذه الحروف، من متعلق سواء، كان فعلاً، أو شبه فعلٍ، أو معنى فعلٍ، إلاّ الحروف الزائدة منها، وحروف الإستثناء، و رُبّ، ولولا، و لَعَلّ، فمجرور حروف الإستثناء، كالمستثنى بإلاّ، و مجرور رُبّ، و لَوْلا، و لَعَلَّ مبتدأ، و مابعدها خبر، و مجرور الحرف الزائد حاله كما لو لـم يكن الحرف موجوداً في الكلام.

---

ئەم حەرفە جەڕانە دەبێت، تەعەللوق ببەستن، ئیتر بە فیعلەوە، یان بە (شبهـ فعل)ەوە،بێت، یان بە (معنى فعل)ەوە، بێت، تەنها زائیدەكانیان نەبێت، كە تەعەللوق نابەستن، لەگەڵ حەرفەكانی (الاستثناء، وربّ، ولولا ، ولعلّ).وە مەجروربوونی حەرفەكانی (أستثناء)، وەك (مستثنی بألاّ)وان،و مەجروری (ربّ، لولا، لعلّ) دەبنە موبتەداو دواكەیان دەبێتە خەبەر، وە مەجروری حەرفە زائیدەكان، هەروەك خۆیان دەبن، چونكە ئەگەر حەرفە زائیدەكەیش لەوكاتەدا نەبووایە هەروادەبوو.

## ﴿پوختە باسێك دەربارەی حەرفە جەڕەكان﴾

حەرفە جەڕەكان لە عەوامیلە سەماعییەكانن، ئەو حەرفانەن كە تەنها ئیسمێك مەجرور دەكەن و ناچنە سەر فیعل و حەرف و لەسەر قەولی مەشهور حەڤدە دانەن: بەم شێوازە:

باو تاو كاف و لام و واو و منذ، مذ، خلا

رب حاشا، من عدا، في عن على، حتى إلى

بزانە هەندێ لە (زانایانی نەحو: نُحاة) كە یەكێكیان (ابن هشام)ـە، حەرفەكانی جەڕ بە بیست دانە دادەنێن!

### ﴿ماناكانی "بـــاء"﴾

(الباء): بۆ (استعانة:پشت پێ بەستن) بەكاردەهێنرێت، وەك (بسم الله الرحمن الرحیم)

(باء): حرف جر، للإستعانە.

(اسم): اسم مجرور، متعلق بعامل مقدر، وهو (إبتدأ)، وهو مضاف.

(إليه): مضاف إليه.(الرحمن): نعت. (الرحيم): نعت.

* وه بۆ "مصاحبه"ەش، ئەم نموونەیە هەیە:

(سبحان): مەصدەرە، یاخود ئیسمی مەصدەرە، ومەصدەرەکەی (تسبح)ە، جا (سبحان) مەفعولی موطله قه بۆ (أسبح)ی موقەددەرە، وە هۆی مەنصوب بونی (سبحان) مەصدەرە، وهو مضاف.

(ربی): (رب): مضافه بۆ لای (یاء) کە، (متکلم مع الغیر)ە، وە هۆی مەفتوحی (یاء)ەکە، لەبەر خەفیفی یە، چونکە "یاء متکلم"مەسکون بوو، وە (لام)ی (العظیم): هەم ساکنە، لەسەر یاسای (إذا التقی الساکنان حرك بالکسر).

(یاء): کەسرەی پێ درا، بەڵام لەبەرئەوەی کەسرە، بۆ سەر (یاء)، (ثقیل) گرانە، بۆیە فەتحە بە سوکترینی حەرەکات دانرا، بۆیە کەسرەکە کرا بە فەتحە، (العظیم): صیفەتە بۆ (رب)، (بحمده): (باء): بۆ موصاحەبەیە، (حمد) مەجرورە، بە هۆی (باء)ەوە، وهو مضاف،(هاء): مضاف إلیه.

## ﴿هەندێك لە ماناكانی "من"﴾

بزانە کە "من" بۆ سێ جۆر دابەش دەکرێت، کە بۆ سەرەتای مەبەستە.

١-مەکانی: وەك سرت من البصرة إلی الکوفة.کە ئیبتیدای غایە "بصرة"یە.

(سر): فیعلی ماضییە، کە لە ئەصڵدا (سار، سیر)یە.

(ت): فاعیلە. (من) حەرفی جەرە. (البصره): ئیسمی مەجرورەو موتەعەللیقە بە "سرت"ولە مەحەلدا مەنصوبە، وە مەفعولی بە واسطە یە بۆ "سرت".

مەبەست لێرەدا "من" کە بۆ "ابتدای غایة"یەی مەکانی بەکارهێنراوە.

٢-زەمانی: وەك (صمت من یوم الجمعة).

(صمت): فیعل وفاعیلە. لە (صام، یصوم)ەوە هاتووە.

(من يوم): جارو مەجرورەو،لـه مەحەلـدا مەنصوبە، وە مەفعولی به واسطه یه بۆ (صمت)، وهو مضاف. (الجمعة): مضاف إليه.

مەبەست لێرەدا "من"ە کە بۆ "ابتدای غایە"ی زەمانی بەکارهێنراوە.

٣-پەیوەست نەبێت نە بە زەمان و نە بەمەکان، وەك: (قرأت من ئایە کۆا).

(قرأت): فيعل وفاعيلە. لـە (قرأ، يقرأ) هاتووە، (من آية): جارو مەجرورەو موتەعەلـليقە بە (قرآن).

(كذا): لە ئەسمائی (كنايە)یە،و لـە مەحەلـلی نەصبدا مەفعول بە،یە، بۆ "قرآن".

وە "من" بۆ "تبيين"یش، واتە ڕوون کردنەوە بەکاردێت، وەك: ﴿فاجتنبوا الرجس من الأوثان﴾ وە هەروەها(عندي عشرون من الدراهم) نموونەی دووەمی (تبيين)ە، کە (عندی) ظه رفە و (ياء): موتەکەلـليم وَحْدَهُ، موتەعەلـليقە بە (استقر) و خەبەرەو پێشکەوتوە. (عشرون): موبتەدايەودواکەوتوە.

(من الدراهم): جار ومەجرورە،و موتەعەلـليقە بە عاملێکی موقەددەرە، ولـەمەحەلـدا مەنصوبە.

مەبەست لێرەدا (من)ە، کە بۆ (تبيين) هاتووە.

وە (من) بۆ (تبعيض)یش، واتە هەندێکی بەکاردێت، وەك:(أخذت من الدراهم).

(أخذت): فيعل وفاعيلە. (من الدراهم): جارومەجرورە.و موتەعەلليقە بە (أخۆت).

وە بۆ (بدل)یش بەکاردێت، وەك ﴿ولو نشاء لجعلنا منكم ملائكة﴾.

(واو): حەرفی ئیستیئنافە، یان( اعتراض)ـە. (نشاء): فيعلی موضاریعە. و فاعيلـە (نحن). (لام): ابتداء لـلتأكيد. (جعلنا): فيعلی ماضی يە. (نا): فاعيلـە. (ملائكە): مەفعول بە. (منكم): جار ومەجرورە.

مەبەست لێرەدا (من)ـە، کە بۆ (بدل) بەکارهاتووە.

﴿"فرزدق"، و ستایش وپێدا هەڵدانی

"زین العابدین: علی بن الحسین بن علی بن أبی طالب"﴾

(من) بۆ (علة)یش بەکاردێت وەك: ئەم شیعرە:

يُغْضِي حَيَاءً وَيُغْضِي مِنْ مَهَابَتِهِ فَلَا يُكَلَّمُ إِلَّا حِينَ يَبْتَسِمُ

ئەم دێڕە شیعرە بەیتێکە،لە قەصیدەیەکی"همام بن غالب بن صعصعة التیمی"یە،کە ناسراوە بە"فرزدق"،کە لەو قەصیدەیەدا ستایش وپێدا هەڵدانی" زین العابدین: علی بن الحسین بن علی بن أبی طالب"دەکات، ئەمەش لەکاتێکدا بووە،کە لە سەردەمی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك دا، تەشریفی هێناوەتە، شاری مەککەی پیرۆز، جا خەڵکی لەدەوری کۆبونەتەوە، کە پرسیاریان کردبوو، لە هیشام دەربارەی، هیشام گوتبوی:نایناسم، بۆئەوەی خەڵکی لەدەوری کۆنەبنەوە. ئیتر فەرەزدەق ئەم قەصیدەیەی لەگەورەیی ئەو زاتەدا هەڵدابوو.

ئەمەش هەر لەسەرەتاکەیەوە هەندێکە لەو قەصیدەیە:

هَذا عَلِيٌّ رَسُولُ اللهِ والِدُهُ أَمْسَتْ بِنُورِ هُداهُ،تَهْتَدِي الأُمَمُ

هَذَا بْنُ خَيْرِعِبادِاللهِ كُلِّهِمْ هَذا التَّقِيُّ النَّقِيُّ الطَّاهِرُالْعَلَمُ

أِذا رَأَتْهُ قُرَيْشٌ قالَ قَائِلُها أِلَى مَكارِمِ هَذا يَنْتَهِى الْكَرَمُ

يُنْمى أِلى ذِرْوَةِ الْعِزِّ الَّتي قَصُرَتْ عَنْ نَيْلِها عَرَبُ الْأسلامِ وَ الْعَجَمُ

يَكادُ يُمْسِكُهُ عِرْفانُ راحَتِهِ رُكْنُ الْحَطيمِ أِذا ماجاءَ يَسْتَلِمُ

فِي كَفِّهِ خَيْزَرَانٌ رِيحُهُ عَبِقٌ مِنْ كَفٍّ أَرْوَعِ فِيعِرْنِينِه شَمَمٌ

يُغْضِي حَيَاءً وَيُغْضِي مِنْ مَهابَتِهِ فَلا يُكَلَّمُ إِلّا حِينَ يَبْتَسِمُ

مَنْ جَدِّهِ دانَ فَضْلُ الْأنْبِياءِ لَهُ وَفَضْلُ أُمَّتِهِ دانَتْ لَهُ الْأُمَمُ

يَنْشَقُّ نورُالْهُدى عَنْ نورِ غُرَّتِهِ كَالشَّمْسِ يَنْجابُ عَنْ إشْراقِهاالْغَنَمُ.

ئیعراب:

(يغضي): فیعلی موضاریعه،و فاعیلەكەی(هو)یه، (حياء) مەفعول لە. (واو): حەرفی عه طفه، (يغضي): وەك پێشوو وایه. (من مهابته): جار ومەجروره.

وە گوتراویشە:

(يغضي):خەبەرە، بۆ موبتەدایەكی مەحزوف، واته:(هو يغضي)، و موضاریعی "أغضى"یه و:(حياء)، لەبەر "تعليل"بوون، مەنصوب كراوە.

مەبەست لێرەدا (من)ــه، كە بۆ سەبەب (علة) بەكارهاتووە.

"من مهابته" واته:"لأجل مهابته"، ئەصڵەكەی بەم جۆرەیە:

"يغضي زين العابدين عينيه، حياء ويغضي عيون الناس من مهابته فلا يكلم كلام إلا حين يبتـــسم"یە.

واتاكەی: ئەو پیاوە ئەوەندە بەشەرمە كە خەڵك جورئەت ناكات بیدوێنێت، تەنها لە كاتێكدا نەبێت كە زەردەخەنە بیگرێت. كە (علة) لێرەدا شەرم و شان و شەوكەتەكەیە.

"يغضي": فیعلی موضاریعە.

"زين":فاعیلە.

وهو مضاف.

"العابدين": موضاف أليه يه.

"عينيه": مەفعول بە، وهو مضاف.

"هاء": موضاف أليه يه، كە لەئەصڵدا،"عينين"بووە، وە بە هۆی ئیضافە كردنی بۆلای ضەمیر، ئیتر نوونەكەی لابراوە.

" حياء": مەفعول بە، يە،ومەنصوبە.

" واو":عاطيفە يە.

"يغضي": فیعلی موضاریعی بینا مەجهولە.

**ومنه فعل التعجّب، أعني ما أفعل، و أَفعل به، فالأوّل على ماضي باب الأفعال، و الثاني على أمره، و يأتي بعد الأوّل صاحب الوصف المتعجب منه منصوباً على المفعولّية، و بعد الثاني صاحبه مجروراً بالباء، قال الشاعر:**

**ما أحسنَ الدين والدنيا، إِذا اجتمعا    و أقبح الكفر، و الإِفلاس بالرّجل**

**وقال:**

**أَحْسِنْ بِعِلْمٍ مع الطاعات والأدب    و حسن خلق، و صرف المال في حَسَبْ**

---

- <u>باسی فیعلەکانی تەعەجوب:</u>

لەناو فیعلدا بەگشتی، فیعلی تەعەجوبیش هەن، کە ڵیغەکانیان بریتیە لە (ما افعل)، (افعل بە)، کە یەکەمیان لە سەر صیـغـەی فیعلی ماضي بابی (افعال) هاتووە، و دووەمیان لە سەر وەزنی ئەمرەکەی هاتووە، لە دوای (ماافعل) خاوەنی وەصف و خەسڵەتەکە، کە سەرسوڕمانی لە سەر دەربڕدراوە، بە مەنلوی دێت، لەسەر صا بی ئەوەی کە مەفعولە، بەڵام لە دوای (افعل بە) خاوەنی وەڵفەکە بە مەجروری دێت، بەهۆی بائی حەرفە جەڕەوە،

نموونە بۆکەمیان:

**ما أحسن الدين والدنيا إذا اجتمعا    وأقبح الكفر، و والافلاس بالرجل**

واتە: ئای چەند جوانە، سامانی دنیایی و دینواری لە کەسێکدا خودا کۆیان بکاتەوە، وە ئای چەندە ناشیرینە، کە نەبونی، وکوفر دیسان لە کەسێکدا کۆ ببنەوە.

نموونە بۆ دووەمیان:

**أحسن بعلم مع الطاعات والأدب    و حسن خلق وصرف المال في حسب**

واتە: زانست و خواپەرستی و خۆش ڕەفتاری بکە بەخەسڵەتی خۆت، لە گەڵ بە ئەخلاقی و ماڵ سەرف کردن لەجێی خۆیدا.

* فیعلی تەعەجوب: ئەو فیعلەیە کە لەسەر سورِمان و شتی ناعادەتی دا بەکار دەهێنرێت، و دوو صیغەی هەیە، (ما أفعل) و (أُفعل به)، وەك: (ما أجمل السّماءَ! ئاسمان چەندەجوانە!)، (أکرم عليّ: عەلی چەندە گەورەو رێزدارە!).

لە فیعلەکانی تەعەجوب ،دا هەمیشە فاعیل وەك ضە میری موستەتیر خۆی دەنوێنیت، وە مەفعولەکەیشی بەبێ (فاصیلە) و لەدوای فیعلەکە راستەوخۆ دەهێنرێت.

وە ئەگەر بمانەوێت، سەبارەت بەکارێك کە لەکاتی رابردوودا رووی داوە،سەرسورِمانی خۆمان دەربرِین، ئەوا لە نێوان (ما)ی تەعەجوب و فیعلی تەعەجوب دا (كان) بەکار دەهێنین، وەك: (ما كان أصعب ذاك الأمر!: ئەوکارە چەندە سەخت و ناخۆش بوو!)

(أی): وەك (ما) وایە، بۆ ئیستیفهامیە، مەوصوفە، صیفەت، مەوصولە دێت، بەس نابێتە (تامة).

(من): وەك (أی) وایە، دەبێتە ئیستیفهامیە، مەوصوفە، مەوصولە بەس نابێتە (صفة).

(من، ما) لەهەندێ کاتدا مانای خۆیان بە یەکتری دەبەخشن، بۆ نموونە:

(ما) بۆ عاقلّە، (من) بۆ عاقلّە دیسانەوە، کەچی کە

(ما) بۆ عاقلّە، وەك: (والسماء وما بنيناها) سوێند بە ئاسمان و دروست کەرەکەی کە خوایە (عاقلّ ترینە لەهەموو شتێ).

* * *

**ومنه أفعال المدح والذم: نحو: نعم الأستاذ صاحب العلم، و الحلم، و بئس القرين طالب البغي، و الظلم.**

- فـيـعـلـەكانی مەدح، و زەم:

جۆرێکیتر لەفیعل، بریتی‌یە، لە فیعلی مەدح: واتە پێدا هەڵدان و ستایش کردن، وەک: (نعم الاستاذ صاحب العلم والحکم: باشترین مامۆستا ئەوهیە کە خاوەنی زانست و میهرەبانی بێت)، دووەمیان (بئس)یە، کە بۆ سەرزەنشت کردن بەکار دێت، وەک: (بئس القمرین طالب البقی واظلم: خراپترین هاوڕێ و هاودەم کەسێکە کە حەزی لە زیادە ڕەوی وستەمکاری بێت).

## ﴿ باسی (أفعال المدح والذم) ﴾

**چەند فیعلێکن بە (أفعال المدح والذم) ناو دەبرێن، وە لە دوایانەوە دوو ئیسمی مەرفوع دێن، یەکێك لە دوو ئیسمەکە دەبێتە فاعیل بۆ ئەم فیعلانەو دووەمیان دەبێتە (مخصوص، تایبەت) بە "مدح "یان "ذم"ەکە، وە ئەم فیعلانە چوارن: (نعم، حبذا) بۆ ستایش کردن.**

***فیعل دوو بەشە:***

**١-یان لەڕوداني کارێك لەزەماني داهاتوودا یان ڕابردوو داهەوالْ دەدات، وەك: (یضربُ – ضرب) وە لەم بەشەدا بە دیهاتنیماناکە، تەنها بە لەفزی فیعلەکە نایەتە دی.**

**٢-وە یان بەدیهاتنی و دروست بونی ماناکە دێتە دی، وە بەبێ لەفزی فیعلەکەیش، مەعناکەینایەتە دی و حاصلْ نابێت، وەك: (بعتُ و أنکحتُ) وە یان. (نعم الرجل زیدٌ)**

به گۆڕینی لەفزە کە مەدحە کە دێتە دی، جا لە واقیعدا دەتوانرێت بوترێت، لەفزەکە بەدیهێنەری ماناکەیە.

و (بئس، ساء) بۆ سەرزەنشت کردن بەکاردێن.

***تێڕوانینی زانایانی نەحو، دەربارەی فیعل بونی (نعم و بئس) جیاوازە:**

هەندێك ڕایان وایە کە (نِعْمَ و بِئْسَ) فیعلی موتەصەڕیفن، چونکە (تاء)، ساکنە کە لەتایبەتمەندی یەکانی فیعلە بە (نعم و بئس)ەوە دەلکێت، وەك: (نعمتِ المرْئةُ زینبٌ)، (وبئست المرئةُ هندٌ)، وە بەڵگەی دووەم لەسەر فیعل بوونی(نعم و بئس) ئەوەیە کە ضە میری ڕەفعی دیار :(بارز) ،(ئەلف و واو) ەکە بە فیعلەوە دەلکێت، بەم دوو فیعلەیشەوە دیسانەوە دەلکێن، وەك: (الزّیدان نعما رجلین – والزّیدون نعموُ رجالاً)، بەڵام کوفیەکان ڕایان وایە کە ئەم (نعم و بئس)ەیە، ئیسمن، بەبەڵگەی ئەوەی کە حەرفی جەرِ دەچێتە سەریان، کە ئەمەش هەر لەتایبەتمەندی یەکانی ئیسمە، وەك: (ألستُ بنعمَ الجارٌ).

بەڵام (أبن عصفور) گوتویەتی: هیچ یەکێك لە زانایانی نەحو لە فیعل بوونی (نعم و بئس) دا جیاوازیان نی یە، بەڵکو جیاوازی یەکەی زانایان لە ڕووی صەرفەوەیە، کە (نعم و بئس)ە، دوای ئەوەی کە نیسبەت درانە لای فاعل، ئایا لەم کاتەدا ئیسمن یان فیعلن؟

بەصریەکان دەڵێن: هەردوو جوملەی (نعم الرّجل زیدٌ و بئس الرجل عمرٌ) فیعلن، وە (کسائی) دەڵێت:- (دوو جوملەی ئیسمین، بەو مانایەی کە (نعم الرّجل) و (بئس الرجل) هەرچەند لە ئەصڵدا دوو جوملەی فیعلیی بوون، بەڵام لە دواییدا لە فیعل بوون لا دراون، و بۆیە دەتوانرێ بگوترێ کە جوملەی یەکەم ئیسمە بۆ مەدح کردووەکە ،جوملەی دووەم ئیسمە بۆ زەم کراوەکە، هەروەك (تأبط شرّاً) لە ئەصڵدا جوملەی فیعلی بووە، و لەدواییدا بوەتە ئیسمیی.

**بزانە فاعیلی ئەم فیعلانە لە چوار شت بەدەر نین، لێرەدا:**

**١-یان فاعل (معرف باللام) واتە (الف ولام)ی پێوەیە، واتە (علم) نی یە، بەڵکو (اسم جنس)ە، کە بەهۆی (الـ)ەوە بووەتە مەعریفە، وەك:**

(نعم الرجل زيد) **(الرجل)**: فاعل. لـ (نعم) و (زيد) مخصوص بمدح.

**٢-یان فاعیل موضافە بۆ لای ئیسمێکی( معرف "بە" ألف و لام)، وەك:**

**(نعم غلام الرجل زيد) کە (غلام) نەکیرەیە،و ئیضافە کرا بۆ لای (الرجل) و فاعیلە بۆ (نعم)ە.**

**٣-یان فاعیل** ضە **میرێکی نادیار** (مبهم)ە، **وە تەنها بە هۆی ئیسمێکی نەکیرەوە مەنصوبی تەمییزەکەی کراوە، وە ئیشی تەمیز ئەوەیە کە** ضە **میرە موبهەمەکە ڕۆشن دەکاتەوە، وەك:** (نعم رجلا زيد) **کە لە** (نعم)**دا** (هو) ضە **میرێکی** (مبهم، **نادیار**)ە، **وە** (رجلا): **تەمیزەو نەکیرەیەو مەنصوبە کە ئەم** (رجلا) **ئەو** ضە **میرەی ڕۆشن کردەوە.**

**٤-یان فاعیل** ضە **میرێکە بە هۆی** (ما)**وە دەربڕاوە، وەك** (فنعما هي) **کە لە ئەصڵدا** (نعم) **بووە** (ما) **ئیسمە.**

**وە بزانە مەخصوص بە مەدح یان زەم دەبێتە دوو شت:**

**١-**(زيد) **:موبتەدایە، و** (نعم الرجل) **خەبەری موقەددەمە.**

**٢-یان** (زيد) **خەبەرە، بۆ موبتەدایەکی مەحزوف، وە ئەگەر ئەمە تایبەت بوو بە** (مؤنث): (هي) **تەقدیر بکرێت، وەك** (نعمت المرأه هند، **أی هی هند**) **و**(هو) **تەقدیر بکرێت، وەك:** (نعم الرجل زيد، أي هو زيد).

﴿ ضه میری موبهەم ﴾

لە شوێنێکدا کە ضە میری موبهەم فاعیلی (نعم) بوو، ئەم ئیبهامە ئیعرابی دووەمی بۆ دروستە، نەك ئیعرابی یەکەم، واتە ئەو شوێنەی کە (مەخصوص بە مەدح خەبەر بێت. بۆ موبتەدایەکی مەحزوف، دەتوانرێ ضە میرە موبهەمەکە، فاعیل بێت، بۆ ئەو فیعلانە، چونکە مەخصوص بە مەدح و موبتەدا مەحزوفەکەی ڕستەیەکی سەربەخۆن، وە "نعم"ە و فاعیلەکەی ڕستەیەکی سەربەخۆن، لەو کاتەدا دروستە ضە میر لە (نعم)دا، موبهەم بێت، بەڵام ئەگەر : "(نعم الرجل) :خبر مقدم و (زيد) :مبتدأ مؤخر" بێت، ئەوا ضە میر لە (نعم)دا، موبهەم نابێت، چونکە لەم کاتەدا، ضە میر بۆ موبتەدا دەگەڕێتەوە، بۆیە ڕستەی موبتەدا و خەبەر پێویستیان بە (عائد – گێڕەرەوە)یەك هەیە، کە (هو)یە، کە لەژێر (نعم)ەدایە، جا لەم کاتەدا موبهەم بوونی ضە میر دروست نییەو بێ مانایە، و (ساء و بئس) وەك ئەو دوانەکەی تر وان، وە ئەو قاعیدانەیان بەسەردا جێگیر دەبێت،

پێویستە بزانرێت کە (تاء) لە هەندێ جێگادا لە (أخبار: هەواڵ) دا دیسان، بەکاردێت، وەك: (سائني هذا الأمر: ئەم کارە منی ناڕەحەت کردووە)، و هەندێ جار مەخصوص بە مەدح یان زەم حەزف دەبێت، بە هۆی بوونی نیشانەیەك، وەك (نعم العبد) واتە :(أيوب) کە مەخصوص بە مەدحە، و(حبذا) وەك (حبذا الرجل زيد) کە:

(حب): فعلی ماضی یە (ذا) :فاعیلە. (الرجل): صیفەتە بۆ (ذا) کە فاعیلە، وهەندێ جار صیفەت حەزف دەبێت، وە پێش مەخصوص بە

مەدحەکە، (تمیز یان حال) دێت یان دوای مەخصوص بە مەدح (تمیز یان حال) دێن، کە هاوڕێکن لەگەڵ مەخصوص بە مەدحەکەدا، لە (مفرد و مذکر، یان مؤنث، وجمع مؤنث)ىدا، وەك ئەم نموونانە:

١–حبذا رجلا زيد: (رجلا) تەمیزەو پێش مەخصوص کە (زيد)ە کەوتووە.

٢–حبذا راکبا زيد. (راکبا) حاڵە و پێش (زيد) کەوت.

٣-حبذا زید رجلا.( رجلا )تەمیزە و دوا کەوت.

٤-حبذا زید راکبا. (راکبا) حاڵە و دوا کەوت.

٥-حبذا رجلین الزیدان. (رجلین) تەمیزە و پێش کەوت.

٦-حبذا راکبین الزیدان. ٧-حبذا الزیدان رجلین.

٨-حبذا الزیدان راکبین.

کە لە (٥، ٦، ٧، ٨)دا ،تەمیزو حاڵ هاورێکن لەگەڵ مەخصوص بە مەدحدا.

وە دەتوانیت نموونەی تر هەر بەم شێوازە پێ بکەیت: وەك:

١-حبذا امرأة هند: هاورێکی لە ڕووی "تأنیث" ەوە.

٢-حبذا راکبا هند. ٣-حبذا هند امرأة. ٤-حبدا هند راکبا. ٥-حبذا امرأتین الهندان. ٦-حبذا الراکبین الهندان.

**﴿باسی"أفعال المدح والذم"لە کتێبی"الهدایة فی النحو"دا﴾**

**﴿کتێبی"الهدایة فی النحو"﴾**

کتێبی"الهدایة فی النحو"یەکێکە لە کتێبە گرنگەکانی زانستی نەحو، کەلەزانستگا و حوجرەکاندا زۆر بە چڕی خوێندراوە و دەخوێنرێت، ڕاجیایی هەیە لە نێوان زانایان دا سەبارەت بەدیاری کردنی دانەری ئەم کتێبە، هەندێك پێیان وایە کە دانەرەکەی"أبی حیان الاندلسی"یە،وهەندێکی تر پێیان وایە کە"زبیر بصری أبن أحمد الشافعی"یە، وەهەندێکی تر پێیان وایە کە"عبدالجلیل فیروز غزنوی"یە، وەهەندێکی تر ڕایان وایە کە دانراوی"أبن درستویه عبداللـه بن جعفر"ە،وەهەندێکی تریش وتویانە کە دانراوی کچێکی"أبن حاجب"ە، بەلاّم هیچ کام لەم ڕایانە بەڵگەیەکی بەهێزیان پێ نی یە، ڕای بەهێز

زیاتر لەسەر ئەوەیە کە "أبی حیان"داینابێت.وە شێوازی دانانەکەی لە سەر ڕەوتی "کافیە"ی پێشەوا"أبن حاجب"دانراوە. واتە:لەشێوازی دانانی بابەکان و جیاکردنەوەی بەندەکان دا.

أفعال المدح والذم:ماوضع لانشاء مدح أوذم، أما المدح فله فعلان :نعم"وفاعله أسم معرف باللام نحو:"نعم الرجل زيد"، أو مضاف ألى المعرف باللام، نحو:"نعم غلام الرجل زيد"،وقد يكون فاعله مضمرا فيجب تميزه بنكرة منصوبة، نحو:"نعم رجلا زيد"، أو بما نحو قوله تعالى:"فنعما هی"، أی:نعم ماهی، وزيد يسمى المخصوص بالمدح.

ومنها، "حبذا":نحو:"حبذا لجلا زيد"، فحب فعل المدح وفاعله ذا، والمخصوص زيد، ورجلا تميز، ويجوز أن يقع قبل مخصوص حبذا أو بعده تميز، نحو:"حبذا رجلا زيد"، "وحبذا زيد رجلا"، أو حال نحو:"حبذا راكبا زيد"، و"حبذا زيد راكبا".

أما الذم فله فعلان أيضا:وهو"بئس"، نحو:"بئس الرجل زيد"، وبئس غلام الرجل زيد"،و"بئس رجلا زيد"، وساء ، نحو:"ساء الرجل زيد"، "وساء غلام الرجل زيد"، "وساء رجلا زيد"، وساء مثل بئس.

ئەفعالی مەدح وزەم: ئەو فیعلانەن کە تایبەتن بە دەستەبەر کردن وپێدا هەڵگوتنی چاکە بۆ یەکێك،وە یاخود بەپێچەوانەوە،واتە:ڕیسواکردن وسەرزەنشت کردنی کەسێك، وە بەشێوەیەکی گشتی چوار دانەن:"نعم"،"حبذا"،"بئس"،"ساء".کە دوانەکەی یەکەم بۆ مەدح ودوانەکەی دووەم بۆ زەم بەکار دەهێنرێن.

"نعم":بەکەسری نون و سکونی عەین و فەتحەی میم دەردەبڕدرێت، کە فاعیلی "نعم" سێ حاڵەتی هەیە:

١-ئیسمێك دەبێت کە ئەلف ولامی پێوە بێت، وەك"نعم الرجل زيد".پێشتر ئیعراب وماناکەی ڕابورد،بەس ئەوەندە بزانە کە لێرەدا فاعیلەکەی "نعم"بە ئەلف ولامەوە هاتوە.

وە هەروەها لە سەر ئەو شێوازەش ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز هەیە، کەدەفەرموێت:"نعم المولى ونعم النصير".

٢- ئەم حاڵەتەیان ئەوەیە کە فاعیلی"نعم"بەبێ ئەلف ولام دێت.، بەڵام ئیضافە دەکرێت بۆ لای ناوێك کە ئەلف و لامی پێوە بێت، وەك"نعم غلام الرجل زید":ئای خزمەتکارەکەی ئەو پیاوە کەزەیدە،چەن کەسێکی باشە!

" **نعم**": فیعلێکەلە فیعلەکانی مەدح " غلام ":فاعیلە. و ناوێکە کە بەبێ ئەلف و لام هاتوە. بەڵام ئیضافە کراوە، بۆ لای ناوێك کە ئەلف و لامی پێوە یە، " **الرجل** ": موضاف ألیە یە. "زید": تایبەت بە مەدحە(**المخصوص بالمدح**).

وە هەروەها لە سەر ئەو شێوازەش ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز هەیە، کەدەفەرموێت:"وَلَنِعْمَ دارُالْمُتَّقِين".

**(جیاوازی زانایان دەربارەی، فیعل بورن،یاخودئیسم بونی "نعم"و "بئس")**

جیاوازی زانایان دەربارەی، فیعل بورن،یاخودئیسم بونی "نعم"و "بئس"،لەسەر دوو ئاراستەیە:

أ:لای بەصری یەکان،وخودی سەردەستەی کوفی یەکان،کە"کسائی"یە،ڕایان وایە کە ئەم دووکەلیمەیە فیعلن،بە بەڵگەی ئەوەی کە تائی تەئنیسی ساکینەیان،دەچێتە سەر،وەك:"نعمت المرأة زینب"،"وبئست المرأة هند".وەهەروەها ضەمیری ڕەفعە دەچێتە سەریان، وەك:"الزیدان نعمارجلین"،" والزیدون نعموارجالا".بۆیە دەڵێن،کەئەم دوانە فیعلن نەك ئیسم.

ب:کوفی یەکان پێیان وایە کە ئیسمن، بە بەڵگەی ئەوەی کەحەرفی جەڕیان دەچێتە سەر. وەك:"واللە ماهی بنعم الولد"، کەبائی حەرفی جەڕچوەتە سەر"نعم".وەهەروەها وەك:"نعم السیر علی بئس العیر"، کە"علی"ی حەرفی جەڕچوەتە سەر" بئس".

وەبزانە کە: ڕای یەکەم بەهێزە ودووەم لاوازە.

دانەری کتێبی"الهدایة فی النحو"،بەهێنانی تەعبیری "ماوضع لانشاء مدح أوذم"، سەرجەم ئەو کەلیماتانە دەکاتە دەرەوە، کەمانای مەدح وزەم دەگەیەنن،بەڵام لای زانایانی نەحو بەمەبەستی فاماندنی مەدح وزەم دانەنراون،وەك:" شرف الرجل زید"، "شرف غلام الرجل زید"،"ولؤم الرجل بکر"،" ولؤم غلام الرجل بکر".وە هەروەها ئەم جۆرە تەعبیرانەیش دەچنە دەرەوە،"کرم زید"،"شرف عمرو"،"قنع علی"،"عور

طارق"،"مدحت باقرا"،"وذممت عمروا".کەسەرجەم ئەمانە هەرچەندە مانای مەدح وزەم دەگەیەنن،بەڵام لە چوارچێوەی باسەکەی ئێمەدا نین،ونایانگرێتەوە.

وە پێویستە ئەوە بزانرێت،کە کەسی مەدح کراوو کەسی سەرزەنشت کراو بەپلەی یەکەم لەهەردوو نمونەی " نعم الرجل زید"،" بئس الرجل بکر"دا،جینسی پیاو"رجل"ەکەیە،کە کەسی تایبەت کراوبەمەدح و کەسیتایبەت کراوبە سەرزەنشت کردن هەر لەودا کۆدەبێتەوە، کە لێرەدا دوو حاڵەتی سەرزەنشت کردن یاخود دوو حاڵەتی مەدح کردن دێتە ئاراوە، وە حاڵەتی مەخصوص بە مەدح بۆیە هاتوە،چونکە هەڵە دەبوو، ئەگەر ئەو حاڵەتی مەخصوص بە مەدح یاخود مەخصوص بە زەم دروست نەکرێت، چونکە ئەوکات مەدح وزەمەکە سەرجەمی جینسی شتەکەی ئەگرتەوەو ئەمەش بێگومان هەڵەیە، چونکە بۆی هەیە هەندێك لە ئەفرادەکانی جینسەکە باش یاخود خراب بن، بۆیە ناکرێت هەمویان لە حاڵەتی مەدح یاخود زەم دا دابنێین، لەم ڕوانگەوەیە کە مەخصوص بە مەدح و مەخصوص بە زەم دروست ئەکرێت،ودیاری ئەکرێت.

٣.ئەوەیە کە فاعیلی"نعم" ضەمیرێکی شاراوە:مستتر"بێت،کە لەم حاڵەتەدا وەك ضە میری موبهەم وایە،بۆیە دانەری هیدایە فەرموی:پێویستە کە ئەو ضەمیرە موبهەمەبە هۆی نەکیرەیەکی مەنصوبەوە بکرێتە تەمیز، وەك:"نعم رجلا زید"،واتە:ئەوی زەید لەڕووی مەردایەتیەوە چ پیاوێکی باشە!

نعم:فیعلی مەدحە. و ضەمیری"هو"، لە"نعم"دا، "شاراوە:مستتر"ەو،ودەبێتە فاعیل بۆی.

رجلا: تەمیزە،بۆ ئەو ضەمیرە موقەددەرە، "زید": مەخصوص بە مەدحە،و" رجلا"لەو نمونەیەی دا کەباس کرا، ئەو ضەمیرە موقەددەرەی کە لە"نعم"دا هەیە ،کە موفرەدی موزەککەرە،و ڕێك وەك خودی "رجلا"وایە،تەفسیر دەکات، کە ئەونمونەیەش وەك ئەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگار وایە،"بئس للظالمین بدلا".

أو بما نحو قوله تعالی:"فنعما هی"، أی:نعم ماهی،واتە:لە کاتێکدا کەفاعیل ضە میرێکی موقەددەر دەبێت،دەبێت تەفسیرێکی لێوە بکەین ونابێت هەروا بە موقەددەری

وشاراوەسیی بمێنێتەوە، بۆیە یان دەبێت،بە هۆی نەکیرەیەکی مەنصوبەوە بکرێتە تەمیز،وەك باسکرا،وەیان بەهۆی "ما"وە، دەکرێتە تەمیز،وەك"فنعما هی"،بەکەسری نون وعەین، و"نعم"،لەسەر شێوازێکی تایبەتی لوغاتەکانی عەرەب، کەئەم ئایەتە لەڕیشەدا"فنعم ماهی"بووە، کەهەردوو میمەکە لەیەکتردا دەغم کراون.

نعم:فیعلی مەدحە. و ضەمیری، "شاراوە:مستتر"ی، "هی"، تیایدا،دەبێتە فاعیل بۆی.

"ما":نەکیرەیەکی مەنصوبەیەو تەمیزە.وە لەسەر ڕای هەندێك لەزانایانی نەحو"ما": فاعیلی" نعم"ەیە،کە ئەگەر لەسەر ئەم حاڵەتە بڕۆین،کەلەباسەکەمان دەچینە دەرەوە، چونکە ئێمە لەسەر حاڵەتێك قسە دەکەین کە فاعیل ضەمیرێکی مەقەددەر بێت،وئیتر بەهۆی نەکیرەیەکی مەنصوبە یاخود بە هۆی"ما"وە بیکەینە تەمیز.وە وشەی "هی"کە لەدوای"فنعما هی"وە،هاتوە،بۆلای "ما"دەگەڕێتەوەو مەخصوص بە مەدحە،کە عیبارەتە لە"صدقات".

وە پێویستە ئەوە بزانرێت کە"ما" لەم ئایسەتە پیرۆزەدا، نەکیرەیە وبەمانای"شیء"هاتوە، وە تەقدیری ئایەتەکە بەم جۆرەیە،"نِعْمَ الْشَّیْءُ شَیْئاً هِیَ الْصَّدَقَاتُ"، بۆیە لێرەداگما"نە مەوصولەیە،وەك "فراو"و"أبوعلی الفارسی"وتویانە،ونە مەعریفەی تەواوە"تامە"یە،وەك"سیبویە"و"کسائی"وتویانە.

تێبینی: ئەگەرلەفزی "ما"مەوصولە بێت،کە بەدەستەواژەیەکی ترئەگەر مەعریفەی ناتەواو"ناقصە"ەیە، تەقدیرەکەی بەم شێوازە دەبێت،:"نِعْمَ الَّذِي تُبْدُونُهُ هِیَ"، وە تەقدیری مەعریفەی تەواوە"تامە"،"نِعْمَ الْشَّیْءُ هِیَ"دەبێت.

﴿ تەواوی ئایەتەکە﴾

إِنْ تُبْدُوا الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِنْ تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَيُكَفِّرُ عَنْكُمْ مِنْ سَيِّئَاتِكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ.البقرة:٢٧١

وەبۆ نمونە لەسەر"بئس"ئەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگار هەیە،کە دەفەرموێت، "بئسما اشتروا بە انفسهم".

و زید یسمی المخصوص بالمدح: واتە:وەلەسەرجەم ئەو سێ جێگاوحاڵەتانەیدا کەباسمان کردو ڕابورد، کە بریتی بوون لە:

١.ئەوەی کە فاعیلەکە ئەلف ولامی پێوە بێت.

٢. ئەوەی کە فاعیلەکە ئیضافە کرابێت بۆ لای ئەلف ولام.

٣. ئەوەیە کە فاعیلەکە ضەمیرێکی موقەددەر بێت،کە لەهەرسێ حاڵەتدا"زید"بە مەخصوص بە مەدح ناوزەد دەکرێت.

یەکێکی تر لەو چوار فیعلەی مەدح وزەم،بریتی یە لە "حبذا"، بە شەددەی بائەکە، کەئەم وشەیەش هەروەك "نعم"بۆ پیاداهەڵدان"مدح"بەکاردەهێنرێت، وەك:"حبذا رجلا زید"، ها...زەید چ پیاوێکی باشە! (حب): فعلی ماضی یە،وفیعلی مەدحە. (ذا):ئیسمی ئیشارەیە،وفاعیلە. (رجلا): تەمیزە،بۆفاعیلەکە کە"ذا"یە."زید":مەخصوص بەمەدحە.

تێبینی:ئەوە بزانە کە لە "حبذا"دا زۆر بەکەمی رێك ئەکەوێت، کە"رجلا"بە تەمیزی بێت، بەڵکو بەزۆری "حبذا زید"دەوترێت،وە تەنانەت ئەم نمونەیەی کە لە مەتنی "هدایة"دا هاتوە، لە نوسخە دەستنوسەکەی ئەدیبی پاکستانی دا، "رجلا"ی لە گەڵدا نەهاتوە، وە سەبارەت بە ئیعرابی نمونەی "حبذا زید"، سێ شێواز هاتوە،بەم جۆرەی لای خوارەوە:

(حب): فعلی ماضی یە،. (ذا): فاعیلەکەیەتی. "زید":مەخصوص بەمەدحە، کە ئەمەش ڕای ئیبن مالیك وئەبو عەلی فارسی و ئیبن بورهان و ئیبن خەروفە.

"حبذا": هەموی ئیسمە وموبتەدایە. "زید":مەخصوص بەمەدحە وخەبەرەکەیەتی. وە یاخود "حبذا":خەبەرەو پێشکەوتوە،"زید":موبتەدایەو دواکەوتوە.کەلەم حاڵەتەدا "حب" بە هاوڕێیەتی"ذا"هاتوە، و بە هەردووکیانەوە ئیسمێك پێك دەهێنن، کە ئەمەش ڕای موبەڕید وئیبن سەڕاج وئیبن هیشامی لەخمی و ئیبن عوصفورە، و تەقدیری جوملەکە بە گوێرەی ئەم ڕایە بە م جۆرە دەبێت،"المحبوب زید".

" **حبذا** ": هەموی فیعلی ماضی یە." **زید**"::فاعیلەکەیەتی. کەلەم حاڵەتەدا "حب"بە هاوڕێیەتی"ذا"هاتوە،وبەهەردوکیانەوە بونەتە فیعلی ماضی.ئەم ڕایە ش کە هی ئیبن دوروستەوەیهە، و ژمارەیەکی ترە، ڕایەکی لاوازە.

ئەوەش بزانە کە هەرکات لەفزی "لا"ڕۆیشتەسەر "حبذا"، ماناکەی وەك مانای "بئس"دەبێت، وبۆ سەرزەنشت کردن"الذم"بەکاردەهێنرێت:وەك:"لاحبذا زيد".ئیبن مالکی شلە ئەلفیەکەیدا دەڵێت:

وَمِثْلُ نِعْمَ حَبَّذا الْفاعِلُ ذا وَاِنْ تُرِدْ ذَمًّا،فَقُلْ لا حَبَّذا

دروستە کە تەمیز،وحاڵ لەدوای مەخصوصی "حَبّذاَ" یان لە پێشیەوە بێت، بە پێچەوانەی سێ فیعلەکەی ترەوە،وەك:

١."حبذا رجلا زيد"، ها...زەید چ پیاوێکی باشە! (حبذا): فیعل و فاعیلەوفیعلی مەدحە. (رجلا): تەمیزە،بۆفاعیلەکە کە"ذا"یە."زيد":مەخصوص بەمەدحە.مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە "رجلا"کە تەمنیزەکەیە، لە پێش مەخصوصەکەی "حبذا"وە،هاتوە،کە"زيد"ە.

٢."حبذا زيد رجلا "، ها... چ پیاوێکی باشە، زەید! (حبذا): فیعل و فاعیلەوفیعلی مەدحە. "زيد":مەخصوص بەمەدحە،وپێش کەوتوە. (رجلا): تەمیزە،ودواکەوتوە.

٣. "حبذا راكبا زيد"، ها... چ سوارێکی باشە، زەیدا!مەبەست لە حاڵیەتەکەیەتی. (حبذا): فیعل و فاعیلەوفیعلی مەدحە. "راكبا":حاڵە وپێش کەوتوە."زيد":مەخصوص بەمەدحە،ودواکەوتوە.مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە " راكبا "کەحاڵە، لە پێش مەخصوصەکەوە هاتوە.

٤. "حبذا زيد راكبا "، ها...زەید چ سوارێکی باشە!مەبەست لە حاڵیەتەکەیەتی. (حبذا): فیعل و فاعیلەوفیعلی مەدحە. ."زيد":مەخصوص بەمەدحەو وپێش کەوتوە. "راكبا":حاڵە ودواکەوتوە.

بزانە: کە جیاوازی نێوان "حبذا"و"نعم"ئەوەیە کە لە"حبذا" تەمیزو فاعیل پێکەوە دێن، وەك:"حبذا رجلا زيد"،ئەمە بە پێچەوانەی"نعم"ەوە، وە هەروەها لە "حبذا"دا، فاعیل بە موسەننا وجەمعی ئاشکرا نایەت، بە پێچەوانەی"نعم"ەوە، کە فاعیلەکەی بە موسەننا وجەمعی دێت.وەك:"نعم الرجال الزيدون"، لەم ڕووەوە هەندێك لە زانایانی

زانستی نەحو، "حبذا" یان بە پاشکۆی"نعم" داناوە. بەڵام ئەمە بەو مانایە نی یە،کە "حبذا" یان بە لقی فیعلە مەدحەکان دانابێت، واتە حیسابی ئەصڵیان بۆ نەکردبێت.

### ﴿دەستەواژەکانی سەرزەنشتکاری"الذم"﴾

ئەوەش بزانە کە دوو دەستەواژەیش بۆ سەرزەنشتکاری"الذم"دانراوە، کە ئەوانیش "بئس"، و"ساء"ەن،وەك: :"بئس الرجل زید"،زەید چ پیاوێکی خراپە،یاخود، پیاوی چەند خەرابە،ئەگەر زەید بێت!کە فاعیلەکە بە ئەلف ولامەوە هاتوە.

و"بئس غلام الرجل زید":زەیدی خزمەتکاری ئەو پیاوە، چەند خەراپە!فاعیلەکە لێرەدا ئیضافەی لای ئیسمێك کراوە، کە ئەلف ولامی پێوەیە،کە ئەویش "الرجل"ە.

و"بئس رجلا زید":زەید چ پیاوێکی خەراپە! مەبەست لەم نمونەیەدا ئەوەیە کە فاعیلی "بئس"ضەمیری شاراوەی "هو"ەیە،وە تەمیزێکی نەکیرەی مەنصوبی هاتۆتە سەر، "ساء الرجل زید":جە پیاوێکی خەراپە زەید! کە فاعیلەکە بە ئەلف ولامەوە هاتوە،

"وساء غلام الرجل زید": خزمەتکاری ئەو پیاوە، چەند خەراپە،کە زەیدە!کە فاعیلەکە کە"غلام"ە، ئەلف ولامی پێوە نی یە، بەڵام ئیضافەی لای ئیسمێك کراوە، کە ئەلف ولامی پێوەیە،کە ئەویش "الرجل"ـە.

"وساء رجلا زید":لەرووی پیاوەتیەوە،زەید چ پیاوێکی خەراپە! کە فاعیلی "ساء" ضەمیری شاراوەی "هو"ەیە،و"رجلا": تەمیزیەتی. و"زید":مەخصوص بەمەدحە،"وساء مثل بئس":دانەری هیدایە ئەڵێت،کە لەسەرجەم گۆڕانکاری یەکاندا"ساء"وەك"بئس" وایە،واتە بەهەمان ئەو شێوەیەی کە فاعیلی "بئس" یەکێك لەم حاڵەتانەی خوارەوەی هەیە:

١.ئەلف ولامی پێوە بێت.

٢. ئیضافەی لای ئیسمێك کرابێت ، کە ئەلف ولامی پێوە بێت.

٣.یان شاراوە"مضمر"یان تەمیزی بۆ دانرابێت، بە هۆی نەکیرەیەکی مەنصوبەوە، وەك ڕابورد.

بۆیە فاعیلی "ساء"ەیش دەبێت، ڕێکاوڕێك بەم جۆرە بێت.کە ڕابورد.

تێبینی: لە وەرگێڕانی زمانەوانی نموونەکانی ئەم بەشەدا بۆ کوردی هەندێ گۆڕانکاری پێویست کراوە، کەلەوانەیە لە دەقە ئەصڵە عەرەبیەکەدا مەبەستەکە ئەوە نەبێت، بەڵام لە زمانی کوردیدا هەر هێندە دەردەبڕدرێت، بۆیە قوتابی زیرەك دەبێت خۆی ئەو ووردەکاریانە بدۆزێتەوە.

* * *

وأمّا شبه الفعل:

فمنه المصدر، و يعمل عمل الفعل الذي أشتق منه، نحو: أعجبني قعود الأستاذ على الحصير، ونشره العلم على الصغير، و الكبير.

---

باسی شیبهـ فیعل:

کە بریتیە لە (مەصدەر: چاوگ)، و (ئیسم فامیل)، و (ئیسم مەفعول) و (الصفة المشبهة) و (أسم التفضيل) و دواتر باسی (الظرف) و (الجار والمجرور) و (أسماء الأفعال).

## مەصدەر:

مەصدەریش بریتیە، لەوەی کە کاری ئەو فیعلە دەکات کە لێیەوە دەردەهێنرێت، وەك: (أعجبني قعود الأستاذ علي الحصير، ونشره العلم على الصغير والكبير: دانیشتی مامۆستاکە لەسەر حەسیر، و فێرکردنی گەورە و بچوك لە لایەن جەنابیانەوە، سەرسامی کردم!

## ﴿باسی (الْمَصْدَرْ) چاووگ﴾

جۆری دووەم لە عەوامیلە قیاسییەکان، بە مەصدەر ناوزەد دەکرێت، و فیعلیش بەگشتی لە مەصدەرەوە وەردەگیرێت، و موشتەقی ئەوە، وەك: (ضَرْبْ، نَصْرْ)، ئەم دوو ووشەیە مەصدەرن، کە لە فیعلی (ضَرَبَ و نَصَرَ)، موشتەق کراون.

*وەزنەکانی مەصدەری سیانی (ثلاثي) دوو بەشە:

قیاسی و غەیرە قیاسی:

وەزنەکانی قیاسی، مەصدەری سیانی بەم جۆرەیە:

١.فَعْلْ: هەر فیعلێك کە عەینولفیعلەکەی مەفتوح یان مەکسور بێت، لەسەر ئەم وەزنە دێت، وەك: ضَرَبَ و فَهِمَ، کە مەصدەرەکانیان (ضَرْبْ و فَهْمْ)ـە.

**٢.فَعَلْ:** مەصدەری فیعلی سیانی یە، وەك: (فَرِحَ) كە مەصدەرەكەی (فَرْح)ـە، و فیعلی (معتل اللام)ی سیانی، وەك: (جَوِيَ) كە مەصدەرەكەی (جَوَی)یە.

**٣.فِعالَة:** مەصدەری فیعلێكی سیانی یە، كە دەلالەت بكات لەسەر پیشە و سەرقاڵییەك، وەك: (صاغ)، كە مەصدەرەكەی (صِیاغَة)ـەیە.

**٤.فِعال:** مەصدەری ئەو فیعلە سولاسییانەیە كە دەلالەت بكات، لە سەر هەیەجان و هەڵهاتن ، وەك: (نَكَحَ) و(فَرَّ) كە (نِكاح) و (فِرار) مەصدەرە كانیانە.

**٥.فُعالْ:** زیاتر مەصدەری ئەو فیعلانەیە كە دەلالەت لەسەر دەنگ (صَوت) بكات، وەك: (صَرَخَ)، كە مەصدەرەكەی (صُراخ)ـە.

**٦.فُعْلَةْ:** زیاتر مەصدەری ئەو فیعلانەیە كە دەلالەت لەسەر ڕەنگ دەكەن، وەك: (حَمُرَ)، كە مەصدەرەكەی (حُمْرَة)ـەیە.

**٧.فَعالَة:** كە ئەمیش زیاتر مەصدەری ئەو فیعلانەیە كە (عین الفعل)ـەكانیان مەضمومە، وەك: (كَرُمَ)، كە مەصدەرەكەی (كَرامة)ـەیە.

بەڵام وەزنە غەیرە قیاسی یەكان لە (ثلاثي) دا بریتیین لەو مەصدەرانەی كە بۆ كردنەوەیان یاساو ڕێسایەكی تەواو لەدەستماندا نییە، بۆیە دەبێت بە هەر جۆرێك لە زمانی عەرەبەوە بیسترابێت، لەسەر ئەو شێوازە كار بكەین.

<u>وەزنەكانی مەصدەرە غەیرە (ثلاثی)یەكان، كە قیاسین بریتیین لە:</u>

١.إفعال

٢.تَفْعیل

٣.مُفاعَلَة

٤.إنْفعالْ

٥.إفْعِال

٦.تفاعُل

٧.تَفَعُّل

٨.إستِفعال

٩.فعْلال
١٠.تَفَعْلُل
١١.إفْعِنْلال
١٢.أفعيلالْ.

وە ئەوەش بزانە کە مەصدەر، هەر وەك فیعلەکەی خۆی بەموتڵەق کار دەکات، ئیتر چونیەکە لازم بێت، یا ن موتەعەددی، مەعلوم بێت، یان مەجهول، بە دەستەواژەیەکی تر مەصدەر کار (عمل)ی فیعلەکەی ئەنجام دەدات، بەو مانایەی کە ئەگەر فیعلەکەی لازم بێت، پێویستی بە فاعیلە، و مەصدەرەکەیش بەهەمان شێوە پێویستی بە فاعیلە، وە ئەگەر فیعلەکەی موتەعەددی بێت، پێویستی بە فاعیل و مەفعول هەیە، بۆیە مەصدە رە کەیش دیسان پێویستی بەم حاڵەتە هەیە، واتە: پێویستی بە فاعیل و مەفعول هەیە.

*مەصدەر: هەروەك فیعل عەمەل ئەكات، مەگەر لەکاتێکدا نەبێت، کە مەصدەرەکە، مەفعول موتڵەق بێت، و مەفعول موتڵەقیش دوو بەشە:

١.ئەوەی کە بەدەل و جێگرەوەی فیعل نەبێت، چونکە لەم کاتەدا عەمەلە کە بۆ فیعلەکە دەبێت، ئیتر فیعلەکە باسکرابێت، وەك: (ضَرَبْتُ ضَرْباً زيْداً)، وە یان بە جائیزی حەزفکرابێت، واتە: (جائِزُ الحذف)، وەك:(ضَرْباً زَيْداً)، چونکە بەبوونی فیعل لە کەلامدا، بەڵام بە بوون و وجودێکی بەهێزەوە، کار کردنی مەصدەر، کە لاوازەکەیە، دروست نی یە.

٢.ئەوەی کە بەدەل لە فیعل و حەزفی فیعل تیایدا پێویست بێت، وەك: (سَقْياً لِزَيْدٍ) کە لە ئەصڵدا (سَقاكَ اللهُ سقْياً) بووە، لەم بەشەدا دوو شێواز دروستە:

أ.عەمەل کردنی فیعلەکە، وەك ئەصڵەکە وایە.

ب.کارکردنی مەصدەر، وەك (نائیب:جێگەگرتنەوە) وایە.

ئەم ڕایەش دراوەتە پاڵ دوو دەستە لە زانایانی نەحو، ڕای (مبّرد) و (صَيْرَفيِ)، و کۆمەڵێکی تر لە سەر ئەوەیە کە عەمەل پەیوەندی بە

فیعلەکەوە هەیە، و بە حەزف بوونی ئەو عەمەلە لاناچێت، بۆیە لەم ڕووەوە، عامیلەکە (کارکەر)ـەکە، هەر سەر بە ئەو فیعلە حەزفکراوە دەزانن، بەڵام ڕای (سیبویە) و (أخفش) و (أبن الفارس) و کۆمەڵێکی تر ئەوەیە کە عامیل، مەصدەرە، چونکە جێگری فیعلە، و بەدەل بوونی مەصدەر لە جیاتی فیعل بووەتە هۆی ئەوەی کە دروست بێت، عەمەل بکات.

هەروەك ووتمان مەصدەر، وەك فیعلەکە خۆی عەمەل ئەکات، مەصدەری فیعلی لازم، وەك: (بَلَغَني)، (بَلَغَ): فیعلە، (نون): ویقایەیە، (یاء): مَنصوب بنزع الخافض. (قِیامُ): فاعیلە و موضافە، لەم نمونەیەدا (قیامُ) بۆ لای فاعیلەکەی خۆی (زیدٍ) ئیضافەکراوە.

مەصدەری فیعلی موتەعەددی، وەك: (أعْجَبَني ضَرْبُ زیْدٍ عمْرواً یوْمَ الجُمُعةِ أمامَ الأمیرِ ضَرْباً شدیداً تأْدیباً لهُ) لێدانەکەی زەید لە عەمر کە لە ڕۆژی جومعەدا، و لەبەردەم ئەمیرەکەدا لێیدا، بۆ ئەوەی ئەدەبی دابدا، سەرسامی کردم!

(أعجب) فیعلە، (نون): ویقایەیە، (باء): مەفعول بە، یە، (ضَرْبُ) موچافە، کە بۆ لای فاعیلەکەی خۆی (زیدٍ) ئیضافە کراوە، (عَمْرواً) مەنصوبە، و مەفعول بە، یە، (یومٌ):موضافە، و مەفعول فیە،یە، (ألجُمعە): موضاف ألیە،یە، (ضَرباً):مەفعول موتڵەقە و مەوصوفە، (شدیداً)، صیفەتە، (تأدیباً): مەنصوبەو مەفعول لَهُ،یە، (لهُ): جارومەجروورە و مەفعولی بە واسیطەیە،لە بەر ئەوەی کە فیعلی لازم و موتەعەددی خاوەنی ئەم تایبەتمەندیانەن، واتە فیعلی لازم، وەك: (قامَ) تەنها پێویستی بە فاعیلەو فیعلی موتەعەددیش وەك، (ضَرَبَ)، جگە لە فاعیل، مەفعول بِهِ، یشی دەوێت.

وە لە هەندێ جێگادا، مەصدەر لە غەیری فاعیل و مەفعولدا کار دەکات، وەك: (للە درّهُ فارساً)، زیادە خێری و هۆشمەندی، لە خواوەیە.

(لله) جارومەجرورە، و ظەرفی موستەقیرڕە، و موتەعەللیقە بە (ثابت)ـە، و خەبەرە و پێشکەوتووە، (درٌّ): موبتەدایە و دواکەوتووە، و موضافە، (هُ): موضاف ألیە، یە، لەم نمونەیەدا (درٌّ) کە مەصدەری فیعلی (درَّ)ـەیە، وەك فیعل عەمەلی کردووە، و (فارساً)ی، وەك تەمیز مەنصوب کردووە.

وە لەکاتێکدا مەصدەر لە فیعلی مەجهول بێت، واتە بگەڕێتەوە سەر ئەو، ئەوە لەم کاتەدا ئەو مەصدەرە، وەك فیعلی بینا مەجهول پێویستی بە نائیب فاعیل هەیە، وەك: (وَهُمْ منْ بعْدِ غَلَبِهِمْ سيَغْلِبونَ).

(واو): عاطیفەیە، (هُم): ضەمیری مونفەصیلە، لە مەحەللی ڕەفعدا موبتدایە، (مِنْ بعْدِ): جارومەجرورە، و موتەعەللیقە بە (یغلبون)، (غلب)ی مەصدەر موضافە، إلیە،یە، (س): ئیستیقبالیە،یە، (یغلبون) فیعل و فاعیلە و لە مەحەللی ڕەفعدا خەبەری موبتەدایە، و مەصدەری (غلب) عەمەلی فیعلی مەجهولی کردووە، و نواندووە، واتە نائیب فاعیلی بۆ خۆی پەیدا کردووە، وە (غلبهم) لە جێی (أن غلبوا) دایە.

عەمەلکردنی مەصدەر لە حاڵەتێکدا کە ئەلف و لامی پێوەبێت، زۆر لاوازە، چونکە لەم کاتەدا لێکچوون و شەباهەتی بە فیعلەوەیە، ئەمەش ئەبێتە هۆی ئەوەی کە نەتوانێت، بەردەوام عەمەل بکات، وەك ئەم دێڕە شیعرە:

ضَعيفُ النِّكايةِ أعْدائَهُ يَخالُ الفَرارُ يُراخي الأجَلَ

ئەو پیاوە لەشەڕ کردن و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمنانیدا زۆر لاوازە، وا بیر دەکاتەوە کە هەڵهاتن لە گۆڕەپانی ڕووبەڕووبوونەوە مەرگی ئەو دوا دەخات!

لەم دێڕە هۆنراوەیەدا: (النّكايه) لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەلف و لامی پێوەیە عەمەلی کردووە، و (أعدائه)ی، بینا لە سەر ئەوەی کە مەفعولە، مەنصوبی کردووە، و فەتحەی داوەتێ، بەڵام ئەم جۆرە عەمەلکردنە کەمتر ڕوودەدات.

*** مەرجەكانی عەمەل كردنی مەصدەر:**

١.لەسەر صیغەی (بچوك كراوە: تصغیر) نەبێت.

٢.تائی وەحدەتی پێوە نەلكابێت، لەبەر ئەوە گوتنی (أعْجَبَني ضَرْبَتُكَ زيداً) یەكجار لێدانەكەی تۆ لە زەید منی سەرسام كرد، دروست نی یە.

٣.لە نێوان مەصدەرو مەعمولەكەیدا یەكێك لە تەوابیع نەبووبێتە جیاكەرەوە (فاصلة)ی نێوانیان، لەبەر ئەمەشیانە ناتوانرێت بگوترێت: (أعْجَبَني ضَرْبُكَ العَنيفُ زيْداً)، لێدانە توندەكەی تۆ لەزەید منی سەرسام كرد.

٤.ضەمیر نەبێت، واتە ضەمیرێك كە مەرجەعەكەی مەصدەر بێت، عەمەل ناكات، بۆیە ناتوانرێت بگوترێت: (ضَرْبي زيْداً قَبيحٌ و هُوَ عَمْرواً حَسَنٌ) لێدانەكەی من بۆ زەید، بێتام و لێدانەكەی كەم بۆ عەمر جوان بوو!.

٥.نابێت مەصدەر مەحزوف بێت!

روونكردنەوە: لەباسی بوونی مەصدەر لە فیعلی مەجهول دا ئایەتی (وَهُمْ مِن بعد غَلَبِهِم سيغلبون) مان كرد بە نموونە، بۆیە لێرەدا ئەوە بزانە كە:

**لەفزی (غَلَبَ) لە قورئانی پیرۆزدا بۆ چوار مانا بەكار هاتووە:**

یەكەم: (غلب) بەمانای بێداری هاتووە، وەك: قَال الذين غلبوا على أمرهم لنتخذن عليم مسجداً) سورەتی كەهف.

دووەم: (غلب) بەمانای شكست خواردن هاتووە، وەك: (سيغلبون في بضع سنين) مريم.

سێیەم: (غلب) بەمانای كوشتار هاتووە، وەك: (قل للذين كفروا ستغلبون وتحشرون إلى جهنم) آل عمران.

چوارەم: (غلب) بەمانای دەسەلات و توانا هاتووە، وەك: (واللهُ غالبٌ على أمرِه) يوسف.

وە لەهەندێ جێگادا مەصدەر بۆ لای فاعیلی خۆی ئیضافە دەکرێت، و مەفعولەکەیش بەحاڵەتە ئیعرابیەکەی خۆیەوە (مەنصوبیەت) دەمێنێتەوە، وەك: (أعجبني ضَرْبُ زيدٍ عَمْرواً): لەم نموونەیەدا (ضَرْب) بۆ لای فاعیلەکەی خۆی کە (زید)ـە، ئیضافە کراوە، و مەفعول بە، یەکەیش بە ئیعرابەکەی خۆیەوە کە مەنصوبیەتە ماوەتەوە.

وە هەندێ جار مەصدەر بۆ لای مەفعول بە، ئیضافە ئەکرێت، کە لەم حاڵەتەدا فاعیل لەسەر حاڵەتە پێشووەکەی خۆی کە مەرفوعیەتە دەمێنێتەوە، وەك: (أعجبني منْ ضَرْبِ عَمْرٍ زيدٌ) لەم نموونەیەدا مەصدەر بۆلای مەفعول بە، ئیضافە کراوە،و فاعیلەکەیش کە (زیدٌ)ـە، هەر مەرفوعە.

وە هەندێ جار یەکێك لە دوو مەعمولەکەی مەصدەر حەزف دەبێت، وە ئەوی تریان بە حاڵەتە ئیعرابیەکەی خۆیەوە دەمێنێتەوە، وەك: (أعْجَبَني ضَرْبُ زيدٍ) کە (ضَرْب)ی مەصدەر، ئیضافە کراوە بۆلای فاعیلەکەی، وە مەفعولەکەی حەزفکراوە، وە هەروەها وەك: (زَيْدٌ شديدُ الضَّربِ عَمْرواً) لەم نموونەیەدا فاعیلەکە حەزف بووە، و مەفعولەکە بە ئیعرابی خۆیەوە ماوەتەوە.

یا ئەو حاڵەتە دەبێت کە باسمانکرد، یاخود ئەو مەعمولەی تر بینا لە سەر ئەوەی کە ئیضافە کراوە، حاڵەتی مەجرور بوونی دەبێت، وەك: (أعْجَبَني ضَرْبُ زيدٍ)، کە زەید فاعیلە و مەفعول بە،یەکەی حەزف بووە، لەم نموونەیەدا لە بەر ئەوەی کە مەصدەر بۆ لای فاعیل ئیضافە کراوە، لەم ڕووەوە فاعیلەکەی لەفزەن مەجرور دەبێت.

وە هەروەها وەك: (أعْجَبَني ضَرْبُ عمروٍ) لەم نموونەیەدا فاعیلەکە حەزف بووە، و لە بەر ئەوەی کە مەصدەر بۆ لای مەفعول بە، ئیضافە کراوە، بۆیە مەفعول بِە، یەکە، لەفزەن مەجروورە.

مەعمولی مەصدەر بە سەر خودی مەصدەردا پێش ناکەوێت، وە هەندێ لە زانایانی زانستی نەحو، هۆکاری ئەو پێشکەوتنە بەم جۆرە دەرئەبڕن: (چونکە مەصدەر لە تەئویلی فیعل دا بە (أن)ی مەصدەرییە، وە لە بەر

ئەوەی ئەم وشەیە دەبێت، لە سەرەتاوە بێت، بۆیە لەم ڕووەوەیە کە ناکرێت، مەعمولەکەی بە سەریدا پێش بکەوێت).

ئەوە بزانە کە: هەر کات ویستبێتمان بۆ فاعیل و مەفعول بە،ی مەصدەر، تابیعێك بهێنین، لەم کاتەدا تابیعەکە لەڕووی ئیعرابەوە دەتوانێت لەفزی مەتبوعەکە، یا خود لە مەحەللەکەی جێگەدارێتی وگونجاندن بنوێنێت.

عَجِبْتُ مِنْ ضَرْبِ زيدٍ الظّريفِ-الظّريفُ.

(عجبتُ): فیعلەو فاعیلە (مِنْ ضَربِ): جارومەجرورەو موتەعەللیقە بە (عجبتُ)، و موضافە، کە بۆ لای فاعیلەکەی خۆی کە زەیدە ئیضافە کراوە، (الظّريفُ) صیفەتی زەیدە.

لەم نموونەیەدا (الظريفُ) کە صیفەت و (تابع)ی (زيدٍ)ـە، دوو جۆر ئیعراب کردن تیایدا دروستە.

١.بە ئیعتیباری لەفزەکە دەتوانرێت (الظريف) مەجرور بکەین، چونکە صیفەت لە گەڵ مەوصوفەکەی خۆیدا لەڕووی ئیعرابەوە یەکسان و موتابیقە، لەگەڵ ئەم جیاوازیەشدا کەچی لێرەدا صیفەت و مەوصوفەکەی، لەفزەن هەر موتابیقن.

٢.بە ئیعتیباری مەحەل، دەتوانرێت (الظّريف) بە مەڕفوعی مەتبوعەکە (زيد) کراوە، چونکە (زيد) بە فاعیلی مەصدەر حیسابە، و فاعیلیش مەڕفوعە.

وە هەروەها، وەك: (عَجِبْتُ من أكْلِ الخُبزِ واللّحْمِ واللّحْمِ).

لەم نموونەیەدا (ألخُبز) مەفعولی مەصدەرە، و لە بەر ئەوەی کە مەصدەری بۆ ئیضافە کراوە، لەفزەن مەجرور بووە، و کاتێك کە (اللّحم) عەطف بکرێتە سەر (الخُبز)، دروستە (اللّحم) بە نەصبی بهێنرێت، و لەم کاتەدا مەعطوفەکە لە مەحەلدا موتابەعەی لە معطوفٌ عليه،یەکە کردووە.

وە ئەگەر (اللّحم) بە جەڕی بهێنرێت، لەم کاتەدا مەعطوف لەگەڵ مەعطوف عەلەیهی، یەکی خۆیدا لەفزەن شوێنی کەوتووە، و موتابەعەی لێوە کردووە.

بزانە: هەر کات کە مەتبوع (فاعیل و مەفعول) لەسەر ئیعرابە ظاهیریەکەی خۆیان مەرفوعیەت و مەنصوبیەت مانەوە، لەم کاتەدا تابیعەکە تەنها حەرەکەت لەو دوو لەفزە وەردەگیرێت و ئیعرابەکەی وەك ئەوان دەبێت: وەك: (عَجِبْتُ من ضَرْبِ عمْرٍو زيدٌ الظّريفُ) ، لەم نمونەیەدا صیفەتی زەیدە، و هەر لەبەر ئەوەش مەرفوع بووە، وە هەروەها وەك:

(عَجِبْتُ منْ ضرْبِ زيدٍ عمْرواً الشّريف) کە لەم نموونەیەدا (الشّريف) صیفەتی (عمرواً)ـە، و هەر لەبەر ئەمەش (الشريف) بە مەنصوبی هاتووە.

*ڕێڕونی: ئیسمی مەصدەر ئەو ئیسمەیە کە دەلالەت بکات لەسەر شتێك (حدث) و دەبێتە سێ بەشەوە:

١.ئەوەی کە عەلەم نەبێت و مەصدەری میمی نەبێت، وەك: (سَلام، كلام، عطاء) کە ئیسمە بۆ (أعطاء).

٢.ئەوەی کە (عَلَمْ) بێت، وەك: (سُبحان).

٣.ئەوەی کە میمی بێت، وەك: (مُطاب).

لە بەشی یەکەمدا: ڕاجیایەك هەیە، چونکە هەندێك بە عامیل عەمەل کەرە و هەندێك بە غەیرە عامیلی دەزانن و بەدەستەواژەیەکی تر لای کوفیەکان و بەغدادیەکان عامیلە و لای بەصریەکان عەمەل ناکات، وەك ئەم دێڕە شیعرە:

أكُفْراً بعْد ردّ الموتِ عنّي وبَعْدَ عطائكَ الْمائةَ الرِّتاعا.

ئایا ناشوکری بکەم، ناشوکرییەك، دوای ئەوەی کە تۆ ئەی (زوفەر)، مەرگت لەمن گێڕایەوە، و صەد حوشتری چاکت پێدام.

لەم نموونەیەدا (عطاء) عەمەلی کردووە، کە هەڵبەتە مەفعولی یەکەمی مەحزوفە، و مەفعولی دووەمی (المائة)یە، و تەقدیرەکەی بەم جۆرەیە: (وَ بَعْدَ عطائكَ أياي المائةَ الرّتاع).

بەڵام بەشی دووەم: واتە، ئەو ئیسم مەصدەرەی کە عەلەم بێت، بە تێکڕای سەرجەم زانایانی نەحو عەمەل ناکات.

وەك: - (سُبحان) کە عەلەمە، بۆ (تسبیح)!

- و (فجار) کە عەلەمە، و بۆ (فجرة)!

- و (حماد) کە عەلەمە، و بۆ (محمدة) هاتووە.

بەڵام بەشی سێیەم: ئەو ئیسم و مەصدەرەی کە میمی بێت لە ڕووی عەمەل کردنەوە، وەك خودی مەصدەر وایە، بۆیە ئیسمی حەدەث ئەگەر عەلەم بێت، وەك (فجار) کە عەلەمی جینسە، وەك (حماد) کە عەلەمە بۆ (محمد).

وە یاخود لەسەر وەزنی مەصدەری سیانی تاك (ثلاثي مجرّد) بێت، واتە لە ڕووی حەرفەوە، وەك حەرفەکانی فیعل بەرابەری پێناکرێت، بەڵام لەمەصدەردا بەم جۆرە نییە، بەڵکو بەرابەری پێدەکرێت لەگەڵ حەرفەکانی فیعلدا، وەك: (إغتسال) کە مەصدەری (أغتَسلَ)ـەیە.

بەڵام ئیسمە مەصدەرەکەی (غُسل)ـە، وەك: (أغْتَسلُ غُسْلاً).

لەم نموونەیەدا (غُسل) مەصدەری (ثلاثی مجرّد)ـە، بەڵام ئیسمی مەصدەر بۆ فیعلێك کە غەیری (ثلاثي مجرّد)بێت، هاتووە، و ڕوویداوە.

* * *

ومنه إِسم الفاعل، و يعمل عمل فعله المعلوم، نحو: أنا قاعد بالباب، و مانع كل خباب.

---

**ئیسمی فاعیل:**

کەکاری فیعلە ئاشکراو دیارەکە دەکات، وەك: (أناقاعد بالباب، ومانع كل خباب: من لە دەرگاکەدا دانیشتم) و ناهێڵم هیچ قۆڵبڕ، وفێڵبازێ بێتە ژوورەوە.

## ﴿باسی ئیسمیی فاعیل﴾

جۆری سێیەم لە عەوامیلە قیاسییەکان، ئیسمی فاعیلی پێ دەوترێت و ئیسمیی فاعیل دەلالەت لەسەر (ذات) دەکات، واتە ئیسمیی فاعیل، وەك مەصدەر دەلالەت لەسەر هاتنەدی و ڕوودانی شتەکان ناکات، بەڵکو تەنها دەسەڵاتی لەسەر هەستان بەکارەکە، و ئامرازی ڕوودانی شتەکە دەکات.

صیغەی ئیسمیی فاعیل لە (ثلاثي مجرد)دا، لەسەر وەزنی (فاعِل)ـە، وەك: (ضاربُ و ناصرٌ).

بەڵام صیغەی ئیسم فاعیل لەغەیری (ثلاثي مجرّد)دا، لەسەر وەزنی فیعلیی موضاریعی مەعلوم دێت، واتە: حەرفە موضاریعەکە دەکەین بە میمێکی مەضموم، و حەرفی پێش کۆتایی مەکسور دەکەین، و ئەگەر خۆی مەکسور بێت، ئەوا هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە، دەنا خۆمان مەکسوری دەکەین.

وە: (مُدخِل) کە لە (يدخل)، (مُستخرِج) کە لە (يستخرج) ئیشتیقاق کراون، و دەرهێنراون، وە ئیسمیی فاعیل وەك فیعلەکەی خۆی عەمەل دەکات، واتە ئەگەر فیعلەکەی لازم بێت، ئەوا تەنها پێویستی بە فاعیل دەبێت، و کاتێك کە موتەعەددی بێت، جگە لە فاعیل پێویستی بە مەفعول بِهِ، یش هەیە.

-ئیسمیی فاعیل لەکاتێکدا کە (أل)ی تەعریفی پێوەنەبێت، و بە مانای حالّ و داهاتوو (أستقبال) بێت، تەنها لەم حالّەتانەی خوارەوەدا، عەمەل دەکات:

١.پشت بە موبتەدایەك ببەستێت، واتە، لەدوای موبتەداوە بێت، وەك: (زَيدٌ ضاربٌ غُلامهُ عَمْرواً يومَ الجمُعَة).

(زيد): موبتەدایە. (ضاربٌ) خەبەرە، (غُلامُ): فاعیلی ضاریبە، و موضافە (هاء): موضاف اليه،یە. (عمرواً): مەنصوبەو مەفعول بە،یە، (يومٌ): ظەرفە و موضافە. (الجمُعه): ئیسمێكی موعەرڕەف بە (أل)ـە،و موضاف أليه، یە.

لەم نموونەیەدا ئیسم فاعیلی(ضاربٌ) ئیعتیمادی خستووەتە سەر موبتەداكە، كە (زيدٌ)ـە.

٢.لەدوای ئەلف و لامی مەوصولەوە بێت، وەك: (جائني الضّاربُ ابوهُ بكراً).

(جاءَ) فیعلە، (نون): ویقایەیە (یاء): منصوب بنزغ الخافض ، ئەلف و لام لە (الضّارب)دا، مەوصولەیەو لەجێی (الذي)یە، (ضارب): ئیسم فاعیلە، (أبو): فاعیلی ضاریبە، و موضافە، (هاء): لە مەحەللی جەڕدا موضاف أليه ،یە، (بكراً): مەفعول بە،یە، و ئەم ڕستەیە دەبێتە صیلە بۆ مەوصولەكە.

لەم نموونەیەدا: ئیسم فاعیل لەدوای ئەلف و لامی مەوصولەدا هاتووە، و هەر لە بەر ئەمەش كە عەمەلی كردووە، واتە وشەی (أبو)ی بینا لە سەر ئەوەی كە فاعیلە مەرفوع كردووە، و (بكر)ی بینا لەسەر ئەوەی كە مەفعولە مەنصوب كردووە.

٣.لەدوای مەوصوفەوە بێت، وەك: (جاء رجُلٌ ضاربُ أبوهُ غُلامُ).

(جاءَ): فیعلە (رجُل): فاعیلی (جاء)ـەیە، ومەوصوفە، (ضاربٌ): صیفەتە، (أبو) فاعیلی ضاریبە، (هاء): لەمەحەللی جەڕدا موضاف اليه،یە، (غلام) مەنصوبە و مەفعول بە،یە، و موضافە، (هاء) لەمەحەللی جەڕدا موضاف أليە، یە.

لەم نموونەیەدا ئیسم فاعیلی (ضارب) لەدوای مەوصوفەكە، كە(رجل)ـە، هاتووە!

٤.هەرکات ئیسمیی فاعیل لەدوای (صاحب الحال)ـەوە، هات، لەم کاتەدا دەبێتە عامیل، وەك (جائني زيدٌ راكباً فرسَهُ).

(جاء) فیعلە، (نون): ویقایەیە، (یاء): منصوب بنزع الخافض . (زيدٌ) فاعیلی (جاء)ـەیە.

(راکباً) حاڵە، (فرس) مەفعول بە،یەو موضافە، (هاء): موضاف الیە،یە.

٥.لەدوای ئیستیفهامەوە بێت، وەك: (أ ضاربٌ زيدٌ أخاهُ).

(أ): ئیستیفهامیەیە.

(زيدٌ) فاعیلی (ضاربٌ)ـە.

(أخا): مەفعول بە،یە، موضافە، (هاء): موضاف أليە،یە.

٦.لەدوای نەفی یەوە بێت، وەك: (ما قائمٌ زيدٌ).

(ما): نافیەیە. (قائمٌ) موبتەدایە؛ (زيدٌ): فاعیلەو سدّ مسدّ الخبر.

٧.ئیسمیی فاعیل لەدوای نیدائەوە بێت، وەك: (يا طالعاً جبلاً)، کە لەم نموونەیەدا، ئیسم فاعیل لە (جبلاً)دا عەمەلی کردووە، و ئەوی مەنصوب کردووە.

*ئیسم فاعیل لەکاتێکدا ئەلف و لامی پێوەبێت، بەموتڵەقی ئیتر بە مانای ماضی یان حاڵ یا داهاتوو بێت، هەر عەمەلی خۆی ئەکات، وەك: (مررتُ بالضّاربِ أبوهُ زيْداً ألآنَ أوْ غداً أوْ أمْسِ).

وە حاڵەتی موسەننا، و جەمعی ئیسم فاعیل لە ڕووی حوکمی عەمەلی (ئیعراب)ـەوە، وەك ئیسم فاعیلی موفرەد وایە، وەك:( الزّيدان ضاربان عمْرواً – الزّيدوُنَ ضارِبونَ عمْرواً).

* * *

ومنه إِسم المفعول، و يعمل عمل فعله المجهول، نحو:القوي العاقل ممدوح العمل، و يشترط في عملهما، معنى الحال، أو الإِستقبال، و إِعتمادهما على نفي، أو إِستفهام، أو موصوف، أو مبتدأ، أو ذی حال.

---

## ئیسمی مەفعول:

کە کاری فیعلە نادیارەکە دەکات، وەك: (القوي العاقل ممدوح العمل: کەسی بەهێزی ژیر، لە سەر کردەوەکانی ئافەرین دەکرێت)، بەڵام بۆ عەمەلکردنی بە مەرج گیراوە، کە مانای ئێستا (حال) یان داهاتوو (مستقبل)ـی، تیادا بفامرێتەوە، وە پشت بەستوو بێت، بە نەفی، یان ئیستیفهام، یان شتێکی (وەصفکراو: موصوف) یان موبتەدا، یان (خاوەن حاڵەت: ذي‌الحال).

## ﴿باسی ئیسمیی مەفعول﴾

چوارەمین جۆر لە عەوامیلیی قیاسیی، ئیسمیی مەفعولی پیێ دەوترێت، وە ئیسمیی مەفعول لەو فیعلەوە وەردەگیرێت، کە لەسەر کەسێك ئەنجام دراوە،و ئیسمیی مەفعول عەمەلی فیعلیی مەجهول ئەنجام ئەدات، وەك: (زيْدٌ مضْرُوبٌ غلامهُ).

وە لە ڕووی مەرجەکانی عەمەلکردنەوە، وەك ئیسمیی فاعیل وایە، واتە: ئیسمیی مەفعول لە حاڵەتێکدا عەمەل دەکات، و عامیلەکە بە مانای حاڵ و داهاتوو بێت، و ئیسمیی مەفعول، وەك ئیسمیی فاعیل لە کاتێکدا کە ئەلف و لامی پێوەبێت، بەڕەهایی (مطلقاً) عەمەل دەکات، وەك: (زيْدٌ مضرُوبٌ غُلامهُ الآن أو غداً أوْ أمْسِ)، وە هەروەها ئیسم مەفعول، وەك ئیسمیی فاعیل لە کاتێکدا ئەتوانێت عەمەل بکات و عامیل بێت، کە پشت ببەستێت بە کەسێك لەمانە: (مبتدا، صاحب الحال، موصوف، موصول، نفی ، أستفهام، نداء).

وەك: (أ مَضْرُوبٌ زيدٌ يومَ الجُمُعَةِ أمامَ الأميرِ ضرْباً شديداً في داره)!
(أ: ئیستیفهامیه )،(مضروب): مەرفوعە و موبتەدایە، (زيدٌ): نائیب فاعیلەو (سدّمسدّ الخبر)ـە، وە دەتوانرێت، کە (مضروب) بە خەبەری پێشکەوتە، و (زید) بە موبتەدای دواکەوتە دابنرێت.
(يومٌ) مەفعول فیە، یەو موضافە، (الجُمعة) موضاف أليە،یە، (أمام) ظەرفی مەکانە و موضافە، (الامیر): موضاف أليە،یە. (ضرباً) مەفعول موتڵەقە، و مەنصوبە، (شديداً): صیفەتە. (فی دارە): جارومەجرورە، و موتەعەللیقە بە (مضروب)، و موضافە، (هاء): موضاف الیە،یە.
لەم نموونەیەدا (مضروب): کە ئیسم مەفعولە، پاڵپشتیی خستۆتە سەر هەمزەی ئیستیفهامیە.
<u>نمونەیەکی تر:</u> (والْحَوضُ مَمْلوءٌ الماءَ)، حەوزەکە پڕە لە ئاو، (واو): عاطیفەیە، (الحوض): موبتەدایە (مملوء): خەبەرە، (ماء): تەمیزە، لەم نموونەیەدا ئیسم مەفعولی (مملوءٌ)، پاڵپشتیی خستوەتە سەر خەبەر لێ دراو، موبتەداکە، و پشتی پێ بەستووە.
وە ئیسمیی مەفعول بۆ لای نائیب فاعیلەکەی خۆی ئیضافە دەکرێت، وەك: (زيْدٌ مضْرُبٌ ابيهِ) لەم نموونەیەدا ئیسم مەفعولەکە بۆلای نائیب فاعیلەکەی خۆی (أبیە) ئیضافە کراوە.
ئەگەر بتەوێت، ئەتوانیت نائیب فاعیل بینا لە سەر ئەوەی کە لە مەفعول ئەچێت، نەصبەی بدەیتێ، و کاتێك کە نائیب فاعیل مەنصوب بوو، لەم کاتەدا نائیب فاعیلی ئیسمیی مەفعول ضەمیرێکی شاراوە دەبێت، وە لەو نائیب فاعیلەدا حاڵەتەکانی، (ڕەفع ، و نەصب، و جەڕ) دروستە.
لەحاڵەتی مەرفوع بووندا نائیب فاعیلە، و لە حاڵەتی مەنصوب بووندا، نائیب فاعیلەکە، ضەمیرێکی شاراوە دەبێت، و لە کاتی مەجرورکردنی دا موضاف الیە، دەبێت.

* * *

و منه الصفة المشبّهة: نحو: العاقل حسن سكوته، حسن كلامه، حسنت يقظته، حسن منامه، وشرط عملها شرط إسم الفاعل، لكنَّها لِلْإِستِمْرار.

باسی صیفەی موشەببیهە:

وەك:(العاقل حسن ركوته، حسن كلامه، حسن يقظته، حسن منامه: كەسی ژیر بێدەنگی، و قسەكردن، و بێداری، و خەوی باشە، و جوانە)، وە مەرجی عەمەلكردنی، هەمان ئەو مەرجانەن، كە لە ئیسم فاعیلدا هەن، واتە: لە سەر ئەو حاڵەتە بێت، بەڵام بەردەوامی تیادا بفامرێتەوە.

﴿باسی صیفەتی موشەببیهە﴾

جۆری پێنجەم لە عەوامیلە قیاسی یەكان، بە (الصفة المشبّه) ناوزەد كراوە، جا صیفەتی موشەببیهە بەو صیفەتە ئەوترێت، كە لە مەوصوفەكەدا (وەصف كراوە)كەدا، جێگیر بێت، وەك: (شريف)كە شەرافەت لە كەسی شەریف،دا جێگیرە، وە صیفەتی موشەببیهە لە فیعلی لازم (فیعلی ئەو كەسەی هەستان بە كارو فیعلەكە لەوەوەیە)، ئیشتیقاق ئەكرێت.
صیفەتی موشەببیهە بە هەستانی زاتێك، كەسێك، بە صیفەتێك (على سبيل الثبوت) دەلالەت دەكات، وە صیفەتی موشەببیهە بە موتڵەقی، وەكو فیعلەكەی خۆی عەمەل ئەكات، وە پێویست ناكات، صیفەتی موشەببیهە ببەسترێت بە كاتی ئێستا یان داهاتووەوە، چونكە كاتەكانی ئێستاو داهاتوو (حال و أستقبال) لە تایبەتمەندییەكانی ڕوودانی شتێك (حدوث)ن، و هەر لەبەر ئەمەش پێویست ناكات مەدلولی صیفەتی موشەببیهە لەگەڵ (زەمان: كات)دا بەكار بهێنرێت، چونكە مەبەستی ئێمە لە نمونەی (زيدٌ حسنٌ وجهُ): دەمووچاوی زەید جوانە، دا، بەردەوامی هەبوون و جێگیربوونی جوانی لەدەموچاوی زەیدا تیایدا دەفامرێتەوە.

وە هەروەها هەر وەك: (زَيْدٌ طيّبٌ أبوهُ: ) باوكی زەيد كەسێكی پاكە، (زيدٌ): موبتەدايەو مەرفوعە (طيبٌ) صيفەتی موشەببيهەيەو مەرفوعەو خەبەرە (أبو): مەرفوعەو فاعيليی طەييبە، و موضافە (هاء): لە مەحەللی جەردا موضاف أليه،يە، لەم نمونەيەدا صيفەتی موشەببيهە، وەك فيعلەكەی خۆی عەمەلی كردووە، و وەك وایە بگوترێت: (زيدٌ طابَ ابوهُ).

## جياوازی نێوان صيفەتی موشەببيهە و ئيسمی فاعيل:

١.صيفەتی موشەببيهە لە فيعليی لازم دروست دەكرێت، وەك:
(زيدٌ حسنٌ وجههُ)، كە لە فيعلی (حسن) دروست كراوە، بەڵام ئيسميی فاعيليش هەر لە فيعليی لازم دروست دەكرێت، وەك: (ذاهبٌ ، جالسٌ)، و هەروەها لە فيعليی موتەعەدديش وەك (ضاربُ ، آكلٌ) دروست ئەكرێت.
٢.ئيسميی فاعيل، وەك صيلەی (أل) دێتە ئاراوە، بەڵام صيفەتيی موشەببيهە نابێتە صيلەی ئەلف و لام، وەك: (هذا الضّاربُ زيداً).
٣.ئيسميی فاعيل لەعەمەلكردندا، پەيوەستە بەزەمانەوە، وەك: (زيدٌ ضاربٌ عمْرواً الآن أوْ غداً)، لەكاتێكدا كە صيفەتيی موشەببيهە بەبێ پەيوەست بوون بە كاتەوە عەمەل دەكات، وەك: (زيدٌ طيّبٌ أبوهُ).
٤.ئيسميی فاعيل لەگەڵ فيعلەكەی خۆيدا لەرووی عەمەلكردنەوە (لازم بون، يان موتەعەددی بوون)، جياوازی ناكات، بەڵام صيفەتيی موشەببيهە لە گەڵ ئەوەدا كە فيعلەكەی لازمە، نەصبە نادات، وەك ئەوەی كە ئيسميی فاعيليی موتەعەددی نەصبە ئەدات، هەڵبەت ئەمەش بە مەرج گەلێك و ئيعتيماد خستنە سەر وەصفەوە دەبێت، ئەو مەرجانەش كە لەبابی ئەعمالی فاعيل،دا ووتران ،بۆ نموونە، دوای نەفی يان ئيستيفهام يان موبتەدا و هاووێنەكانی بێت، وەك: (زيْدٌ حسنٌ الوجْهُ)، لەم نمونەيەدا (حسن) ئيعتيمادی خستووەتە سەر موبتەداو (اَلوَجْهِ)ی مەنصوب كردووە.

بەڵام مەنصوبکردنی مەعمولی صیفەتیی موشەببیهە لەم بابەدان بینا لەسەر حاڵەتی تەشبیهـ کردنی مەعمولی صیفەت لەسەر مەفعول، ئەمە ئەگەر مەعریفە بێت، وەك: (حسنُ الوجه)، و بینا لەسەر تەمیز بوون، دەکرێت، ئەگەر نەکیرە بێت، وەك: (زیدٌ حسنٌ وجهاً).

ئەمە بە پێچەوانەی مەنصوب بوون لە بابی (ئەعمالی ئیسم فاعیل)دا، کە بینا لەسەر مەفعولیەت کراوە، وەك: (زیدٌ ضاربٌ عمْرواً).

٥.صیفەتیی موشەببیهە هەندێ جار لەسەر وەزنی فیعلیی موضاریع بێت، وەك: (طاهِرُ القَلْبِ): (طاهر) لەسەر وەزنی (یطهر)، وە هەندێ جار لە سەر وەزنی فیعلیی موضاریع نایەت، وەك: (جمیلُ الظّاهر) کە (جمیل) لە سەر وەزنی فیعلیی موضاریع نییە.

بەپێچەوانەی ئیسمیی فاعیلەوە کە بە جۆرێك لەجۆرەکان (نوعاً) لە سەر وەزنی فیعلیی موضاریع دێت.

* * *

**ومنه إِسم التفضيل: و هو ما دَلَّ على حدثٍ، و زيادةٍ فيه، نحو: زيد أعلم من عمرو، أي: له علم زائد على عمرو، و يعمل في الفاعل الضمير المستتر كهذا المثال، و لكن لا يعمل في المفعول به الصريح قطعاً، و لا في الفاعل الظاهر، إِلاّ إِذا كان بمعنى الفعل، كما في، نحو: (ما رأيتُ شخصاً أحسن في عينه الكحل منه في عين الحبيب)، مما وقع إِسم التفضيل صفة لموصوف واقع بعد النفي، وكان لِفاعله إِعتباران يكون فيه مفضلاً بأحد الإِعتبارَيْنِ، و مفضلاً عليه بالإِعتبار الآخر، كالكحل في مثالنا، فَإِنَّهُ مُفَضَّل بِإِعتبار كونه في عين الحبيب، و مُفَضَّل عليه بِإعتبار كونه في عين الشخص الآخر، و ذلك لِأَنَّ النَّفي فيه يتوجَّهُ إِلى الزيادة المستفادة من صيغة التفضيل، أي: ما رأيت شخصاً زاد حسن كحل عينه على حسن كحل عين الحبيب، بل كان متساويا لكحل عينه، أو أقلّ منه، ومقام مدح حسن، كحل عين الحبيب، يأبى عن المساواة، فيبقى إِحتمال كون حسن كحل عينه، أَقَلَّ من حسن كحل عين الحبيب، فَيُؤَوَّل الكلام إِلى قولك:(ما رأيت شخصاً يحسن الكحل في عينيه، كحسنه في عين الحبيب)، وذلك معنى الفعل فيعمل عمله.**

---

- <u>باسی ئیسمی تەفضیل:</u>

ئەوەیەکە دەلالەت دەکات، لە سەر ڕووداوێک، بەلام زیادە ڕەوییەکی تیادایە، وەک: (زید أعلم من عمرو: زەید لە عەمر زۆر زاناترە)، واتە زانستی زەید زیاترە لە زانستی عەمر، وەضەمیرێکی شاراوە عەمەل دەکات لە فاعیلەکەدا، وەک نمونەی ڕابردوو، بەلام ئەوەشە بزانە کە بە هیچ جۆرێک عەمەل ناکات لەمەفعول بِهِ ڕاستەو خۆدا، وە عەمەل ناکات لە فاعیلی ئاشکرادا، تەنها لە کاتێکدا نەبێت کە ئەو فاعیلە مانای فیعلی تیابفامرێتەوە، وەک: (مارایت شخصا احسن فی عینه الکحل منه فی عین الحبیب: کەسم نەدیوە کە کل لەچاویدا هەیە جوان بێت، هێندەی ئەو جوانیەی کە لەچاوی

خۆشەویستەکەمدا بە هۆی کلەوە هەیە»، کە لێرەدا ئیسمی تەفضیل کەوتووەتە جێگایەک کە بووەتە ئاوەڵناو (صفـة) بۆ کەسێک یان شتێک، کە لەدوای (نەفی)یەوە، هاتووە، وەفاعیلەکەی لێرەدا دووحاڵەتی هەیە، حاڵەتی یەکەمیان ئەوەیە کە لە لایەکەوە زیادە حسابی بۆ کراوە (مـفـضل)ە، وە لە ڕوویەکی ترەوە زیادە حسابی بە سەر داکراوە (مـفـضل علیه)یە، وە، (کل) لەو نموونەیەماندا کە ڕەشکەرەوەی چاوە، لێرەدا (مـفـضل)ە، واتە حسابی زیاتر بۆ کراوە، چونکە چووەتە چاوی خۆشەویستەکەوە، وەلە لایەکیتریشەوە حسابی زیادە، بە سەردا کراوە، چونکە دەچێتە چاوی خەڵک و کەسیتریشەوە.

**(ئیسمی تەفضیل:)**

**لەم ڕیزبەندییەی عەوامیلیی قیاسی، (أسم تفضیل)یش دێت، ئیسم تەفضیل ئەو ئیسمەیە کە لە فیعلەوە موشتەق دەکرێت، و دەلالەت دەکات لە سەر ئەوەی کە ئەو مەوصوفە بە سەر مەوصوف گەلێکی تردا باڵاترە، و بە دەستەواژەیەکی تر، هەر کات بمانەوێت صیفەتێك بە سەر چەند صیفەتێکی تردا زاڵ بکەین، و باڵاتر دابنێین، ئەوا ئیسمیی تەفضیل لە موزەککەردا (أفْعَلُ)، وە لە (مؤنث)دا، (فُعلی)ی بۆ بەکار دێت، وە سەرجەم فیعلەکان نابنە خاوەنی حاڵەتی ئیسم تەفضیل بوون، ئیسمیی تەفضیل زیاتر لە فیعلی (ثلاثي مجرّد) دروست دەکرێت، وە (فعلی) کە لەسەر ڕەنگ و عەیب دەلالەتی کرد، ئیتر ئیسم تەفضیلی لێ نابێت، وەك: (زیدٌ افضَلُ النّاس). یاسا و ڕێسای گشتیی لە ئیسم تەفضیلدا، ئەوەیە کە بۆ فاعیلەکە باس بکرێت، و لەسەر ئەو بوترێت، هەر وەك نمونەی لەسەر وترا، وەك: (زیدٌ افضل الناس) بەڵام هەندێ جاریش بۆ مەفعول بِهِ، دێت.**

***ئیسمیی تەفضیل لەسەر سێ شێواز دێت:**

**١.ئیسمیی تەفضیل ئیضافە دەکرێت، وەك: (زَیْدٌ افْضلُ القَوْمِ).**

**٢.ئیسمیی تەفضیل بە ئەلف و لامەوە دێت، وەك: (زَیْدٌ الأفضَلُ).**

٣.ئیسمیی تەفضیل لەگەڵ حەرفی جەڕی (مِن)دا دێت، وەك: (زَيْدٌ افضَلُ من عمْروٍ).

لە سەرجەم ئەم سێ شێوازەدا، (ئیضافە بە ئەلف و لامەوە هاتن، لە گەڵ حەرفی جەڕدا هاتن، ئیسمیی تەفضیل ضەمیری موستەتیرە کە بینا لە سەر فاعیلیەت مەڕفوع دەکات، وە ئیسمی تەفضیل لە ضەمیردا عەمەل دەکات، و لە ئیسمی ظاهیردا عەمەل ناکات، مەگەر لەم نمونەیەدا: (رَأيتُ رَجُلاً أحْسَنُ فِي عَيْنِهِ الكُحْلُ منه في عين زيد).

هیچ پیاوێکم نەدیوە، کە کلی لە چاوان کردبێت، و لێی جوان بێت، هێندەی زەید، کە لە چاوی کردووە، و پێوەی جوانە!

هەڵبەتە عەمەلکردنی ئیسمیی تەفضیل لە ئیسمیی ظاهیردا پەیوەستە بەچەند تایبەتمەندییەکەوە، بەو مانایەی کە لە هەر جێگایەکدا ئیسمیی تەفضیل لەدوای نەفی هات، و مەوصوفەکەیش نەکیرە بوو، دەبێت ڕەفعە بدات بەو ئیسمە ظاهیرە، کە ئەو ئیسمە ظاهیرە بەسەر خودی ئیسم تەفضیلەکەشدا تەرجیح درابێت، لەم نموونەیەدا هەر (کل)ـەکە، بەسەر خودی خۆیدا پلەی باڵایەتی بۆ دانراوە، دوو کەس کلیان ڕشتووە، بەڵام کل ڕشتن و چاو ڕشتنی یەکێکیان کە زەیدە، لەهی ئەوی تریان جوانترە.

وە هەروەها وەك: (هذا بُسْراً أطيَبُ منْهُ رُطباً).

(بُسْر) ئەو خورمایەیە کە کەمێك زەرد بووە، بەڵام هێشتا ماویەتی پێبگات.

لەحاڵەتێکدا کە (بُسر)ـە، باشترە لە حاڵەتێك کە هێشتا (رُطبْ)بێت.

(ها) تەنبیهە.(ذا) لفضاً، أسم أشارة، مبنى على السكون، فى محل رفع مبتدأ.
(بُسراً): حاڵە (أطْيبُ) خەبەر، مەڕفوع. (من) جارو مەجرورە، و ظەرفی لەغوە، و موتەعەللیقە بە (أطيب) و مەفعولی بە، واسیطەیە، (رُطباً): حاڵە، لە ضەمیری(منه)، لەم نمونەیەدا (أطْيبُ): ئیسمیی تەفضیلەو ضەمیرە موستە تیرەکەی بینا لە سەر ئەوەی کە فاعیلە مەڕفوعی کردووە.

* * *

**ومنه الظرف والجار والمجرور: و يعمل عمل فعله بشرط الأِعتماد على ما مرَّ في أِسم الفاعل، نحو: الأيمان في القلب بهاؤه، وفي الوجه ضياؤه، وعند الله ثوابه، و يوم اللقاء جزاؤه.**

---

- باسي الظرف و جارومەجرور:

ظەرف و جارومەجرویش کاری خۆیان دەکەن، بە پێی ئەوفیعلەی لە ڕستەکەدا هاتووە، بەلاَم بە مەرجی ئەوەی کە لە ئیسم فاعیلدا باسمان کردو بە مەرج گیرابوو، وەک:

(الأيمان فی القلب بهاؤه، و فی الوجه ضیـا ؤه، و عندالله ثـوابه، و یوماللقاء جز ا ؤه: باوەڕ، نرخەکەی لە دلّدایە، ونیشانەو نورەکەی لە ناو چاوەاندایەو خێرەکەی لای خودایەو و پاداشتەی لەڕۆژی پەسلاَ ندایە).

* * *

**ومنه أَسماء الأفعال: و هي أَسماء تنوب عن الفعل في المعنى، و العمل وجاءت بمعنى فعل الأمر، و الماضي، و المضارع، فالأوّل، نحو: رُوَيْدَ المديون، أَيْ: أَمْهِلْهُ، و بَلْهَ، نحو: بَلْهَ الجاهل أَيْ: أُتْرُكْهُ، و مَهْ، نحو: مَهْ عن الغَشِّ، أَيْ: كَفِّفْ عنه، و صَهْ، نحو: صَهْ عن اللّغو، أَيْ: أُسْكُت عنه، و عَلَيْكَ، نحو: عَلَيْكَ السَّعي، أَيْ: أَلْزِمْهُ، و إِلَيْكَ، نحو: إِلَيْكَ الباطل، أَيْ: أَعْرِضْ عَنْه، و دوُنَكَ: نحو: دوُنَكَ الحق، أَيْ: خُذْهُ.**

---

- <u>باسی (أسماء الأفعال):</u>

ئەو ئیسمانەن کە لە مانادا لە جێگای فیعل دادەنیشن، و وەک فیعلیش عەمەل دەکەن، وە لە سەر مانای فیعلی ئەمرو فیعلی ماضي و فیعلی موضاریع هاتوون، یەکەمیان: وەک: (روید):

نموونە: (رویدا المدیون: ای: امهله: واز لە قەرزارەکە بهێنە).

- (بَلْهَ): وەک: (بله الجاهل، ای: اترکه: واز لەنەفامەکە بهێنە).
- (مَهْ): وەک: (**مَهْ عن الغَشِّ**)، ای: کـفـف عنه: دەست لەگزی بازی هەڵگرە).
- (صَهْ) وەک: (صَهْ عن اللغو: ای: اسکت عنه؛ بێدەنگ بە لە قسەی پڕوپوچ).
- عَلَيْکَ: وەک: (علیک السعی، ای: الزمه: پابەند بە هەوڵ و تێکۆشانەوە).
- الیکَ: وەک: (الیک الباطل، ای: اعرض عـنـه: دژی شتی بێ مانا بە).
- (دونَکَ): وەک: (دونک الحق: ای: خـذهُ: دەست بە هەقەوە بگرە).

کەواتە: (روید) بە مانای (امهله) هاتووە، و (بَلْهَ) بەمانای (اترکه) هاتووە، و (مَهْ) بەمانای (کفف عنه) هاتووەو، (صَهْ) بە مانای (اسکت عنه) هاتووە، و (علیک) بە مانای (الزمه) هاتووە، و (إلـیـکَ) بە مانای (أ عـرض عنه) هاتووە.

**ويأتي بمعناه قياساً صيغة فَعالِ، بفتح الفاء، و كسر اللام، مِن الثلاثي المجرّد، نحو: نصار زيد، أيْ: أنصره، و علام واجبك، أي: أعلمه.**

**و الثاني: هَيْهاتَ، نحو: هَيْهاتَ الأمر، أيْ: بَعُدَ، و شَتَّانَ، نحو: شَتَّانَ الطمع والشرف، أيْ: اِفْتَرَقا، و سَرْعانَ، نحو: سَرْعانَ ذا اِهالةً، أيْ: سَرُعَ.**

**و الثالث: وي، نحو: وي مِن الايام، أيْ: أَتَعَجَّبُ مِنها، و أُفّ، نحو: أفّ عن صحبة البليد، أيْ: أَتَضَجَّرُ مِنها.**

---

وە هەندێ جار لە ڕووی قیاسەوە، (نەک لە ڕووی (سماع) بیستنەوە، ئەوەی لە سەر وەزنی (فَعالِ) هاتبێت، بە فەتحەی (فاء) و کەسرەی (لام)، لە سیانی (ثـلاثـي مجرد) دا، هەر بە ئیسم فاعیل هاتوە وەک: (نَـصا رِ زید)، کە (نـصا ر) بە مانای ( أ نـصر ه ) هاتووە، واتە سەری بخەو هاوکاری زەید بکە، و هەروەها وەک: (علام واجبک: ای اعلمه: فێری ئەرکەکانی خۆت ببە)، کە (عَلامِ) بە مانای (اعلم) هاتووە.

**دووەم:** (هیهات)، وەک: (هیهات الأمر: ای بعد) کارەکە دوورکەوتەوە، کە (هیهات) بە مانای (بعد: دوورکەوتنەوە) هاتووە. وە (شتان) وەک: (شتان الطمع والشرف: ای افترقا): (چاو چنۆکی و ڕەوشتداری دوورن لە یەکترەوە، کە (شتان) بە مانای (افترق) هاتووە، وە (سرعان) وەک: (سرعان ذا اهاله: ای سرع) بەرخەکە زوو قەڵەو بوو، کە (سرعان) بە مانای (سرع) هاتووە.

**سێیەم:** (وی) وەک: (وی من الأيام: ای اتعجب منها؛ وای لەم ڕۆژانە، واتە: سەرم لێیان سوڕ دەمێنێ، وتووشی هیستریام دەکەن)، کە (وی) بە مانای (اتعجب) هاتووە، وە هەروەها ( أ فّ)، وەک: (اف عن صحبة البليد: ای: **أتَضَجَّرُ** منها: ئۆف وبێزاری لە هاوڕێیەتی خوێڕوو! کە (اف) بە مانای (**أتَضَجَّرُ**: بێزاری)یە.

## ﴿ (أسماء الأفعال) ﴾

***چەند ئیسمێکن بە (أسماء الأفعال) ناو دەبرێن:***

*(أسماءالأفعال) ئەو وشانەن، کە لە ڕوی عەمەلو ماناوە، لە جێگای فیعل دادەنیشن، وە هەر یەکە بە هاوڕێکی ماناکەی خۆی وەك فیعل عەمەلێکی هەیە، واتە: ئەگەر فیعلەکە لازم بێت، تەنها فاعیل و ئەگەر موتەعەددیش بێت بە مەفعول بە،یەوە، ڕازی دەبێت، وە مەبەست لە بەکار هێنانیان لە جێگای فیعل دا، کورت بڕی، وشت لە خۆ گرتن(تَضَمُّن)و موبالـەغە تیادا کردنیانە

وە (أسماءالأفعال) چەند جۆرێکن، هەندێکیان (بناء) لەسەر فاعیلیەت ڕەفعە دەدەن، هەندێکیان (بناء) لەسەر مەفعولیەت نەصبە دەدەن، وە هەندێکیان بە ڕەفعەو بە نەصبە کار دەکەن.

*(ڕەفع کەرەکان دوو جۆرن):

یەکەمیان: ئەوەیە کە کار لەسەر (ضمیر) دەکات و (ضمیر) دەبێتە فاعیل بۆی. وەك (آمین) کە (اسم فعل)ە، واتە (وەلأمان بدەرەوە).

(هیت): ئیسم فیعلەو واتە: (خێرابە).

### ﴿ دەربارەی(هَیْتَ) ﴾

*دەربارەی(هَیْتَ)چەند شێوازێك هێنراوە، ئەهلی مەدینەو شام (هِیتَ) بەکەسری هاء و فەتحەی تاء دەخوێننەوە، و ئیبن کە ثیر،( هَیتَ) بە فەتحی هاء و ضە می تاء دەخوێنێتەوە، و ئەوانی تریش (هَیتَ)ە یان، بە فەتحەی هاء و تاء خوێندوەتەوە وە لە (أمام علي و أبي رجاء و أبي وائل و يحى بن وهاب)ەوە نەقلّ کراوە کە (هِئْتُ)بەهەمزەو ضە می(تاء)ەوە، خوێنراوەتەوە، وە هەر ئەم خوێندنەوەیەش بەکەمیێ: جیاوازیەوە لە (أبن عبّاس و عِكرمة و مجاهدو قتادة)ەوە گێڕدراوەتەوە. وە لە خوێندنەوەیەکی تردا کە لە ئیبن عەبباسە وە نەقلّ کراوە (هَیتِ)بە فەتحەی هاء کەسرەی(تاء)ە، وە ئەم

خوێندنەوەیەش لە (أبو الأسود)و(أبن أبي أسحاق)و(أبن محيصن)، (عيسى الثقفي)يەوە گێردراوەتەوە.

وە خوێندنەوەی سێیەمیش کە لە ئیبن عەبباسەوە وەر گیراوە، (هيت لك) لەسەر شێوەی فیعلی ماضی‌یە، وە دەربارەی دروستی و ساغی ئەم خوێندنەوانە (زجّاج)گوتویەتی: لە (هيت لك)دا چەند لوغەیەك هەیە، کە باشترنیان (هَيْتَ لك) بە فەتحی هاو و (تاء)ە چونکە ئەمە خوێندنەوەی مەشهورە، وە مانای ( هَيْتَ: واتە: وەرە و نزیك ببەرەوە)، جا هەر جۆرێك بێت، ئەمە ئیسم فیعلە، و حەرەکەی کۆتاییەکەیش لەبەر خاتری(ألتقاء ساكنين)ە ،کەوایە.

(قط) واتە کۆتایی پێ بێنە، وەك" أعطيته درهما قط"، واتە:" درهەمێکم پێدا، و ئەم درهەمە بە بەس (کافی) بزانە". واتە: بە درهەمێك ڕازی بەو بێ دەنگ بە.

(فاء)ی (فقط) جەزائیەیە، واتە (جزاء)ە بۆ شەرتێکی مەحذوف، کە ئەصڵەکەی (إذا أعطيته درهما فقط) کە ئەم (فاء)ە، جوابی (إذا)یە.

وە (أف) بە واتای (سەخت گیریی) دێت، وەك (ولا تقل لهما أف) واتە: شتێکیان بەرامبەر مەڵێ کە سەخت گیر بێت و پێی دڵ شکاو بن.

(وی، واها، وأها) بە مانای (سەرسوڕمان) دێن، وەك: (ويكأنه لا يفلح الكافرون) سەرم سوڕ دەمێنێ کە کافران سەرناکەون.

(فراء) کە یەکێکە لە زانایانی نەحو ئەڵێ: ئەصڵی (ويكأن) (ويلك) بووەو (لام)ەکەی حەذف بووە.

وە (واها لك ثم أها) سەرم لێت سوڕ دەمێنێ و دیسانەوە سەرم لێت سوڕ دەمێنێ.

بەشی دووەم لە (أسماء الأفعال) ئەوانەن کە عەمەل دەکەنە سەر ئیسمی ظاهر، وەك (هيهات الأمر) (هيهات): واتە دوورکەوتەوە. کە (الأمر) فاعیلی (هيهات)ەو ئیسمی ظاهرە.

(شتان) وەك (شتان زيد وعمرو) واتە: جیا بوونەوە، واتە نێوانی زەید وعەمر جیایی تیایدا ڕووی دا.

– (سرعان) واتە :(سەریعی)، (زيد): فاعیلی (سرعان)ەیە، وەك (سرعان ذا أهالة).

بەشی دووەم: ئەوانەن کە (بناء) لەسەر مەفعولیەت، نەصبە دەکەن، وەك (روید زیدا) واتە: (وازی لێ بێنە)، کە (زیدا)ی مەنصوب کردووە، وە مەفعولیەتی ، بەلاّم (رویدا) لە (أمهلهم رویدا)دا (أمهل): فیعلی ئەمرە. (هم): مەفعول (رویدا): مەصدەرە. واتە :(مفعول مطلق)ە، بۆ (أمهل).

وە لە (ساروا رویدا)دا (رویدا): حالە، چونە ئەصلّەکەی (ساروا مرودین). کە (مرودین) ئیسم فاعیلە.

یاخود (نعت: صفەت)ە، چونکە (ساروا سیرا رویدا) کە (رویدا) صیفەتە بۆ (سیرا) کە لە لەفزداباس کراوەو دەربڕراوە.

(علیك) واتە: پێوەی پابەند بە. وەك: (علیك بصلاة اللیل) بە شەو نوێژەوە پابەند بە.

(بلە) واتە: واز بێنە (بلە زیدا) واز بێنە لە زەید. وە لە ڕستەی (بلە زید)دا، (بلە)مەصدەرەو موضاف کراوە بۆ لای زەید.

(دونك): واتە بیگرە وەك : "دونك زیدا": زید بگرە.

(أمامك) واتە پێشی بخە. (زەید پێشی خۆت بخە).

(حیهل) واتە: وەرە، وەك: (وەرە تریت بخۆ)

(ها): واتە بیگرە، (هاؤم اقرأوا کتابیة) کتێبەکانتان بخوێننەوە.

* "ها": اسم فعل. "أنتم": فاعل. " اقرأوا": فعل أمر. "و": فاعل.

"کتاب": مفعول به وهو مضاف. "ي": مضاف إلیه. (هاء): سکت.

*(ها: بگرە): وەك: ( ها دِرْهَماً: أيْ: خُذْهُ) درهەمەکەی بگرە. وە لە (مثنی و جمع مؤنث)دا دەوترێت (هاؤما)،(هاؤم)،(هاء)، (هاؤُما)،(هاؤُونَّ)،، وەك: (هاؤُ اقْرَؤا کِتابِیَتهْ)و لە موفرەدی مؤنث و جەمع مؤنث دا دەگوترێت: (هاءیا أمْرَئَة)و ( هاؤُنَّ یا نِسْوَة)و هەمزە لە (هاء)دا، لە جێگای کافی (خطاب)دایە، وە ئەم هەمزەیە جاری وا هەیە، حەزف دەکرێن وە لە جیاتی شتە حەزف کراوەکە، کافی (خطاب)ی پێوە دەلکێت، وە شەش صیغەکەی بەم جۆرەیە : (هاكَ هاکُما: هاکُمْ: هاكِ: هاکُما: هاکُنَّ).

<u>سێیەم: ئەوانەی کە نەصبەو ڕەفعەش دەدەن، وەك:</u>

(هلم جرا) واتە: وەرە، بکێشە یەك جۆرە کێشان.

کە لێرەدا (تجر) حەذف کرابوو، بۆیە (جرا) مەفعول موتلەقی (تجر)ەیە، وەك:
(هلم شهداوكم) واتە شەهیدەکانتان ئامادە بکەن. لێرەدا:
(هلم) :(شهداوكم)ی مەنصوب کردووە.
- وە ئەو ئیسم فیعلانەی کە نەصبەو ڕەفعە دەکەن، وەك:
(نزال) کە لەسەر وەزنی (أنزل)ە: کە فیعلی ئەمرە.
(تراك) واتە (تەرك بکە)، کە (لامر) مەفعولی (تراك)ە.

**﴿ئەو ئیسم فیعلانەی کە لەسەر وەزنی (فعال)و بە مانای ئەمر کردنن﴾**

ئەو ئیسم فیعلانەی کە لەسەر وەزنی (فعال)و بە مانای ئەمر کردنن، لە کاتێکدا کە لە فیعلی (ثلاثی مجرد) وەرگیڕابن، ئەوانە (قیاس)ین.

وە لە هەندێ جێگادا، مەصدەرەی مەعریفە دەلکێت بە وەزنی (فعال)ەوە، وەك: (فجار) کە بەمانای (فجور) یان (فجرة) دێت، وە هەر بەم جۆرەش کاتی وا هەیە، صیفاتی (مؤنثة) دەلکێن بە (فعال)ەوە، بەو مەرجەی کە بینە مونادا، وەك: (یا فساق) کە بوەتە صیفەت بۆ مؤنث (فاسقە)، وە (یا لکاع) کە بەمانای (لاكعة)یەو (لاكعة)یش صیفەتە بۆ مؤنث.

وە جاری وا هەیە کە عەلەمی زاتی مؤنث، (علم الأعیان المؤنثە) دەلکێن بە (فعال)ەوە، وەك (فطام: کە ناوی ژنە)و لەسەر وەزنی (فعال) هاتووە، و (غلاب: کە ناوی ژنە) وە (حصار: کە عەلەمە بۆ ئەستێرەیەك) و لەسەر وەزنی (فعال) هاتووە.

جا بزانە (أسماء الأفعال) سێ بەشن:

١-یان مەعریفەن، وەك (نزال، بله، و امین) کە ئەمانە نابنە نەکیرە، بەڵکو بەردەوام مەعریفەن.

٢-یا نەکیرەن، وە نابنە مەعریفە، وەك (أها، واها).

٣-یان هەم ندکیرەن و هەم مەعریفەن، وەك (صة، مة، أف) کە (تنوین) یان چویە سەر وەك (صهٍ، مهٍ، أفٍ) نەکیرەن، کە ساکن بوون وەك: (صَهْ، مَهْ، أفْ) مەعریفەن.

*(نوّن): کە لە مەتنەکەدا هاتووە، واتە: تەنوینیان چوویە سەر.

*(عری): واتە خاڵی لە تەنوین.

## ﴿الباب الخامس: في التوابع﴾

وهي كلّ ثان معرب بإعراب سابقه من جهة واحدة، وهي خمسة أنواع:

النوع الأوّل: النعت: و هو تابع يدلّ على معنى في متبوعه، أو في متعلقه، فالأولّ، نحو: تعلم عند أستاذ صالح، والثاني : نحو: لازم مدرسة صالحاً أهلها.

فالنعت قسمان: و يسمّى الأولّ بالنعت الحقيقي، لِدَلالته على صفة ثابتة في المتبوع حقيقة، و يوافق متبوعه في الإِعراب، و الأِفراد، و التثنية، و الجمع، و التذكير، و التأنيث، و التنكير، و التعريف، و يسمىّ الثاني، بالنعت السببي، لِأَنَّهُ لا يَدُلّ على صفة ثابتة في متبوعه، بل يدلّ على صفة ثابتة في متعلّقه، و ملابسه، فإِنَّ الصلاح ليس صفة للمدرسة، و إِنّما هو صفة لِأَهْلها، و سُكانها، لكن لّما كان الأهل أهل المدرسة، حصل لها بسبب ربط الأهل بها صفة إِعتباريّة هي كونها صالحة الأهل.

---

باسی پێنجەم: تەوابیع

(توابع: شوێن کەوتەکان) هەموو ئەو وشە دووەمینانەی، کە لە دواترەوە دێن، و کە ئیعرابەکەیان وەک ئیعرابی پێش خۆیان دەبێت، و دەبنە پێنج جۆر:

جۆری یەکەم، (ئاوەڵناو: النعت): کە ئەویش بریتی‌یە لەو ئیسمانەی کە حاڵەتێک لە شوێن کەوتەکەیدا زەقە، یاخود لەوشتەی داکە پێوەی پەیوەستە زەق دەکاتەوە، و دەسەلمێنێت، وەک: (تعلم عند أستاذ صالح)، کە صیفەتی پیاو چاکی و صەلاحەتی داوەتە لای مامۆستا کە، و

لە نمونەی (لازم مدرسة صالح اهلما)دا، صەلاحەتاکەی گریٚ داوە، و پەیوەستی کردووە، بە خەڵکەکەیەوە!

(نعت) دوو جۆرە: کە بەشی یەکەمیان (نعت)ی ڕاستەقینەیە، چونکە دەلالەت دەکات لە سەر صیغەیەکی جێگیر بە شێوەیەکی ڕاست، و دروست لە شوێن کەوتەکەی‌دا، وە صیفەتەکە و صیفەت بۆ دانراوە کە، لە سەرجەم حاڵەتەکانی ئیعرابدا هەر لە (موفرەد) بوون،و (موسەننا) و (جەمع) و (مذکر) بون، و (مؤنث) بوون‌دا، وەک یەکن، وە بەشی دووەمی (نعت) بە نەعتی سەبەبی، ناسراوە، چونکە دەلالەت دەکات لە سەر صیفەتێکی زۆر جێگیر لە شوێن کەوتەکەیدا، بەڵکو دەلالەتە دەکات، لە سەر صیفەتێکی جێگیر لەو شتەیدا کە لەو دەچێت، یا خود پێوەی پەیوەستە، چونکە لەنمونەکەی پێشتتردا (صالح بوون)، صیفەت نی‌یە بۆ (مدرسة)، بەڵکو صیفەتە بۆ خەڵکەکەی و دانیشتوانەکەی، بەلام لە بەر ئەوەی کە ئەو خەڵکە، وخەڵکی ئەو خوێندنگەیە کە چاکەکارن، بۆیە ئەو صیفەتە بۆ (مدرسة)کەیش، هاتەدی، چونکە خەڵکەکەی پێوە پەیوەستن، و چاکە کارانن!

**و يُوافق هذا النوع متبوعه في الأِعراب، و التنكير، و التَّعريف، لا في غيرها كالتذكير، و التأنيث، و الأِفراد، و أَخويْه، إلاّ إذا تحوّل النعت من إسناده لِما بعده إلى أسناده لما قبله كأن تقول: لازم مدرسة صالحة الأهل.**

**و يأتي النعت مشتقاً، كما ذكرنا، أَو شبه مشتقّ كذي بمعنى : صاحب، تقول: تتلمذت على أستاذ ذي علم، اي: صاحب علم، وكصيغة النسبة، نحو: جائني رجل بصري، أي: منسوب إِلى البصرة، وقد توصف النكرة بجملة خبريّة مشتملة على ضمير رابط لها بموصوفها، نحو: جاءني رجل يحب أهل العلم.**

---

وە ئەم جۆرە نەعتە، لە ئیعراب، و (نەکیرە) بوون، و لە (مەعریفە)بوون، هاورِێکن، نەک لە شتەکانی‌تری وەک (مذکر) بوون و (مؤنث) بوون و موفرەدو موسەنناو جەمع بوون‌دا، تەنها لە کاتێکدا نەبێت کە ئەو نەعتە لە کاتی ئیضافة کردنی‌دا بۆ دوای خۆی بگۆڕدرێ بۆ ئیضافة کردنی پێش خۆێ، وەک ئەوەی کە بڵێت: (لازم مدرسة صالح الأهل)

وە (نعت) بە موشتە ققی، دێتە وەک لەو نمونانەی سەرەوە دەرکەوت، و یان لە سەر شێوەی موشتەق، (شبە مشتق)، وەک (ذي) بە مانای (صاحب خاوەن)، بۆ نمونە، (تتلمذت علي أستاذ ذي علم: لای مامۆ ستایەکی زانا خوێندومە)، (ذي علم: واتە: خاوەنی زانست).

وە هەروەها لە سەر شێوەی (نسبة: دانەپاڵ) دێت، وەک: (جائنی رجل (بصري) واتە خەڵکی بەصرە، وە هەندێ جار نەکیرە، بەهۆی ڕستەیەکی (خەبەری) ییەوە، وەصف دەکرێتە کە لە ڕستەکەدا ضەمیرێك هەیە، تا بە وەصف کراوەکەوە، دەیبەستێتەوە، وەک: (جائني رجل يحب أهل العلم).

**﴿(نعت ) و (صفه )یەك مانایان هەیە﴾**

(نعت ) و (صفة )یەك مانایان هەیە . هەروەك پێشەوا (**جلال الدین السیوطی**) وتویەتی: نەعت و صیفەت یەك مانایان هەیە . هەر چەندە جیاوازیان خستوەتە نێوانیانەوە، هەڵبەتە جیاوازییەکەشیان تەنها لە ڕووی ماناوە یە ، دەنا لە زاراوەی نەحودا ، (نعت ) و (صفة ) بەسەر یەکێك لە پێنج شوێن کەوتەکە (توابع الخمسة ) دا،دەبردرێت.

بەلام لە (خلیل ابن احمد ) ەوە، گێڕدراوەتەوە کە (ان النعت لا یکون الا فی محمود ة ان الوصف قد یکون فیه و في غیره )وە هەندێکیش وتویانە کە : (الوصف ماکان بالحال المتنقلة کالقیام و القعود و النعت بما کان فی خلق او خالق کالبیاض و الکرم ) جا هەر لێرەشدا دەچمە سەر ڕونکردنەوەیەك

**ڕونکردنەوە:** (نعت) یاخود ( صفة ) ئیسمێکە کە حاڵەت و چۆنیەتی ئەو ئیسمەی پێش خۆی کە بە(مۆصوف) ناسراوە ، ڕوون دەکاتەوە .

***صیفەت دوو جۆرە :***

یان صیفەتە بۆحاڵی مەوصوفەکە (موصوف : وەصف کراو ) واتە : دەلالەت دەکات لەسەر مەفهومێك کە لە خودی مەوصوفەکەدا هەیە . وەك : (جائنی زید العالم ) .

وەیان ئەوەیە کە صیفەت دەلالەت دەکات لەسەر مانایەك کە لەنێو موتەعەللیقی مەوصوفەکەدا بوونی هەیە .وەك: (جائنی زید العالم ابوه ) . کە لەم نمونەیەدا (علم) لە موتەعەللیقی مەوصوفەکەدا. کە باوکی زیدە بوونی هەیە . پێویستە ئەمە بزانرێت کە صیفەت لەڕووی (نکرة) بوون و (معرفة) بون و (مذکر ) و (مؤنث) بوون و هەروەها لەڕووی ( مفرد ) و (مثنی ) و (جمع ) بونەوە ، دەبێت لەگەڵ ئیعرابی مەوصوفەکەی خۆی دا هاوڕێك بن .

بەدەستەواژەیەکی تر دەتوانرێت بوترێت ، کە ( صفة ) لە چوار شتدا لە( ١٠) شتەکە ، دەبێت هاوڕێك و موتابیعی لەگەڵ مەوصوفەکەیدا هەبێت کە ئەو ( ١٠ ) شتە

بریتین لە(رفع – نصب – جر – معرفة – نكرة – مذكر- مؤنث – مفرد – مثنى – جمع ) بوون، وەك : "جاء رجل كاتب".

(جاء) : فیعلە (رجل): فاعیلە و مەوصوفە. (كاتب) صیفەتە،كە لەم نمونەیەدا (صفة) و (موصوف) لەچوار شتدا لەگەڵ یەكتری هاوڕێكن (رجل: مەرفوعە ) ، (كاتب:مەرفوعە)، (رجل : مذكرة) ،(كاتب: مذكرة) ، (رجل : نكرة) یە ، (كاتب: نكرة) یە ، (رجل : موفرەد)ە ، (كاتب: موفرەد)ـە.

* * *

## ﴿عطف البيان﴾

**النوع الثاني: عطف البيان، و هو تابع يوضح متبوعه بِإسم أِشتهر من المتبوع، نحو: آمنت بأبي القاسم محمدّ ﷺ، و يجب موافقته لمتبوعه في الأِعراب، و التنكير، و التعريف، و التذكير، و التأنيث، و الأِفراد، و التثنية، و الجمع، و الفرق بينه، و بين النعت، هو أَنَّ النعت يدلّ على معنى في متبوعه، وعطف البيان يدلّ على نفس المتبوع، و عطف البيان لا يجري أِلا في المعارف، و النعت يكون معرفة، و نكرة، لكن الكوفيين، على جواز كونه نكرة، كقوله تعالى:﴿مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ﴾النور.٣٥، وقوله:﴿مِنْ مَاءٍ صَدِيدٍ﴾أبراهيم.١٦**

---

جۆره دووه‌م: (عه‌طف به‌یان): بریتی‌یه له‌و ئیسمه‌ی که ئه‌وه‌ی له دواوه‌ی دێت ڕوونی ده‌کاته‌وه، به شتێکی‌تر که زیاتر ناسراوه. وه‌ک، (**آمنت بأبي القاسم محمدّ ﷺ**)،که (محمد)، عه‌طفه به‌یانه‌که‌یه، زیاتر ناسراوه، وه‌ک له(ابوالقاسم) که کونیه‌ی پێشه‌وای ئازیزه‌ﷺ، وه ده‌بێت هه‌ر دوکیان، له ئیعراب و نه‌کیره بوون و مه‌عریفه‌بوون و (مذکر) بون و مؤنث بوونه‌وه، و موفره‌د، و موسه‌نناو جه‌مع بونه‌وه هاوڕێك بن، وه جیاوازی نێوان (عطف بیان) و (نعت) ئه‌وه‌یه، که نه‌عت ده‌لالەت ده‌کات له سه‌ر بوونی مانا یه‌ک له‌و شته‌ی‌دا که به شوێن که‌وتووه‌که‌وه هه‌یه، به‌ڵام (عطف بیان) ده‌لاله‌ت ده‌کات له سه‌ر خودی بوونی مانایه‌ک له‌و شته‌ی‌دا که شوێنی که‌وتووه، به‌ڵام (عطف بیان) ده‌لاله‌ت ده‌کات سه‌رخودی ئه‌و شته‌ی که شوێنی که‌وتووه‌و مه‌تبوعی‌یه‌تی. وه عه‌طفه به‌یان له ناوه ناسراوه‌کان، (المعارف) ڕوونادات، به‌ڵام «نه‌عت"، له مه‌عریفه‌و نه‌کیره یشدا ڕووده‌دات، به‌ڵام، « کوفیه‌کان"، به‌م ڕه‌هایی‌یه دانیان پیادا نه‌ناوه، به‌ڵکو ڕودانی عه‌طف به‌یان له‌نه‌کیره‌دا ته‌نها لای کوفیه‌کان به پێویستیان زانیوه و هیچی‌تر، وه‌ک فه‌رمایشتی په‌روه‌ردگار (عزوجل) له :﴿مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ﴾نور ٣٥ — وه هه‌روه‌ها (من ماء صدید) ابراهیم. ١٦٠

**-عطف بیان: ئەو (تابع)ەیە کە (متبوع)ەکەی خۆی ڕوون دەکاتەوە، وە پەیوەندی ئەم و (متبوع)ەکەی، وەك پەیوەندی نێوان صیفە و مەوصوف وایە، وەك: (جاء زیدٌ**

أخوك)، هەرکات عەطف بەیان مەعریفە بوو، لەم کاتەدا مەتبوعەکەی ڕون و ئاشکرا دەکاتەوە، وەك: (آنّما المسيح عيسى ابن مريم رسول الله).

وە ئەگەر عەطف بەیان نەکیرە بوو، ئەوا بە مەبەستی (تخصيص) دێت: وەك (من ورائه جهنم و يسقى من ماء صديد) لەنموونەی یەکەمدا لەبەر ئەوەی کە مەتبوعەکە (المسيح) مەعریفە بوو، ئەوا (تابع)ـەکەی خۆی کە (عيسى)یە ڕوون و ئاشکرای دەکاتەوە، وە لە نموونەی دووەمدا لەبەر ئەوەی کە مەتبوعی (ماء)ە کە نەکیرە یە، تابیعەکەی خۆی (صديد) تەخصیص دەکات.

پێویستە ئەوە بزانرێت لەبەر ئەوەی کە لەزۆر کاتدا عەطف بەیان وبەدەل یەکێکن، وە کەمتر ڕوودەدات کە نەتوانێت عەطف بەیان بکرێت بە بەدەل و بەگریمانەیی لە جێگایدا دا بنرێت.

وە تەنانەت هەندێکیش وتویانە: (كلّما جاز أن يكون عطف بيانٍ جاز أن يكون بدلاً).

*گرنگترین ئەو جێگایانەی کە عەطف بەیان وبەدەل تیایاندا جیاوازن، ئەمانەی لای خوارەوەن:

١-بەدەل بۆی هەیە کە جوملە بێت، بەڵام عەطف بەیان نابێت جوملە بێت.

٢-بەدەلی نەکیرە لەمەعریفە و مەعریفە لە نەکیرە دروستە بەڵام عەطف بەیان دەبێت لەگەڵ مەتبوعەکەی خۆیدا هاوڕێکی و موتابیعی هەبێت.

٣-بەدەل لە جوملەی صەحیح دەبێت، بەڵام عەطف بەیان جوملەی صەحیح و تەواو نییە.

٤-ضەمیر نابێتە عەطف بەیان وە لە ضەمیریش عەطف بەیان دەرنابڕدرێت، بە پێچەوانەی بەدەل کە دەگونجێت، ضەمیر بێت، وە هەروەها تابیعی ضەمیریش بێت.

٥-عەطف بەیان لە نیەت و نیازدا نییە بەڵام بەدەل لە نیەت دا هەیە.

٦-بەدەل بۆی هەیە فیعل یان تابیعی فیعل بێت. لەکاتێکدا کە عەطف بەیان ناگونجێت، کە نە فیعل و نە تابیعی فیعل بێت.

* * *

النوع الثالث: التأكيد، و هو قسمان: لفظي، و معنوي، أمّا اللفظي: فهو تابع يقرر متبوعه بتكرار لفظه، أي: يدفع إشتباه الناس، و توهم أنَّ المتبوع مذكور بسبق اللسان، أو بالسهو، و يأتي في الإسم، و الفعل، و الحرف، و في المفرد، و الجملة، نحو: جائني جائني زيد، وجائنى زيد زيد، وأخش من الله من الله، والله واحد، الله واحد.

و أمّا المعنوي: فهو تابع يقرّر متبوعه بدفع توهم التجوز، أو عدم الشمول.

و يكون بألفاظ مخصوصة، كالنفس، والعين، وكلا، وكلتا، وكلّ، و أجمع، و جمعاء، نحو: جاءني الأمير نفسه، وجاءني الوزير عينه، و جاء الطلاب كلّهم، فإذا قلت جائني الأمير، توهم السامع أنّكَ تجوزت بالأمير عن خادمه، فإذا أتبعته بقولك، نفسه ، إندفع التوهم، و إذا قلت: جاءني الطلاب توهم السامع، أنّكَ تجوّزت بالطلاب عن بعضهم، و لـمّا قلت: كلهّم، أندفع ذلك.

---

بەشی سێهەم: (التاكيد): کە ئەمیش دوو بەشە، لەفزی وە مەعنەوی:

لەفزی: ئەوەیە کە بەدووبارە کردنەوەی ئەو لەفزە، جەخت لەسەر شتێک لە شوێن کەوتەکەدا دەکاتەوە، واتە، دوو دڵی خەڵکی دەڕەوێنێتەوە، وە ئەو گومانەیش لادەبات کە ئەو دوبارە کردنەوەیە بە تەتەڵەکردنی زمان ڕوی دابێت یا خود بە هەڵە هاتبێتە ئاراوە. وە ئەم حاڵەتی تەئکیدە لە ئیسم و فیعل و حەرفدا ڕوودەدات، وە هەروەها لەموفرەدو جوملەشدا بونی هەیە وەک: **جائني جائني زيد، وجائنى زيد**

**زيد، وأخش من الله من الله، والله واحد، الله واحد.**

بەڵام بۆ تەئكیدی مەعنەوی، ئەوتەئیكدەیە كە حاڵەتی ژێزپەڕبوونی ئەو شوێن كەوتەیە دەڕەوێنێتەوە، بەهاتنی ئەم تەئكیدە مەعنەوی‌یە، ئەویش ئەچێتە ژێر حوكمەكەوە، و بە لەفزگەلێكی تایبەت ئاماژەی بۆ دەدات، وەك (**النفس، والعين، وكلا، وكلتا، وكلّ، و أجمع، و جمعاء**).

(جمعاء)، وەك: (**جاءني الأمير نفسه**)، جا كە وتت (**جاءني الأمير**)، گوێگر وا گومان دەبات كە لەوانەیە مەبەستت (ئەمیر)، خزمەتكارەكەی ، بووبێت. بەڵام كە لەفزی (نفسه)ت هێنا، ئەو گومانەت ڕەواندەوە، وە كە گوێت لە (**جاءني الطلاب**) گوێگر وا گومان دەبات، كە ئەو قوتابی‌یانە هەندێكیان هاتوون، بەڵام كە گوتت (كلهم) ئەو گومانەت ڕەواندەوە، و هەمویان هاتوون.

* * *

النوع الرابع: البدل: وهو تابع مقصود بالنسبة، وهو على اربعة، أضرب:
*الأولّ: بدل الكلّ، نحو: أمنت من زيد أخيك.
*والثاني: بدل البعض، نحو: قبلت الأستاذ يده، وهما ظاهران.
*والثالث: بدل الأِشتمال، و هو بدل يكون بينه، و بين متبوعه علاقة بحيث يتشوق السامع للمتبوع إِلى ذكر بدله، نحو: أعجبني زيد علمه.
*والرابع: بدل البداء، أن ذكر المتبوع قصداً، ثمّ أضرب عنه إِلى ذكر أعلى منه، نحو: حبيبـي قمر شمس، و بدل الغلط، أن ذكر المتبوع سهواً، ثم تداركه بذكر البدل، نحو: رأيت زيداً فرساً.

---

جۆرە چوارەم: (بەدەل): کە ئەویش بریتی‌یە لەو ئیسمەی کە مەبەست تیایدا نیسبەت لێدان، لە شتێک بێتە لە هەموو شتەکە، یان لە بەشێکیی، یان بە هەر جۆرێکی‌تر، و بەدەل بەگشتی چوار بەشە:
١. بدل الكلّ، نحو: امنت من زيد اخيک.
٢. (بدل البعض) وەک: (قبلت الاستاذ يده) دەستی ماموستاکەم ماچ کرد، کە مەبەست هەندێک لە جەستەیەتی، ئەم دووجۆرە ئاشکران.
٣) (بدل الآشتمال) گشتگیر: کە بریتی‌یە لەوبەدەلەی کە لە نێوان خۆی و شوێنکەوتەکەیدا پەیوەندەیەک هەیە، کە کەس گوێگر حەز دەکات، کە ئەو بەدەلی شوێنکەوتەیەی باسمان کرد، بێتەدی، وەک، (اعجبنی زيد علمه).
چوارەم: (بدل البداء....) کە مەبەست تیایدا باس کردنی ئەو شوێنکەوتەیەیە، بەلام دواتر، بە هۆی نمونەیەکی بالاتر بە بەدەل، ڕستەکە دەڕازێنێتەوە، وەک: (حبیبی شمس).
وەبەدەلی بە هەلە، واتە باسی ئەو شوێنکەوتەیەی کە هەلە بێت، بەلام دواتر (بەدەل)ـە، ڕاستەکە دەهێنێت، وەک: (رایت زیدا، ئینجا .... فرسا)!
*بەدەل: لە زمانەوانیدا بەمانای (لە جیاتی:عوض)دێت،وە لە زاراوەدا (الأصطلاح): ئەو (تابع)ەیە کە بۆ ئەو حوکمەی کە ئەصلی مەبەستەکەیە گوتراوە. بەلام لە

(ظاهر)دا حوکمەکە دراوەتە پاڵ (متبوع)ەکەی وەك: (أعج بني زيد جودة)کە لەم نمونەیەدائەوەی کە جێی سەرسوڕمانە بریتی یە لە (جود زید: سەخاوەتی زەید)بەڵام بە گوێرەی ڕووکەش (ظاهر)ئەوەی کە جێی سەرسوڕمانە کە بە(زید)ە ئەوەی کە لە دوای (جود)ە، هاتوە بە بەدەلی (زید)هێناومانە.

* **بەدەل چوار جۆرە:**

١-بدل کل عن الکل: کە ئەو بەدەلەیە کە ماناکەی لەگەڵ (مبدل منه)دا هاوڕێك و موتابیق بێت، وەك:(مررت بأخيك زيد).

٢-بدل بعج عن کل: ئەمەیان ئەوەی کە بەدەلە لەگەڵ هەندێك(بعض)یان بەشێك (جزء)ێکی(مبدل منه)دا موتابیق بێت وەك: (قرأت الكتاب كله).

٣-بدل الأشتمال: وەئەگەر بەدەل یەکێك لە موعەللەقاتەکانی (متبوع)ە کەی خۆی بێت، ئەوە (بدل الأشتمال)ە. وەك: (أحِبُ خطابا عِلمَهُ و دينَهُ و شُجاعَتَهُ)ـە.

٤-بدل المُباينْ:- کەسیّ بەشە: (أضراب-نِسْيانْ-غَلَطْ).

أ-بَدَلْ الأضْراب: ئەوەیە کەسی قسەکەر (متکلم)، (بَدَلْ)و(مُبْدَلُ مِنْهُ)لە ڕووی مەبەست و ویستی خۆیەوە باس بکات. وەك: (أكَلت الخبز لحماً) کە (متکلم) لە قۆناغی یەکەمدا، مەبەستی ئەوەیە کە هەواڵی خواردنی نان بدات، و دواتر ئە وەیشی بۆ دێت و حاصڵ دەبێت.

و (لحماً)یش دەدرکێنێت، تا شان بە شانی نانە کە خەبەر لە خواردنی گۆشتەکەیش بدات، وە باشتریش وایە کە (تابع) بەهۆی حەرفی (بل)ەوە ،بهێنرێت وەك: (أكلتُ الخبز بل لحماً).

ب-بدل النسيان: ئەوەیە کە موتەکەللیم لە قۆناغی یەکەمدا مەبەستی (مبدل منه)ەکەیە، جا پاشان بۆی دەردەکەوێت کە بە بیّ ئاگایی (سهواً) وتویەتی، بۆ نمونە: بەو گومانەی کە (زيد) کەسێکی تاوانبارە دەڵێت: (أضرب زيداً) جا لەدواییدا تێئەگات کە (زيد) تاوانبار نەبووە، و بەڵکو (عمرو) تاوانبارەکەیەو ئەم بێئاگابووە.

ت:بدل الغلط أو بدل المباين: کاتێك کەکەسێك شتێکی وت و هەڵە بوو، بۆ لابردنی ئەو هەڵەیە (بدل)ێك دەهێنێت. وەك (جائني زيدٌ الفرس) کە موتەکەللیم لەسەرەتاوە مەبەستی (فرس) بووە، بەڵام بەهەڵە (زيد) هاتووە بەسەر زمانیدا، وە ئەم جۆرە بەدەلە، بە (بدل)ی (غلط) ناسراوەو لەکەسی (فصیح)دا ڕونادات.

دەربارەی بەدەل، لە ﴿**شەرحی هیدایە**﴾دا، نووسراوە، کە، بەدەل: ئەو تابعەیە کە بۆ لای نیسبەت دەدرێت ، ئەوەی کە نیسبەت دراوەتە لای متبوعەکەی، بەڵام ( تابع ) مەبەستە ئەصڵیەکەیە، نەك ( متبوع)، وەك: (جائنی أخوك علی ) کە (علی ) بەدەلە بۆ (أخوك)، وە ( أخوك ) مەبەستی ئەصڵی نیە ، بەڵکو مەبەستی ئەصڵی ( علی ) یە ، وە ( بدل ) چوار بەشە :

یەکەم: بە دەلی ( کل لە کل ) ئەوەیە ، کە ( تابع و متبوع ) یان ( مبدل و مبدل منه ) وەك یەکن، وەك: (جائنی زيد اخوك)، هات بۆ لام زەیدی برات ، کە ( زید و برا ) هەر یەکێکن ، کە ( أخوك ) بەدەلـــــــی ( زید )ـە .

دووەم: (بدل بعض) لە (کل) ئەوەیە کە هەندێکە لە ( مبدل منه) وەك: (ضربت زيدا رأسه ) : کە ( رأسه ) بدلە بۆ ( زیدا ) ، و ( رأس ) هەندێکە لە لاشە .

سێیەم: ( بدل الأشتمال ) ئەوەیە کە نە وەك ( مبدل منه ) وایە ، وە نە هەندێکیەتی ، بەڵکو پەیوەستە بە ( متبوع )ـە وە ، وەك: ( سلب زيد ثوبه) کە (ثوبه)، بدلی ( زید )ـە ، کە ( ثوب ) نە لە ( مبدل منه ) یە ، و نە هەندێکیەتی ، بەڵکو شتێکە پەیوەست بە (زید)ـەوە، کە مەتبوعەکەیە، وە ( أعجبنی عمرو علمهُ ) وەك نمونەی یەکەم وایە .

چوارەم: ( بدل الغلط) هەڵە: ئەوەیە کە دوای غەڵەتەکە دێت ، وەك (جائنی زید جعفر)، جەعفەر: بەدەلە بۆ (زید) کە (مبدل منه)یەکی غەڵەتە، وە هەر وەها (رأيت رجلا حمارا ) وەك ئەو وایە .

وە ( بدل ) ئەگەر ( نكرة ) بوو ، بۆ ( معرفة ) يەك، ئەوا پێویستە وەصف بكرێت، وەك: ئەم ئايەتە (بالناصية، ناصية كاذبة) كە ( ناصيه ) ی دووەم (بدلی كل لە كل )ـە، بۆ (ناصيەی) يەكەم ، كە ( نكرة )يە، لە بەر ئەوەی كە (مبدل منه ) معرفەيە، ( بدل )ـەكە، وەصفكراوە بە هۆی ( كاذبة)ـەوە .

وە بە پێچەوانەوە ، واتە ( مبدل منه ، نكرة ) و ( بدل ، معرفة ) بوو، صيفەتی ناوێت، وەك: ( جائني أخ لك زيد ) كە ( زيد ) ( بدل )ـە بۆ ( أخ ) نكرەيە و صفەتی ناوێت .

وە ئەگەر ( متجانسين ) واتە : هەر دووك ( معرفة يان نكرة ) بوون، صفەتی ناوێت ، وەك ( ضرب زيد أخوك عليا ) كە ( أخوك ) بدلی ( زيد )ـە و معرفەيە ، وە ( زيد ) يش معرفەيە ، كە ( أخ ) بە هۆی كافەوە ( معرفە ) يە ، بۆيە صفەتی نەويستوە .

* * *

*النوع الخامس: عطف النسق، أي المعطوف بحرف تجعل المعطوف على نسق المعطوف عليه، وعلى نهجه في الإِعراب.

وحروف العطف عشرة: الواو، وهي لمطلق الجمع بين المتعاطفين، أي: يجوز أن يعطف بها ما قارن المعطوف عليه في الزمان، نحو: جاء زيد وعمرو، إِذا جاءا معاً، أو تقدّم على المعطوف عليه، أو تأخر عنه فيه.

---

جۆري پێنجەم: (عطف النسق)

ئەوەیە کە مەعطوفەکە بە هۆی عەطفەوە ئەنجام دراوە، ئەو مەعطوف و مەعطوفی علیە - لە پەیڕەو، و ئیعراب)دا، هاوڕێك دەکاتەوە، و لەسەر ڕێ و شوێنی یەکتری دەڕۆن.

## حەرفەکانی عەطف:

وە حەرفەکانی عەطف دە دانەن، یەکەمیان (واو)ە، کە ئەویش بە شێوەیەکی گشتی بۆ کۆکردنەوەی نێوانی دوو شت دەبێت، کە عەطف بکرێنە سەر یەکتری، واتە، دروستە کە دوو شت لە رووی کاتەوە عەطف بکرێنە سەر یەکتری وەک، (جاء زید و عمرو: زەید و عەمر پێکەوە هاتن)، ئەمە لەرووی (کات)ـەوە، پێکەوە بێن، یا خود پێش و دوایەکیش لە نێوانیاندا ببێت، ئاساییە، بەڵام هاتنەکە دواجار پێکەوە ئەنجام بدرێت.

**والفاء للتعقيب بِلا مُهلة، نحو: جاء زيد فعمرو، إذا أتى بعد زيد بلا طول فصل، و ثُمَّ للترتيب مع المهلة، أي كون المعطوف بعد المعطوف عليه، بزمان قليل، أو كثير، وحتى لتعطف البعض على الكلّ حقيقة، أو حكماً، بشرط أن يكون غاية لما قبلها رفعة، أو خسة، نحو: مات الناس حتى الأنبياء، و قدم الحجّاج حتى المشاة، وأم المتصّلة للعطف بعد همزة الإستفهام ، نحو: أزيداً ضربت، أم عمراً، و بعد همزة التسوية، و هي التي تسوي بين جملتين في الحكم، و تؤولهما بمفردين، نحو: ﴿سواء عليهم أ أنذرتهم، أم لم تنذرهم﴾يس.١٠، أي، سواء عليهم في عدم الأيمان أنذارك، و عدم أنذارك لهم!**

---

حەرفی (فاء) بۆ بەدواداهاتنی ڕاستەوخۆ دێت، واتە، بێ دواکەوتن و پێشکەوتن، وەک: (جاء زيد فعمرو: زەید هاتو و عەمریش بێ دواکەوتن بەدوایدا هات)، وە حەرفی (ثم)، بۆ تەرتیب و هاوڕێکی دێت، بەڵام ئەگەر کەمێکیش نێوانیان هەبێت، لە نێوانیاندا، ئاساییە، و مەعطوف و مەعطوف علیه، بەکاتێکی کەم یان زۆر جیا بن لە یەکتری ئاساییە، وە حەرفی (حتی) بۆ عەطف کردنی (البعض: هەندێتی) دەبێت، لە سەر (گشتی: کل)، ئیتر ئەم عەطف کردنە بە حەقیقی کرابێت، یان بەحوکمی و گریمانەیی ئاساییە، بە مەرجی ئەوەی کە مەبەستە کە بگەڕێتەوە بۆ پێش خۆی یان بە هۆی بەرزی، یان نزمی لەپلەو مەقامدا، وەک: (**مات الناس حتی الانبیاء**: کە مەبەستی مەزنایەتی پێغەمبەرانە، علی نبینا و علیهم افضل الصلاة و التسلیم)، وە

نموونەیەکی‌تر، وەک: (قدم الحاج حتی المشاة: کە مەبەست لە حاجیە پیا دەکانە، کە لێرەدا پلەیان لەخوار ئەو حاجیانەوەیە کە بە سواری دەچن، لەڕووی ئامێری گواستنەوەوە).

وە حەرفێکی‌تری عەطف (ام المتصلە)یە، ئەگەر دوای هەمزەی ئیستیفهام هاتبێت، وەک، (ازید ضربتە ام عمراً: لە زەیدت سرەواند؟ یان لە عەمر؟)، وە هەروەها (ام)ی دوای هەمزەی تەسویە، کە بریتی‌یە لەو هەمزەیەی کە دوو ڕستە هاوڕێک دەکاتەوە، لە حوکمدا، و تەئویلیان دەکاتەوە، بۆ سەر مەصدەر، وەک، (سواء علیهم أأنذرتهم، ام لم تنذرهم: یس ١٠)، واتە، باوەڕ نەهێنانی ئەوان، یەکسانە بۆیان، تۆ بیان‌ترسێنی؟ یان نەیانترسێنی، چوونیەکە!

**و أَوْ للتخيير، بين شيئين فصاعدا، نحو: أدرس النحو، أو الصرف، وللأِباحة، نحو: جالس الحسن، أو اِبْن سيرين، و اِمّا كذلك، نحو: أنكح اِمّا هنداً، أو أُختها، و لا لعطف أحد المتخالفين، على الآخر، نحو: صاحبت العلماء، لا الجهلاء، و أحببتُ الأسخياء، لا البخلاء، ولكن بشرط أن لا تقترن بالواو، و تقع بعد نفي، أو نهي، و يليها مفرد، نحو: ما قام زيد، لكن عمرو.**

---

و حەرفێکیتر (أَوْ)ـە، کە بۆ هەڵبژاردن لە نێوان دوو شت یان زیاتردا بێت، وەک: (**أدرس النحو اوالصرف**: یان نەحو، یان صەرف بخوێنە)، وە بۆ سەر پشک بوون و دروست بوون (الأباحە) دێت، وەک، (جالس الحسن، او ابن سیرین: یان لە لای حەسەن، یان ئیبن سیرەین دابنیشە)، واتە، لە لای هەر کامیان دابنیشی، دروستەو سەرپشکی، و (اما)یش، هەروایە، وەک: (أنكح اِمّا هنداً، أو أُختها: یان هند، یان خوشکەکەی مارە بکە)، وە حەرفی (لا) بۆ عەطف کردنی دوو شتی دژ بە یەک دەبێت، وەک: (صاحبت العلماء، لا الجهلاء: هاوڕێیەتی زانایانم کردووە، نەک نەزانان)، وە هەروەها وەک: (احببت الاسخیاء، لا البخلاء: کەسانی دەرون بەرزوفراوانم خۆشدەوێن، نەک ئێرەیی بەران و دەرون خراپان)، وە (لکن) حەرفی عاطفە، بەڵام بە مەرجی ئەوەی کە (واو)ی پێوە نەلکابێت، و لە دوای نەفی یا خود نەهی بێت، و موفرەد لە دوایەوە بێت، وەک: (ما قام زید، لکن عمرو: زەید هەڵنەساوە، عەمر هەستاوەتەوە).

فإن اقترنت بالواو، فالواو هي العاطفة، و إن وقعت بعد إثبات مطلقاً، أي سواء كانت بعد مفرد، أو جملة، أو بعد نفي، أو نهي، و وليتها جملة كانت إبتدائية، لا عاطفة سواء كانت مع الواو، أو لا ، نحو: ﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا هُمُ الظَّالِمِينَ﴾زخرف.٧٦.

وكقول الشاعر:

أما إبن ورقاء لا تخشى بوادره    لكن وقائعه في الحرب تنتظر

و بَلْ للعطف إذا أتي بعدها مفرد، فَإن سبقها نفي، أو نهي، فهي لتقرير الحكم السابق، و إثبات نقيضه، نحو: لا تصاحب الجهلاء، بَلْ العلماء، أو سبقها إثبات فهي لنقل حكم ما قبلها، لِما بعدها، و ترك ما قبلها مسكوتاً عنه، نحو: جاء زيدٌ، بل عمرو، و زُرِ الرياضَ، بل الروضة الشريفة، زادها الله شرفاً..

---

ئەگەر (واو) لكابێت پێیەوە، ئەوە ئەو (واو)ـە، عاطیفەیە، و ئەگەر لەدوای غەیر، نەفی هات، واتە لەدوای (أثبات) هات، ئیتر بە ڕەهایە، دوای موفرەد، و یان ڕستە، یا خود نەفی و نەهی، و ئەوانەهات، و ڕستەی لەدواوە هات، ئەوە (لكن)ی ئیبتیدائیەیە، نەک عاطیفە، ئیتر (واو)ی لە گەڵدابێت، یان (لا)، هەرکامیان بن چونیەکە، وەک: ﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا هُمُ الظَّالِمِينَ﴾زخرف.٧٦، وە هەروەها کە (لكن)، (واو)ی لەگەڵدا هاتووە، وەیان لەوێنەی ئەم شیعرەدا:

أما إبن ورقاء لا تخشى بوادره    لكن وقائعه في الحرب تنتظر

کە لەدوای ڕستەی (اثبات)ەوە هاتووە، بۆیە حەرفی عطف نی‌یە، و ئبتیدائیەتە.

وە حەرفێکی تری عەطف (بل)ە، ئەگەر لەدوایەوە موفرەد هات، و هەروەها لەپێشیەوە نەفی یان نەهی هات، ئەوە بۆ دەرخستنی حوکمی ڕستە پێشوەکەیە، و جێگیرکردنی پێچەوانەی ئەو ڕاستیەیە کە لەو ڕستەیەدا هاتووە، وەک، (**لا تصاحب الجهلاء، بل العلماء**: هاوڕێیەتی نەزانان مەکە، و بەڵکو هاوڕێیەتی زانایان بکە، لە بەر ئەوەی کە لە پێشیەوە نەهی هاتووە، بۆ چەسپاندنی ئەو یاسایەیە، و جێگیرکردنی دژی ئەو بڕیارەیە، کە پێشتر هێنابووی، واتە، کەوتی لە گەڵ نەزانان مەبە، ئەوە دەچەسپێنێت کە لە گەڵ زانایان بە، وە ئەگەر لە پێشیەوە غەیری نەفی و نەهی هات، واتە: (إثبات) هات، ئەوە بۆ گواستنەوەی حوکمی ئەو شتەیە کە پێش عەطفەکە هاتووە، بۆ دوای عەطفەکە، وە وازهێنان لەوشتەی پێش حەرفە عەطفەکە، وبێدەنگ بوون لێی، وەک، (جاء زید بل عمرو ( زەید هات، نا بەڵکو عەمر هات)، واتە هاتنە کە خرایە سەر عەمر، و واز لە زەید هێنرا، یان وەک: (زر الریاض، بل الروضة الشریفة، زادهاالله شرفا: سەردانی شاری ڕیاز بکە، نا بەڵکو سەردانی باخچەی پیرۆز، و مەرقەدی پەیامبەر گیان صلیالله عیه و آله وسلم بکە، خوای مەزن شەرەف و پیرۆزییەکەی زیاتر، و زیاتر بکات. آمین

وصلّ على صاحبها، و على إِخوانه، و آله، و صحبه، و أتباعه، و علينا معهم، و سلّم تسليماً دائماً إِلى يوم الدين، سبحان ربك ربّ العزة عمّا يصفون، و سلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين.

قد فَرَغَتْ أنامِلِي من تأليف هذه الرسالة قبيل العصر من يوم الأربعاء الرابع والعشرين من صفر، سنة ألف وثلاثمائة وثلاث وتسعين، من الهجرة النبوية، مصادفا لليوم الثامن والعشرين من آذار، سنة ألف وتسعمائة وثلاث وسبعين ميلاديا، في غرفة تدريسي بجامع قطب العارفين الشيخ عبدالقادر الگيلاني "قدس الله سرّه" في بلدة بغداد المحروسة.

و أنا الفقير إِلى الله الرؤوف الرحيم، عبدالكريم محمد المدرّس في المدرسة الگيلانية.

و صلى الله على سيدنا محمد، و آله، و صحبه، و سلّم، و آخر دعوانا، أَنِ الحمدلله رب العالمين.(١٣٩٣هـ)،(١٩٧٣م).

---

**كۆتایی:**

درود و سەلام لە سەر پێغەمبەری ئیسلام (صلیالله علیه وسلم)، کە خاوەنی ئەو ڕەوزە پیرۆزەیە، و لە سەر برا ئاینییەکانی، و لە سەر کەس، وکاری، و هاوەڵانی، و لە سەر شوێنکەوتووانی، و لە سەر ئێمەش لە خاك، و پای ئەواندا، بەملکەچی، و بە هەتاهەتایی، تا ڕۆژی ڕەستاخێز.

سبحان ربك رب العزة عما يصفون، و سلام على المرسلين، والحمدلله رب العالمين.

عەللامە، و شافعیی زەمانی خۆی، جەنابی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، لێرەدا دەفەرموێت:﴿لە نووسینی (مفتاح الآداب) بوومەوە، پێش عەسری ڕۆژی چوارشەممە، ٢٤ی سەفەری ساڵی (١٣٩٣)ی کۆچی، بەرامبەر بە (٢٨)ی، ئازاری ساڵی (١٩٧٣)ی زایینی، لە ژووری وانەووتنەوەی خۆم، لەمزگەوتی قطب العارفين شێخ عەبدولقادری گەیلانی، لە شاری بەغداد﴾.

وصلىالله على سيدنا محمد، وآله، وصحبه، و سلم، وآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين

# ﴿الأسئلة والأجوبة، على (مفتاح الآداب) في النحو﴾

س١: ما هو تعريف النحو؟

ج: أصول تعرف بها أحوال أواخر الكلمة، أعراباً وبناء.

س٢: ما موضوع النحو؟

ج: الكلمة والكلام.

س٣: ما هي فائدة النحو؟

ج: حفظ اللسان عن الخطأ في المقال.

س٤: ماهو تعريف الكلمة؟

ج: لفظ موضوع لمعنى مفرد، كزيد.

س٥: كم هي أقسام الكلمة؟

ج: ثلاثة، الأسم، كزيد، و الفعل، كقام، و الحرف كـقَدْ.

س٦: ما هو تعريف الأسم؟

ج: ما دَلَّ على معنى بنفسه، غير مقترن بأحد الأزمنة.

س٧: ما هي علامات الأسم؟

ج: قبول الجرّ، و التنوين، ولام التعريف، والإِسناد إِليه.

س٨: ما هو تعريف الفعل؟

ج: ما دَلَّ على معنى بنفسه، مقترن بأحد الأزمنة.

س٩: ما هي علامة الفعل الماضي؟

ج: قبول تاء التأنيث الساكنة، نحو: قد قامت.

س١٠: ماهي علامة المضارع؟

ج: دخول السين و سوف ولم و لمّا.

س١١: ماهي علامة الأمر؟

ج: الدلالة على الطلب، وقبول ياء المخاطبة.

س١٢: ما هو الحرف؟

ج: كلمة دلّت على معنى بغيرها.

س١٣: ماهي علامة الحرف؟

ج: عدم قبول شيئ، من علامات الإسم، والفعل.

س١٤: ماهو الكلام؟

ج: لفظ مفيد مقصود لذاته.

س١٥: ماهو الكلم؟

ج: المركب من ثلاث كلمات، نحو: قد قام زيد.

س١٦: ماهي الجملة.

ج: المركب من كلمتين، أفاد، أوْ، لا.

س١٧: ما الفرق بين الكلام والجملة؟

ج: الكلام يجب أن يكون مفيداً، دون الجملة، فمنها المفيد، نحو: قد قام، و منها غيرها، نحو: أن قام.

س١٨: ماهو المعرب؟

ج: ما اختلف آخره، بأختلاف العوامل.

س١٩: ما هو المبني؟

ج: ما لـم يختلف آخره، بأختلاف العوامل.

س٢٠: مامعنى الإعراب اللفظي؟

ج: معناه ظهور الأعراب، على آخر الكلمة.

س٢١: مامعنى الأعراب التقديري؟

ج: معناه فرض الأعراب، في آخر غير قابل لها.

س٢٢: ما معنى الأعراب المحلي؟

ج: معناه أن الأعراب يجري على لفظ معرب، يكون في محل المبني.

س٢٣: ماهو المبني من الأفعال، وما هو المعرب منها؟

ج: الفعل الماضي والأمر مبنيان دائماً، والفعل المضارع معرب، إِلاّ أذا أتصل بأخره نون جمع المؤنث الغائب أو المخاطب، أو نون التأكيد المباشر.

س٢٤: مَثّل للحروف المبنية، على السكون، أو على الحركات؟

ج: المبني على السكون كقد ولم، ونعم، وعلى الكسر، كباء، بزيد، وعلى الفتح، كأنّ، وأنّ، وعلى الضم كمنذ.

س٢٥: على ماذا يدور النحو؟

ج: على العامل، و المعمول، و العمل.

س٢٦: ماهو العامل؟

ج: العامل ما أوجب حالة مخصوصة، لآخر الكلمة.

س٢٧: ماهو المعمول؟

ج: المعمول هو الذي يثبت العامل حالة خاصة في آخره.

س٢٨: ماهو العمل؟

ج: الأثار التي تظهر في آخر الكلمات بسبب العامل.

س٢٩: كم هي أبواب الأعراب؟

ج: أبواب الأعراب ثمانية.

س٣٠: ماهي أنواع الأعراب؟

ج: الرفع والنصب المشتركان بين الأسم والفعل، والجرّ المختص بالأسم، و الجزم المختص بالفعل.

س٣١: بماذا يكون اعراب الأسماء الستة؟

ج: بالواو رفعاً، وبالألف نصباً، و بالياء جراً.

س٣٢: بماذا يكون إِعراب المثنى؟

ج: بالألف رفعاً، و الياء نصباً، و جرّا.

س٣٣: بماذا يكون أعراب الجمع المذكر السالم؟

ج: بالواو رفعاً، والياء نصباً و جرّا.

س٣٤: بماذا يكون أعراب الأسم المفرد والجمع المكسر المنصرفين، والمضارع الصحيح الآخر؟

ج: بالضمة رفعاً، والفتحة نصباً، والكسرة جراً، والجزم سكوناً.

س٣٥: بماذا يكون أعراب غير المنصرف؟

ج: بالضمة رفعاً والفتحة نصباً و جرّاً.

س٣٦: بماذا يكون إِعراب جمع المؤنث السالم؟

ج: بالضمة رفعاً، والكسرة نصباً و جرّاً.

س٣٧: بماذا يكون إِعراب الأفعال الخمسة؟

ج: بثبوت النون رفعاً، وحذفها نصباً و جزماً.

س٣٨: بماذا يكون أعراب الفعل المعتل الآخر؟

ج: بالضمة رفعاً، والفتحة نصباً، وحذف الآخر جزماً.

س٣٩: أين تكون جميع الحركات الإِعرابية مقدرة؟

ج: في المقصور كعصا وفتى، وفي المضاف ألى ياء المتكلم، مثل: كتابي وغلامي.

س٤٠: أين يكون الرفع، والجرّ فقط تقديرياً؟

ج: في الأسم المنقوص، أي ما آخره ياء مكسور، ما قبلها كالقاضي و الساعي.

س٤١: أين يكون الرفع تقديراً فقط؟

ج: في الفعل المعتل الآخر، المختوم بالواو أو الياء، فرفعه تقديرى ونصبه لفظي، وكذا جزمه، فأن جزمه بحذف الآخر.

س٤٢: أين يكون الرفع والنصب تقديرياً، والجزم لفظياً؟

ج: في الفعل المعتل الآخر، المختوم بالألف، كيخشى، فأن رفعه ونصبه تقديريان، و جزمه لفظي بحذف الأخر.

س٤٣: ماهو غير المنصرف؟

ج: اسم معرب لا يقبل الجر والتنوين، لعلتين من العلل التسع، أو علة واحدة تقوم مقام علتين.

س٤٤: ما هي العلل التسع؟

ج: العدل، و التأنيث، و العجمة، و العلمية، و الوصفية، و التركيب، و الألف والنون الزائدتان، و ألف التأنيث، و صيغة منتهى الجموع.

س٤٥: ماهي العلة الواحدة التي تقوم مقام علتين؟

ج: ألف التأنيث، و صيغة منتهى الجموع.

س٤٦: بماذا يكون إِعراب غير المنصرف؟

ج: رفعه بالضمة ونصبه وجرّه بالفتحة لفظاً أو تقديراً.

س٤٧: بماذا يكون إِعراب المؤنث بالألف المقصورة، أو المدّ؟

ج: رفعها بالضمة، ونصبها وجرّها بالفتحة تقديراً، لِأَنَّ أعراب المقصور تقديري.

س٤٨: ما هو تعريف الضمير؟

ج: ما دَلَّ على أمر غائب، أو حاضر بالوضع، نحو "هو، أنا ، أنت".

س٤٩: ماهو الضمير المتصل؟

ج: مالا يتلفظ به، مستقلاً، بل يلحق شيئاً، كتاء ضربت.

س٥٠: ماهو الضمير المنفصل؟

ج: ما يتلفظ به مستقلاً، كأنا و أنت.

س٥١: ما هو الضمير المرفوع المتصل؟

ج: الألف، و الواو، و النون، و التاء، و الياء، و لفظ( نا).

س٥٢: ماهو الضمير المجرور المتصل؟

ج: مجرور الباء، في (بِهِ، بها، بِهما، بهم، بِهِنَّ، بي، بنا، بِك، بِكُما، بِكُم، بِكُنَّ).

س٥٣: ما هو الضمير المنصوب المتصل؟

ج: مثل مالحق أكرم في المتن، أكرمه، أكرمها، .... ألى آخره.

س٥٤: ماهو الضمير المرفوع المنفصل؟

ج: أنا، نحن، هو، هي ، هما ، هم، هن، أنتَ، أنتِ ، أنتما، أنتم، أَنْتنَّ.

س٥٥: هل يوجد الضمير المجرور المنفصل؟

ج: كلا: ماوجدناه في الأستعمال.

س٥٦: ماهو تعريف العلم؟

ج: أسم دَلَّ على معنى معين بالوضع.

س٥٧:ما هي الكنية؟

ج: ماصدر بأبٍ، أو أمّ.

س٥٨: ما هو اللقب؟

ج: ما أشعر بمدح أوذم.

س٥٩: ما هو إِسم الأِشارة للقريب؟

ج: (ذا، وتا، و ذان، و تان، و أولاء).

س٦٠: ما هو إِسم الإِشارة للبعيد؟

ج: (ذاك، و تاك، و ذانك، و تانك، و أولائك).

س٦١: ما هو أِسم الأِشارة للأبعد؟

ج: (ذلك، و تلك، و هذانك، و هاتانك).

س٦٢: هل تجتمع اللام مع هاء التنبيه؟

ج: لا.

س٦٣: هل تدخل اللام على المثنى أو الجمع؟

ج: لا.

س٦٤: ما هو إِسم الإِشارة للمكان؟

ج: هنا، إِذا كان قريباً، و هناك، إِذا كان بعيداً، و هنالك، إِذا كان أبعد.

س٦٥:كم هى أقسام المنادى؟

ج: أقسام المنادى خمسة، المفرد المعرفة، والمفرد النكرة المقصودة، وهما مبنيان، والمضاف، والمشبه بالمضاف، و النكرة غير المقصودة، و هي منصوبة.

س٦٦: بماذا يكون نصب المنادى لفظاً، أو محلاً؟

ج: نصب المنادى بأدعو، أو أنادي، وحرف النداء نائب منابه.

س٦٧: لماذا سميت هذه الأفعال، أفعالاً ناقصة؟

ج: لأنها لا تتم بمرفوعِها، و تحتاج إِلى منصوبها.

س٦٨: ماهي معاني، أصبح، و أضحى، و ظلّ، وأمسى، و باتَ؟

ج: الدلالة على أتصاف أسمائها بأخبارها، في أوقات تستفاد من نفس تلك الأفعال.

س٦٩: ما هو شرط عمل مازال وأخواتها؟

ج: سبق النفي، أو شبه النفي، كالنهى عليها.

س٧٠: كم هي أصناف باب كاد؟

ج: أصنافه ثلاثة: صنف لقرب حصول خبره لِإِسمه، وصنف لرجائه، و صنف لشروعه فيه.

س٧١: ماهي لوازم هذه الاصناف؟

ج: لازم الصنف الأول، تجرد خبره عن كلمة أن الناصبة، ولازم الصنف الثاني لزومها أو غلبة وجودها فيه، و لازم الصنف الثالث وجوب تجرده عنه.

س٧٢: هل يتصرف في هذه الأفعال بالمضارع والأمر وغيرهما؟

ج: لايتصرف فيها ألاّ كاد، فلهُ مضارع، و إِلاّ أوشك، فله مضارع واسم فاعل.

س٧٣: ما هي أفعال القلوب؟

ج: أفعال تَدُلُّ على معان قلبية، كالعلم والظنّ.

س۷٤: کم هي أصنافها؟

ج: ثلاثة، الصنف الأول، دالٌّ علی الیقین، وهو الأعتقاد الجازم المطابق للواقع الثابت، الصنف الثاني، دال علی الظن، و هو الأِعتقاد الراجح، الثالث، مشترك بینهما یستعمل في هذا و ذاك.

س۷٥: ما هو تعریف الفاعل؟

ج: ما أسند أِلیه، فعل، أو شبهه، علی جهة قیامه به.

س۷٦: هل یجوز تقدیمه علی الفعل؟

ج: لا.

س۷۷: هل یجوز أِلحاق ضمیر المثنی أوالجمع بالفعل المسند، أِلی المثنی والجمع؟

ج: لا.

س۷۸: متی یجب تأنیث الفعل المسند ألی المؤنث؟

ج: أِذا أسند أِلی الفاعل المؤنث الحقیقي المتصل بالفعل، أو أِلی ضمیر المؤنث مطلقاً.

س۷۹: متی یجوز تذکیر الفعل، و تأنیثه، مع رجحان التأنیث؟

ج: أذا أسند ألی مؤنث حقیقي مفصول عنه بغیر أِلاّ، أو أِلی مؤنث مجازي.

س۸۰: متی یکون تأنیث الفعل المسند أِلی الفاعل المؤنث مرجوحاً؟

ج: أذا أسند ألی مؤنث حقیقي مفصول عنه بکلمة ألاّ.

س۸۱: متی یتساوي التذکیر، و التأنیث في الفعل المسند، أِلی المؤنث؟

ج: متی اسند ألی جمع المکسر المؤنث، أو أِسم الجمع، أو أِسم جنس المؤنث، أو ارید من الفاعل الجنس کفاعل نعم، أو أسند الی جمع بالألف والتاء للمذکر، نحو : جاء أو جاءت الطلحات.

س۸۲: لماذا یحذف الفاعل وینیاب غیره مقامه؟

ج: للتعظیم، أو للتحقیر، أو لکونه معلوماً، أو لعدم العلم به.

س۸۳: ماهي صیغة المجهول من الماضي؟

ج: ماضم أولها، أو أوّل متحرك یعتد به منها، وکسر ما قبل آخرها، نحو: نصر، ودحرج، و أجتمع.

س٨٤: ماهي صيغة المجهول من المضارع؟

ج: ماضم أوله، وفتح ماقبل آخره، نحو: يكرم، ويد حرج.

س٨٥: أي شيىء ينوب عن الفاعل؟

ج: المفعول به، فما يقوم بواجبه من المصدر، و الظرف عند عدم الأصل.

س٨٦: ما هو المفعول به؟

ج: إِسم ما وقع عليه، فعل الفاعل، كزيدٍ، في ضربت زيداً.

س٨٧: هل يجوز تقديمه، على عامله أو هل يجب؟

ج: نعم، نحو: زيداً ضربتُ ـ جوازاً-، وفي ماكان له الصدر- وجوباً-، نحو: من أرسلت إِلى المطلوب.

س٨٨: هل يجوز حذف عامله؟

ج: نعم، لقرينة، كقولك: (مكة)، لمن قال: (ماذا تريد؟).

س٨٩: هل يجب حذف عامله؟

ج: نعم، في مواضع منها: التحذير، والأغراء، و الإِختصاص، والمنادى.

س٩٠: ماهو المنادى؟

ج: هو المطلوب إِقباله بحرف نائب مناب أدعوا.

س٩١: كم هي أقسام المنادى؟

ج: أقسامه خمسة: المنادى المفرد المعرفة، والنكرة المقصودة، والنكرة غير المقصودة، والمنادى المضاف، والمنادى الشبيه بالمضاف، والأوَّلان مبنيان على الضم، والباقي منصوب على المفعولية.

س٩٢: ما هو تعريف الحال؟

ج: وصف فضلة مبين لهيئة الفاعل أو المفعول.

س٩٣: ماهو الأصل في الحال؟

ج: أن تكون منتقلة، لا ثابتة، و مشتقة، لا جامدة.

س٩٤: متى تكون الحال جامدة؟

ج: في مواضع كثيرة منها، إذا وقع الحال موصوفاً بصفة، أو قدر مضاف قبله، أو وقع للتسعير، أو للتشبيه، إلى غير ذلك.

س٩٥: ماهو الأصل في الحال وصاحبها؟

ج: الأصل في الحال، أن تكون نكرة، و في صاحبها أن يكون معرفة.

س٩٦: متى يجوز تنكير صاحب الحال؟

ج: إذا كان مع مسوغ للأبتداء بالنكرة ، كأن يتقدم عليها ظرف، أو جار و مجرور.

س٩٧: هل يجوز أن تأتي بالحال عن المضاف أليه؟

ج: نعم: أذاكان المضاف يعمل فيه، أوكان جزء من المضاف أليه، أو مثل جزئه.

س٩٨: هل يجوز تقديم الحال على صاحبه؟

ج: نعم، أذا لم يكن صاحبه، مجروراً بالحرف، أو بالأضافة.

س٩٩: هل يجوز تقديم الحال على عامله.

ج: نعم، ألا أذاكان العامل معنى الفعل، كالأِشارة، و التمنى، نحو: هذا زيدٌ قائماً.

س١٠٠: هل يحذف عامل الحال؟

ج: نعم، يجوز حذف عامله إذا دَلّتْ عليه قرينة.

س١٠١: هل يجوز حذف الحال؟

ج: نعم، ألا أذا وقع جواباً للسؤال، أو كان قيد النهي، أو محصوراً فيه.

س١٠٢: ماهو تعريف التمييز؟

ج: أسم بمعنى من رافع لابهام في مفرد أونسبة.

س١٠٣: أذكر أقسام التمييز؟

ج: قسمان: الأول: تمييز عن المفرد، والثاني: عن الجملة.

س١٠٤: ماهي المفردات المحتاجة إلى التمييز؟

ج: العدد، و الكيل، و الوزن، و المساحة، و أشباهها، كذرة، في:﴿ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا﴾.

س١٠٥: ماهو التمييز عن النسبة في الجملة؟

ج: تمييز يرفع الابهام عن نسبة الفعل إلى فاعله، نحو: طاب زيد نفساً، أو عن تعلق الفعل بمفعوله، نحو: ﴿وَفَجَّرْنَا الأَرْضَ عُيُونًا﴾القمر:١٢.

س١٠٦: ماهو التمييز عن النسبة في شبه الجملة؟

ج: تمييز يرفع الأبهام عن نسبة إسم الفاعل، إلى فاعله، نحو: الأرض منفجرة عيوناً، أو عن ربط إسم الفاعل المتعدى بمفعوله، نحو: أنا مادح زيد كرما، أو عن نسبة أسم المفعول ، أو الصفة المشبهة الى مرفوعهما، نحو: زيد ممدوح أدباً، و طيب نفساً.

س١٠٧: كم هي أقسام المجرور؟

ج: أقسام المجرور، إثنان، المجرور بالحرف، و المجرور بالإضافة.

س١٠٨: كم هي حروف الجر؟

ج: عشرون حرفاً.

س١٠٩: ماهي الإختلافية منها؟

ج: (كَيْ)، و (لَوْلا)، و (لَعَلَّ)، فإنّها ليست حروف الجرّ عند الجمهور.

س١١٠: كم هي أقسام المجرور بالأضافة؟

ج: قسمان، المجرور بالأضافة اللفظية، والمجرور بالأضافة المعنوية.

س١١١: ماهي الأضافة اللفظية؟

ج: أضافة الصفة العاملة في المفعول ألى معمولها.

س١١٢: ما وجه تسميتها باللفظية؟

ج: الوجه أنها لا تفيد ألا تخفيفاً، للمضاف لفظاً بحذف التنوين، أو نون المثنى أو الجمع.

س١١٣: ما هي الإضافة المعنوية؟

ج: أضافة غير الصفة العاملة، إلى معمولها.

س١١٤: ما وجه تسميتها بالمعنوية؟

ج: الوجه إنّها تفيد فائدة معنوية، هي تعريف المضاف، أو تخصيصه.

س١١٥: كَمْ هي اقسام الأضافة المعنوية؟

ج: أقسامها ثلاثة، أضافة بيانية بتقدير (مِنْ)، و إِضافة لامية بتقدير (اللام)، وأضافة ظرفية بتقدير (في).

س١١٦: هل تجوز أضافة الأسم ألى مرادفه أو مساويه؟

ج: لا تجوز هذه الأضافة، و ما سمع فيها مؤول بما يعود إِلى إِضافة المغاير للمغاير، كأن تريد من المضاف المسمى، و من المضاف إِليه الأِسم.

س١١٧: هل يكتسب المضاف التأنيث من المضاف إِليه؟

ج: نعم، قد يكتسب منه التأنيث، وقد يكتسب منه التذكير.

س١١٨: كم هي جوازم المضارع؟

ج: خمسة عشر.

س١١٩: كم منها يجزم فعلاً واحدا؟

ج: أربعة أحرف، (لَمْ)، و(لَمّا)، و(لامُ الأَمْر)، و(لاء النّهي).

س١٢٠: كم منها يجزم فعلين؟

ج: احد عشر جازماً.

س١٢١: كم منها حرف؟

ج: جازم واحد، و هو(أن)، و الباقي أسماء.

# ﴿بەرهەمەکانی تری ڕاڤیار، "الشارح"﴾

١. شەرحی عەوامیلی جورجانی. "کورتە شەرح"
٢. شەرحی عەوامیلی بورکەوی.
٣. شەرحی عەوامیلەین، "الجرجانی، و البرکوی". "کۆکراوەی ئەو دووانەی پێشووە"
٤. شەرحی عەوامیلی مەلا موحسین.
٥. شەرحی (المقدمة الاجرومیة).
٦. (حەفتا و سێ فیرقەی جیاواز). دەربارەی دەستە، و تاقمە ئیسلامییەکان، "الفرق الاسلامیة"
٧. شەرحی (الورقات)ی، ئیمامی حەرەمەین، لە ئوصولی فیقهدا.
٨. پوختەیەك دەربارەی زانستەکانی قورئانی پیرۆز، "علوم القرآن".
٩. تەرجەمەی (هدایة المستفید)، دەربارەی زانستی تەجوید.
١٠. پوختەیەك دەربارەی زانستەکانی قورئان، و تەجوید. "کۆکراوەی ئەو دووانەی پێشووە"
١١. شەرحی عەوامیلی جورجانی، "شەرحی درێژ، لە(٤٠٠) لاپەڕەدا".
١٢. الملاّ أبوبکر المصنف، حیاته ومؤلفاته وآراؤهُ. (بە عەرەبی، و بە کوردی)
١٣. تەرجەمە، و کورتە شەرحی، موناجاتی ئیمامی شافیعی.
١٤. تەحقیقی ﴿حەج نامەی کوردی﴾، مامۆستا شێخ جەلال، شێخ عەبدوڵلا دەمەیەوی.
١٥. خوشکم حیجاب خۆش بەختییە.
١٦. شەرحی (الهدایة فی النحو).
١٧. شەرحی (مفتاح الاداب)ی (مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مدرّس). " کە لە بەردەستماندایە"
١٨. ئامادەکردن وتەحقیقی (مفتاح الاداب)، بە عەرەبی.
١٩. گوڵچنێ لە گوڵزاری فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسلامﷺ.
٢٠. شەرحی (المنظومة البیقونیة)، لە زانستەکانی فەرموودەدا.
٢١. شەرحی (الفوائد الصمدیة)، لە زانستی نەحودا.
٢٢. شەرحی (عمدة الطلاب)ی شێخ عباس المدنی الشافعی، لە زانستی ئوصولی فیقهـــدا.

٢٣. تەرجەمەی کتێبی (تیسیر مصطلح الحدیث).

٢٤. تەرجەمەی، (منظومة ابن فرَح الاشبیلی)، لە زانستەکانی فەرموودەدا.

٢٥. شێخ عەلائەددینی نەقشبەندی، و دوو پەیامی عیرفانیی لە لووتکەدا.

٢٦. شەرحی کوردیی، لە سەر شەرحی ئیبن عەقیل، "بەرگی یەکەم"

٢٧. تەرجەمەی (صحیح مسند أسباب النزول)ـی، "الشیخ مقبل بن هادی الوادعی".

٢٨. ئامادەکردنی، ﴿دیوانی جەلال﴾، شیعرەکانی: مامۆستا شێخ جەلال، شێخ عەبدوڵلا دەمەیەوی.

٢٩. ڕیزبەندی قورئانی پیرۆز، بە گوێرەی باس و بابەتە جیاوازەکان.

٣٠. تەرجەمەی﴿أرمغان جوانان﴾ی، مامۆستا مەلا باقری بالك.

٣١. چمکێك لە ژیان وکەسایەتی موتەصەویفی مەزن، شێخ عەبدوڵلای دەمەیەوی.

٣٢. تەرجەمەی﴿الطلاق مرّتان﴾ـی، د. مستەفا زەلمی.

٣٣. تەرجەمەی﴿خطوات الطلاق، في القرآن الكريم﴾ی، د. مستەفا زەلمی.

٣٤. تەرجەمەی﴿الطلاق المعلّق، في الشريعة الاسلامية﴾ـی، د. مستەفا زەلمی.

٣٥. شەرحی (نخبة الفِكَر)، لە زانستەکانی فەرموودەدا.

**وصلى الله على سيدنا و نبينا محمد و على آله و صحبه وسلم و الحمد لله رب العالمين.**